ناوی کتێب: ئاسۆیەکی تری زمانەوانی - بەرگی یەکەم
نووسینی: پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٩٠٠
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی دووەم، هەولێر ٢٠٠٩
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢٣٢٢ی ساڵی ٢٠٠٩ی
دراوەتێ

# وتەیەک لە جیاتی پێشەکی

بەدران ئەحمەد حەبیب

زمان بە یەکێک لە بناخە گرینگەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و پێویستییەکانی ئەو ژیانە دەژمێردرێ. هەر زمانە کە مایەی بەردەمبوونی بەیەک گەیشتن و بناخەی پتەوکردنی هۆیەکانی لەگەڵ یەکدا هەڵکردن و هاوگوزەرانیی تاکەکانی کۆمەڵە. نەک هەر هێندە و بەس، بگرە زمان لە هەموو ئەو ئەرکانەی کە مرۆڤ بەجێیان دەگەیەنێ مرۆڤانیترە. تەنیا مرۆڤن کە بەزمان زانیاری و بیر و هەست دەگۆڕنەوە. ئاژەڵان زمانیان نییە.

زمان نەک تەنیا ئامرازی گۆڕینەوەی بیرە بگرە هۆی پەرەپێدانی بیر و ئەزموونیشە لەلای مرۆڤدا. هەندێک لە زانا و فەیلەسووفان دەڵێن لەوەتەی بیر هەیە زمانیش هەیە. زمان مرۆڤ پەروەردە دەکات و ئامادەی دەکات بۆ داهێنان و بەشداریی کارامە لە ژیانی شارستانەتیدا. لە رێگەی زمانەوەیە کە مرۆڤگەل یەکتر باشتر دەناسن و پێوەندیی نێوان خۆیان بەهێزتر دەکەن و ئەزموون و شارەزاییی خۆیان دەدەن بەیەکتر بۆ پەرەپێدانی ژیانەکەیان. بەهەمان شێوەیە، چەندی مرۆڤ ئەزموون و شارەزایی پتر کەڵەکە بکات و لەسەریەکی دابنێ هێندەش زمان گەشە دەکات و فراژێتر دەبێ و، پێوەندیی نێوان تاکەکان پان و پۆڕتر دەبێ.

گرینگی و بایەخی زمان لە ژیانی مرۆڤدا سەدان و رەنگە هەزاران کەسی لە زانا و بیریار و فەیلەسووفان بەخۆیەوە خەریک کردووە و هانی داون لە هەموو ئالییەکەوە لێی بکۆڵنەوە و تاوتوێی بکەن. تا گەیشتووەتە ئەوەی لەم بوارەدا کەلەپوورێکی مەزن پەیدا بووە کە هەمووی بەگشتی تیشک دەخاتە سەر یەکێک لە گرینگترین مەرجەکانی مرۆڤایەتیی مرۆڤ کە زمانە.

زانایان بەگوێرەی پسپۆڕییان لە زمانیان کۆڵیوەتەوە، لە کتێبخانەکاندا چەندان لێکۆڵینەودمان لەبارەی: زمان و ئابووری، زمان و راگەیاندن، زمان و کۆمەڵناسی، زمان و دەروونناسی و، هتد... بەرچاو دەکەوێ. بەڵام زمانەوانی (زانستی زمان) واتە

لێکۆڵینەوەی زمان بۆ خۆی، ئەم زانستەی زمان یان ئەم بوارەی لێکۆڵینەوەی زمان، لە زانست و بوارەکانی تر جیاوازە بەوەی کە بەزمان لە زمان دەکۆڵێتەوە، لێرەدا زمان خۆی مایە و کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەیە و هەر خۆشی مەبەست و ئامانجەکەیە.

بابەتەکانی ناو ئەم کتێبەی پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین (چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی) چەندان بابەتی هەمەجۆر و جیاجیا لە بواری لێکۆڵینەوەی زمان بۆ خۆی (واتە زانستی زمان) دەگرێتە خۆ کە هەر یەکەیان تیشک دەخەنە سەر یەکێک لە کێشە و بابەتەکانی ئەمڕۆی زمانی کوردی. ئەم کتێبە لە فرەشێوەیی بابەتەکانی و زانستایەتیی لێکۆڵینەوەکانیدا، لە کتێبخانەی کوردیدا کتێبێکی بێ وێنە یان کەم وێنەیە.

زمان وەک چۆن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە لە هەمان کاتدا بووە بەبابەتێکی زانستیی پەتیش کە لە ماتماتیک دەچێ، لێکۆڵینەوە لە ڕێسا و بنەماکانی و ڕاهاتن لەسەریان، یارمەتیدەری گرینگ دەبن بۆ پێشوەچوون و پێشوەبردنی زمانەکە و فرەوانترکردنی.

زمانی یەکگرتووی کوردی یەکێکە لە ئامانج و داخوازەکانی ئەم قۆناغەی مێژووی کورد، ئەمەش بەبێ لێکۆڵینەوە لە باس و بابەتەکانی زمان و دانانی ڕێسا و بنەما بۆ پێشەوەبردنیان، نایەتە دی. لێرەدا بایەخی ئەم بەرهەمەی مامۆستای هێژا وریا عومەر ئەمینمان بۆ دەردەکەوێ و جێی دەسخۆشییە.

دان بەوەشدا دەنێم کە ئەم چەند قسە سەرپێییە لێرەدا زۆر کورتن بۆ باڵای ئەم کتێبە و داوای لێبووردن دەکەم کە نەمتوانی هەقی ئەم بەرهەمە پوختەی برا و هاوڕێم د. وریا بەتەواوی بدەم.

# پێشەکی

پرۆفیسۆر وریا عومەر ئەمین

هەولێر ٤/١/٢٠٠٣

زمانەوانی وەک هەر لقێکی تری زانست یەکجار فرەوان و ئاڵۆز بووە. بەرادەیێکی زۆر تەشەنەی سەندووە، بەدەیان بواری ورد وردتری لێ بۆتەوە. هەبوونی زیاتر لە پێنج هەزار زاراوە و هێما بۆ شیکردنەوەی زمانەوانی بەڵگەی ئەوەیە ئیتر ئەو ڕۆژە ئاوابوو بێ خوێندنی بەرنامەداری ئامانجدار و بێ پەنابردنە بەر سەرچاوە ڕەسەنەکان و بێ ئاگاداربوون لە مێژووی پەرەسەندنی زمانەوانیی گشتی بتوانرێ کارێکی وا پێشکەش بکرێ لەگەڵ گیان و پێویستییەکانی سەردەم بگونجێ.

لەم بیست و دوو ساڵەی ڕابووردو گەلێ باس و وتار و لێکۆڵینەوەی زمانەوانیم لە بارەی زمانی کوردییەوە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانا بڵاو کردۆتەوە. هەوڵم داوە بەڕێباز و گیانێکی نوێ بەپشت بەستن بەدەسکەوتەکانی زانستی زمانی گشتی و بەشێوەیێکی سادە و ڕاستەوخۆ پێشکەشیان بکەم. بەهۆیانەوە گەلێ زاراوە و بیر و چەمک و تەکنیکی نوێ بەبواری زمانەوانیی کوردییا ناسێنرا. گەلێ یاسای ڕێزمانی کوردییان دەستنیشان کرد و لایەنی لێڵی ڕێزمانی کوردییان لێکدایەوە و بوون بەسەرچاوە و پێڕەو بۆ قوتابییانی خوێندنی باڵا و زمانەوانان و ڕێگایان بۆ باس و لێکۆڵینەوەی تر پاک کردەوە.

هەر باسێک و لێکۆڵینەوەیێکی زمانەوانی زادەی سەردەم و زەمینەی نووسەرەکەیەتی. تەواوکەری ئەوانەی پێش خۆیەتی و هەنگاوێکی ترە لە ڕێگایێکی بێ بندا. هەر سەردەمێکیش ڕێباز و پێڕەو و تەکنیکی تایبەتیی خۆی هەیە. بەردەوام هی نوێتر و لەبارتر سەرهەڵئەدەن و پەیا ئەبن، زۆری پێ ناچێ ئەمانیش کۆن ئەبن و لە کەڵک ئەکەون و باوڕیان نامێنێ. ئەگەر ئێستا بەم باس و وتارانەی خۆمدا بچمەوە پوختیان بکەم، بێ کەڵک و دووبارەکان لابەرم، هەڵەکانم ڕاست کەمەوە هەمووی بەسی چل لاپەڕە و بەشێوەیێکی زۆر باشتر و ڕێکتر و ڕوونتر پێشکەش ئەکەمەوە. لێرە وەک خۆیان خراونەتە ڕوو بۆ سوودی قوتابییان و ئەوانەی بەتەنگ زمانەوانییەوەن. ئەگەر دەسکاریش کرابن

ئەوە زۆر بەدەگمەن بووە و پەیوەندیی بەڕێنووس و هەندێ دەربڕینەوە هەبووە و لە دوو سێ شوێنیشا هەندێ هەڵەی زەق ڕاست کراونەتەوە (ئەمانەی دوایی خراونەتە ناو کەوانەوە). ئەبێ لێکۆڵەر ڕەچاوی مێژووی نووسینیان و ئەم لایەنانە بکات. ئەمەی بەردەستتان بەشێکی بەرهەمە زمانەوانییەکانە. هیوادارم ڕۆژێ بێ بەشەکانی تریشتان ئاوا بەکۆکراوەیی بگاتێ. هەموو ئەمە و هەرچییەکم لە بارەی زمانی کوردییەوە پێشکەش کردبێ ئەگەر هەر نرخێکیان هەبێ ئابنە دڵۆپێک لە دەریایێکا.

لە کۆتاییدا زۆر سوپاسی برای بەڕێزم کاک بەدران ئەحمەد حەبیب ئەکەم کە ئەوە دەمێکە داوام لێ ئەکات وتارەکانی بۆ ئامادە بکەم بڵاویان بکاتەوە. هاندان و یارمەتیی دڵسۆزانەی ئەم ئەبا ئەم کارە هەرگیز ئەنەهاتە ئەنجام. هەروەها سوپاسی کاک ئاراس ئەکردم ئەکەم کە ئەزیەتێکی زۆری کێشا لە چاپکردنی ئەم کتێبە و ڕێکخستنی خشتە سرکەکانی. یاخوا غوونەیان زۆر بێ.

# ئیملای کوردی و چەند تێبینییەک

دەخوێنرێتەوە و گەلێ جار دەبیسترێ کە لە زمانی کوردیدادەنگی (ص) و (ط) هەن وەک ئەوەی لە وشەی (ساڵ) و (سەگ) و (سەد) و (تاڵ)دا دەردەکەون، بۆیە دەبێ پیتی (ص) و (ط) بخرێنە ناو سیستەمی ئەلف و بێی کوردی.

هەندێکیش لەسەر ئەو ڕایەن کە (ق) و (ع) و (ح) لە نژادا کوردی نین و لە ئەنجامی کارتێکردنی زمانی عەرەبی -کە زمانێکی سامییە- کەوتوونەتە ناو زمانی کوردییەوەبۆیە دەبێ ئەو پیتانەی ئەم دەنگانە دەنوێنن لە ئەلف و بێی زمانی کوردی لابرێن.

هی واش هەیە لەسەر ئەم ڕایەیە کە چونکە هەموو (ڕ)یەک لە سەرەتای وشەی کوردی (قەڵەوە) بۆیە پێویست بەوە ناکات نیشانەی قەڵەویی بۆ دابنرێت و گەلێ ڕای تری بەمانەچوو لەملاو ئەولا دەبیسترێن و بەرچاو دەکەون.

بەتێگەیشتنی تەزەرییەی فۆنیم و جیاکردنەوەی فۆنێتیک و فۆنۆلۆجی وەک دوو ئاستی جیای زمان و دەرککردنی چەمکی گۆڕین لە زمانا ئەم لایەنانە ڕوون دەکرێنەوە و ئەم پرسیارانە وەڵام دەدرێتەوە.

ئەلف و بێی هەر زمانێ لەسەر بناغەی فۆنیمەکانی دادەمەزرێت. ژمارەی ئەلف و بێی هەر زمانێکیش ژمارەی فۆنیمەکانییەتی لەو ساتە تایبەتییەی‌کەئەلف‌وبێیەکەتێدادامەزراوە. واتا بۆ دەستنیشانکردنی ئەلف و بێی هەر زمانێ ئەبێ فۆنیمەکانی ئەم زمانە دەستنیشان بکرێن.

هەر قوتابخانەیەکی فۆنۆلۆجی ڕای تایبەتیی خۆی هەیە دەربارەی چەمکی فۆنیم. باسکردنی ئەو هەموو ڕایە جیاوازانە و دەرخستنی کێشەی نێوان ئەم قوتابخانانە کەلکی ئێمەی نییە لەم باسەدا. لەم قۆناغەدا باشترین و پراکتیکیترین پەیڕەو بۆ دەستنیشانکردنی فۆنیمەکانی هەر زمانێ ئەوەیە کە فۆنیم بەنیشانەیەکی جیاکەرەوە دادەنێت لەناو چوارچێوەی زمانێکی تایبەتیدا.

زانینی دەنگەکانی زمان و لەیەکدانیان بۆ دروستکردنی برگە بەشێکی زانیاریی قسەکەرە دەربارەی زمانی خۆی. گرنگترین لایەن لە زانینی زمانێ زانینی ئەو سیستەمە تایبەتییەیە کە دەنگ و مانا لەیەک ئەبەستێ. گەر زمانێکی بێگانە ببیستی هیچی لێ تێ ناگەیت و نازانیت وشەکانی لە کوێ دەست پێ دەکەن و لە کوێ تەواو دەبن. چونکە

ئەو سیستەمە تایبەتییە نازانیت کە دەنگەکانی ئەم زمانە لە ماناکانییەوە دەبەستێ. واتا لەهەر زمانێکدا ڕیزە دەنگێکی تایبەتی مانایەکی تایبەتی دەبەخشێت، گۆڕینێ بەسەر ئەو ڕیزە دەنگە بێ ماناش دەگۆڕێ (یا نامینێ) بۆ نموونە دوو ڕیزە دەنگی (بەهار) و (گوڵ) لە زمانی کوردیدا مانایان جیایە چونکە دەنگەکانیان وەک یەک نین[1] ئەم دوو وشەیە دەنگەکانیان بەتەواوی جیان. جووتە وشەی وا هەیە هەندێ لە دەنگەکانیان یەکن و هەندێ جیان وەک لە (هاوین) و (هەویر)دا. (ه)، (و) و (ی) یەکن و ئەوانی تر جیان. جووتە وشەی واش هەیە تەنها لە تاکە دەنگێ نەبێ هەموو یەکن وەک لە وشەی (پیر) و (بیر)دا. لەم وشانەی دواییدا دەبینین گۆڕینی تاکە دەنگێ مانای تەواوی وشەکانی گۆڕی. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە (پ) و (ب) لە زمانی کوردیدا دوو نرخی جیایان هەیە چونکە هەردووک توانیان لە هەمان بیئەدا environment دەرکەون و دوو نرخی جیا پێشان بدەن. لە (کەر) و (کەڕ) یا (برین) و (بڕین)دا (ر) و (ڕ) دوو فۆنیمی جیان چونکە دەرکەوتنیان لە هەمان بیئەدا مانای جیای بەخشی بەوشەکانا چونکە لە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی کوردیدا (ر) و (ڕ) دوو نرخی جیایان هەیە. واتا دوو دەنگی جیاواز گەر بتوانن لە هەمان بیئەدا دەرکەون و دەرکەوتنی هەر یەکە لەم شوێنە تایبەتییەدا مانای جیای بەخشی لە دەرکەوتنی ئەوی تردا -لەناو چوارچێوەی زمانێکی تایبەتیدا- ئەوە ئەم دوو دەنگە سەر بەدوو فۆنیمی جیان و بەدوو فۆنیمی جیا لە قەڵەم دەدرێن لەم زمانەدا.

ئەو وشانەی هەموو دەنگەکانیان وەک یەکن تەنیا لە تاکە دەنگێ نەبێ و ئەم جیاییە لەم تاکە دەنگەدا مانای جیای بەوشەکانا بەخشی (جووتۆکە)ن minimal pair. بەبەراوردکردنی ئەم جووتۆکانە فۆنیمەکانی زمان دەسنیشان دەکرێت.

لە ئەنجامی گەڕان بەشوێن هەموو ئەو وشانەی -با بڵێین- لەگەڵ (پیر) و (بیر)دا جووتۆکەن لە زمانی کوردیدا. ئەم حەوت وشانەی خوارەوە دەس دەکەون (بەپێی کۆششی خۆم).

بیر - پیر - تیر - شیر - سیر - ژیر - میر.

بەم جۆرە توانیمان حەوت فۆنیم (ب - پ - ت - ش - س- ژ - م) دەسنیشان کەین. نەبوونی وشەی تر ڕێک کەوێ لەگەڵ ئەم کۆمەڵە ئەوە ناگەیەنێ کە فۆنیمەکانی کوردی هەر ئەم حەوتەن. کۆمەڵێکی تری وەک ئەوانەی خوارەوە بەراورد دەکرێن.

کەر - کەڕ - کەو - کەم - کەس - کەی - کەل - کەف.

ئەم هەشت وشانە کە هەموو جووتۆکەی یەکترن هەشت فۆنیمیان دەستنیشان کرد (ر - ڕ - و - م - س - ی - ل - ف)، دوانیان (س - م) لەگەڵ کۆمەڵی یەکەما هاوبەشن و شەشیان تازەن. بەمە ژمارەی فۆنیمەکان بوو بەسیانزە. لیستەکەمان زیاد دەکەین بەزیاکردنی کۆمەڵی تری وەکو ئەوانەی سەرەوە تا دەگەینە ڕادەیەک هیچ فۆنیمی تازە نادۆزرێتەوە. وەک ئەوەی خوارەوە.

| ژمارە | فۆنیمی تازە | فۆنیمەکان | جووتۆکە |
|---|---|---|---|
| ٧ | ب - پ - س - ش - ت - ژ - م | ب - پ - س - ش - ت - ژ - م | بیر - پیر - سیر - شیر - تیر - ژیر-میر |
| ٦ | ر - ڕ - و - ی - ل - ف | ر - ڕ - و - م - س - ی - ل - ف | کەر - کەڕ - کەو - کەم - کەس - کەی - کەڵ - کەف |
| ٥ | ک - ز - د - ه - غ | پ - ب - ش - ک - ز - د - ه - م - غ | پار - بار - شار - کار - زار - دار - هار - مار - غار |
| ٢ | خ - چ | ش - خ - ک - چ | شەو - خەو - کەو - چەو |
| ١ | ن | خ - چ - د - ن - ڕ - ل | خاو- چاو- داو- ناو- ڕاو-لاو |
| ١ | ڤ | ڤ - ژ - ز | ڤیان - ژیان - زیان |
| ١ | ح | ح - ن - ک - خ - چ | حەوت - نەوت - کەوت - خەوت - چەوت |
| ١ | ڵ | ل - ڵ | چل - چڵ |
| ١ | گ | ب - گ - ڕ - ل - ش - ک | بەش - گەش - ڕەش - لەش - شەش - کەش |
| - | - | ز - ژ - ن | هەزار - هەژار - هەنار |
| ١ | ج | ب - م - ج | باش - ماش - جاش |

| هەور - چەور - جەور | هـ - چ - ج | - | - |
|---|---|---|---|
| ڕەق - ڕەش - ڕەپ - ڕەز | ق - ش - پ - ز | ق | ١ |
| ماچ - مان - مار - ماف - ماش - ماڵ - ماد - مام - مات | چ - ن - ر - ف - ش - ڵ - د - م - ت | - | - |
| مازی - ماسی | س - ز | - | - |
| دوور - دار - دەر | وو - ا - ـە | وو - ا - ـە | ٣ |
| شێر - شار - شیر | ێ - ا - ی | ێ - ی | ٢ |
| زۆر - زار - زوور | ۆ - ا - وو | ۆ | ١ |
| ژان - ژین - ژ i ن | ا - ی - i | i | ١ |
| کۆن - کون | ۆ - و | و | ١ |
| برین - بڕین | ر - ڕ | - | - |
| کەڕ - کوڕ - کۆڕ - کڕ | ـە - و - ۆ - i | - | - |
| بان - باغ - بار - باو - باش | ن - غ - ر - ڕ - و - ش | - | - |

هەرچەندی کۆمەڵی تر زیاد کەین هیچی تری نوێمان بۆ نادۆزرێتەوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ژمارەی فۆنیمەکانی زمانی کوردی (٣٥)ن.

گەلێ وشەی عەرەبیش کە دەنگی (ع)ی تیایە لە زمانی کوردیی ئیمڕۆمان بەکار دەهێنرێن وەک (عیسا) و (لەعنەت) و (عومەر). هتد. دەشێ (ع)ش بەفۆنیمێکی زمانی کوردی بژمێررێ. بەم جۆرە و بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە زمانی کوردی (شێوەی خواروو) ٣٦ فۆنیمی هەیە.

ئەلف و بێی هەر زمانێ لەسەر بناغەی فۆنیمەکانی دادەمەزرێت.

هەر فۆنیمەی بۆ مەبەستی نووسین نیشانەیەکی بۆ دادەنرێت پێی دەوترێ پیت Letter.

ئاشکرایە کە دەنگی (س) لە وشەی (سەر) و (باس)دا جیان لە دەنگی (س) کە لە

وشەی (ساڵ) و (سەد)دا دەردەکەوێ. لەم وشانەی دواییدا دەنگەکە وەک بڵێی شێوەی (ص)ی وەرگرتبێ. سەرەڕای ئەم جیاوازییەش هەردووکیان سەر بەیەک فۆنیمن و یەک نرخیان هەیە لە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی کوردیدا. چونکە جووتە وشەی وا نادۆزرێتەوە لەم زمانەدا کە ئەم دوو دەنگە جیاوازەی تیا لە هەمان بینەدا دەرکەوێ و دوو مانای جیا ببەخشێ. ئەم دوو دەنگە هەردووک لە زمانی عەرەبیشدا هەن کەچی سەر بەدوو فۆنیمی جیاوازن چونکە دوو نرخی جیایان هەیە لە سیستەمی فۆنۆلۆجی زمانی عەرەبی. هەردووک لە هەمان بینەدا دەردەکەون و مانای جیا دەبەخشن. وەک لە (سارَ - ڕۆیشت) و (صارَ - بوو)دا. (س) و (ص) لە بینەی [(...)ار] دەرکەوتن. (ر) و (ڕ) لە زمانی کوردیدا دوو فۆنیمی جیان چونکە لەم زمانەدا جووتە وشەی وا هەیە کە ئەم دوو دەنگە جیاوازەیان تیا لە هەمان بینەدا دەردەکەوێ و مانای جیایان پێ دەبەخشن وەک لە (کەر - کەڕ)، (برین - بڕین)، (تیر - تیڕ)... هتد. لە بینەی [کە (...)] و [ب(...)ین]، [تی(...)]دا دەردەکەون. ئەم دوو دەنگە لە زمانی عەرەبیشدا هەن وەک لە وشەی (کریم) و (رحیم)دا دەردەکەون. بەڵام لە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی عەرەبیدا بەدوو شێوەی جیای هەمان فۆنیم دەژمێررێن چونکە ناتوانن هەردووک لە هەمان بینەدا دەرکەون و بەئاڵوگۆڕکردنیان ماناکان بگۆڕێن.

واتا فۆنیم شتێکی موجەررەدە abstruct. چەند دەنگێکی جیا ئەنوێنێ لە زمانێکی تایبەتیدا. ئەم دەنگانە شێوەی جیا دەگرنە خۆ بەپێی ئەو بینە جیاوازانەی تیایانا دەردەکەون.

بۆ جیاکردنەوەی ئەم دوو لایەنە نیشانەی فۆنیم دەخرێتە نێوان دوو هێڵی لارەوەی وەک // و نیشانەی دەنگ دەخرێتە نێوان دوو کەوانەی وەک [ ]. پەیوەندی نێوان دەنگ و فۆنیم لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

فۆنیم = | [دەنگ]<br>[دەنگ]

وەک:

/س/= | [س]<br>[ص] ⟵ لە زمانی کوردیدا

ئەو بەشەی زانستی زمان کە لە چۆنیەتی دروستکردنی دەنگەکانی زمان و سروشتیان دەکۆڵێتەوە و هۆی جیاوازی نێوان دەنگە جیاوازەکانی زمان دەردەخا فۆنێتیکە Phonet-ics.

فۆنۆلۆجی Phonology ئەو بەشەی زانستی زمانە کە لەو یاسایانە دەکۆڵێتەوە کە بەهۆیانەوە دەنگەکانی زمانێکی تایبەتی لە یەک دەدرێن بۆ دروستکردنی برگە. یەک نرخ دەدا بەکۆمەڵە دەنگێکی جیاواز کە هەمان کۆمەڵە دەنگ لەوانەیە لە زمانێکی تردا دەرکەون و تیایا کۆمەڵە نرخێکی جیا پێشان بدەن. واتا فۆنێتیک شتێکی گشتییە و فۆنۆلۆجی تایبەتییە. فۆنەتیک پێمان دەڵێ (ر) ، (ڕ)، (س)، (ص)، (ل) و (ڵ) چۆن دروست دەکرێن و بۆ جیاوازن بێ ئەوەی بایەخ بدا بەوەی ئەم دەنگانە سەر بە چ زمانێکن. کەچی لە ئاستی فۆنۆلۆجیدا (ر) و (ڕ) لە زمانی کوردیدا دوو نرخیان دەدرێتێ و لە زمانی عەرەبیدا یەک. (س) و (ص) لە زمانی کوردیدا یەک نرخیان دەدرێتێ و لە زمانی عەرەبیدا دوو... هتد.

بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە (ر) و (ڕ) دوو فۆنیمی جیان چونکە لەناو سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی کوردی دوو نرخی جیاوازیان هەیە. جیاوازی نێوانیان وەک جیاوازیی نێوان، بۆ نموونە، (پ) و (ج) یا (ک) و (ش) یا هەردوو فۆنیمێکی تر وایە. بۆیە لەهەر شوێنێکا دەرکەون شێوەیان چۆنە ئەبێ وا بنووسرێن ئەو ڕایەی کە دەڵێ لەبەر ئەوەی هەموو (ڕ)یەک لە سەرەتای وشەی کوردی دەرکەوێ قەڵەوە، بۆیە لە نووسینا پێویست بەوە ناکات نیشانەی (قەڵەوی)ی بۆ دابنرێت ڕایەکی پووچە و بەتیشکی نەزەرییەی فۆنیم ڕەش دەبێتەوە. دەرنەکەوتنی (ر)ی لاواز لە سەرەتای وشەی کوردی یاسایەکی فۆنۆلۆجییە لە زمانی کوردیدا پەیوەندیی بە(ڕ)ی قەڵەوەوە نییە. ئەوانەی ئەم ڕایەی پەسند دەکەن دەبێ ئەوەشیان لەبیر نەچێ کە (زۆربەی زۆری)ئەو(ل ) یانەی دوای ئەلف لە زمانی کوردیدا قەڵەون. وەک لە (ماڵ، هەڤاڵ، ساماڵ، تاڵ... هتد) لەم حاڵەتەدا ئەبێ لەم جۆرە وشانەش نیشانەی قەڵەوی بۆ (ل) دانەنرێت. نموونەی تری لەم بابەتە زۆرە.

لەم سروشتەدا هەموو شتێک لە گۆڕیندایە. باری ئێستەی هەر شتێ جیایە لە هی هەر سەردەمێکی تری. زمانیش وەکو لایەنێکی ئەم سروشتە لەم یاسا گشتییە بەدەر نییە. بەتێپەڕینی کات دەگۆڕێ. ئەو زمانانەی نووسراوی قۆناغە ڕابردووەکانیان لە پاش بەجێ دەمێنێ زۆر بەئاشکرایی ئەم گۆڕینەیان تیا دەرک دەکرێ. بۆ نموونە زمانی ئینگلیزی بۆ ماوەی هەزار و پێنج سەد ساڵی ڕابردوو بەبەردەوامی نووسراوەتەوە و شێوە جیاوازەکانی

قۆناغە جیاوازەکانی ئەم زمانە پارێزراوە. بەبەراوردکردنی ئینگلیزیی کۆن Old English کە لە دەوروبەری سەدەی یانزەم قسەی پێ دەکرا لەگەڵ ئینگلیزیی ئیمڕۆ، وەک دوو زمانی جیاواز خۆیان دەنوێنن. گۆڕینی زمان هەموو ئاستەکانی دەگرێتەوە مەبەست لە ئاستەکان لایەنی(سینتاکسی و مۆرفۆلۆجی و فۆنۆلۆجی و فۆنەتیکی و سیمانتیکییە). لێرە زۆر بەکورتی تەنها لایەنێکی چەمکی گۆڕین لە ئاستی فۆنۆلۆجیدا پێشکەش دەکرێ کە پەیوەندیی بەم باسەمانەوە هەیە.

ئەو هۆیانەی کاردەکەنە سەر زمان و دەیگۆڕن زۆرن. گەلێکیشیان هێشتا نەزانراون چین. یەکێ لەم هۆیانە کارتێکردنی زمانێکی ترە. بۆ نموونە لە ئینگلیزیی کۆندا دەنگی (ژ) نەبوو. بەڵام لە ئەنجامی کارتێکردنی زمانی فەرەنسی گەلێ وشەی وەک azure و measure و rough... هتد کە دەنگی (ژ)یان تیایە کەوتنە ناو زمانی ئینگلیزی و بوون بەبەشێکی بنجیی فەرهەنگی زمانی ئینگلیزی. بەم جۆرە دەنگی (ژ) کەوتە ناو سیستەمی فۆنۆلۆجی زمانی ئینگلیزی. دەنگی (ڤ)ش هەمان شت.

گۆڕینێکی تر بەسەر سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی ئینگلیزی هاتبێ ونکردنی دەنگی (خ)یە. وشەی night (نایت) و drought (دراوت) جارلن بە(نیخت) و (درۆخت) دەوتران. گۆڕینێکی فۆنۆلۆجی بەسەر زمانی ئینگلیزی هاتووە لەو ماوەیەی کەوتۆتە نێوان چۆسەر و شەکسپیردا. ئەنجامەکەی نەمانی دەنگی (خ) بووە لە زمانی ئینگلیزیدا. لە نووسینا هێشتا شوێنەواری ماوە. چونکە نووسین شتێکی جامیدە و نەگۆڕراوە بەگۆڕینی شێوەی قسەکردن.

ئێستە هیچ زمانەوانێک نییە لە جیهانا دان بەوە نەنێ کە (ژ) و (ڤ) دوو فۆنیمی زمانی ئینگلیزنین، کەچی بەڵگەی مێژوویی هەیە کە ئەم دوو دەنگە سەردەمێک لە زمانی ئینگلیزیدا نەبوون و لە ئەنجامی کارتێکردنی زمانی فرەنسی کەوتوونەتە ناو زمانی ئینگلیزی. هیچ زمانەوانێکیش نییە بڵێ دەنگی (خ) لە زمانی ئینگلیزیدا هەیە چونکە لە نژادا ئەم دەنگەی هەبووە. (ع) و (ق) و (ح)ش بۆ زمانی کوردی هەمان شت. لە نژادا کوردی بووبن یا لە ئەنجامی کارتێکردنی زمانێکی تر کەوتبنە ناوی گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە ئێستە بەشێکی بنجیی سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی کوردین. پەیابوونی دەنگی تازە لە زمانا لە ئەنجامی کارتێکردنی زمانێکی تر دیاردەیەکی سروشتییە و هیچ زمانێک نییە و نەبووە بەسەریا نەهاتبێ و هەرگیز ناتوانێ خۆی لێ بپارێزێ .

باوترین گیروگرفت لە ئیملای کوردی پێک نەهاتنە لەسەر جۆری نووسینی هەندێ لە پیتەکان. بۆ نموونە ئەوەی پێی دەڵێن واوی درێژ هەندێ وای پەسند دەکەن بەواوێک نیشانەیەکی وەک فەتحەی عەرەبی بۆ دابنرێ (ۆ) هەندێکیش بەدوو واو (وو)... هتد کەس ناتوانێ بیسەلمێنێ کامەیان بۆ نووسین لەوی تر باشترە. باشترینیان ئەوەیانە کە هەڵدەبژێرێت بەپێکهاتنی هەموو لایەک.

هەندێ زمانەوان هەن ئەو (وێ)یەی لە وشەی وەکو (شوێن) و (خوێن) و (سوێند)دا دەردەکەوێ بەیەک فۆنیم لە قەڵەم دەدەن و وای بەراست دەزانن کە دەبێ یەک نیشانەیان بۆ دابنرێت. دیسان بەپەنابردنە بەر شیکردنەوەی فۆنۆلۆجی ئەم جۆرە گیروگرفتانە چارسەر دەکرێن.

زۆر بەکورتی: ئەو قاڵبە فۆنۆلۆجییەی برگەی کوردیی تیا دادەڕێژرێ ئەمەی خوارەوەیە.

(C) (C) {V} (C) (C)

V= Vowel

C= Consonant

| | | |
|---|---|---|
| CCVCC | Xwârd | |
| CCVC | Cwâr | |
| CCV | Xwâ | |
| CVC | guf | |
| CV | ba | |
| V | a | a-xom |
| VC | as | as-tûr |
| VCC | ârd | |
| CVCC | dast | |

واتا لە برگەیەکدا ئەبێ ڤاوڵێک هەبێ و ئەشێ لە یەکەوە تا چوار کونسونانتی لە گەڵا دەرکەوێ بەهەموو جۆر بەمەرجێ لە دوو زیاتر نەکەونە لایێ.

دوو کۆنسونانت (یا زیاتر) بەیەکەوە دەرکەون لە برگەیەکدا بێ ئەوەی ڤاوڵێ لە نێوانیانا دەرکەوێ هێشووClusterپێک ئەهێنن. هەر زمانەی یاسای فۆنۆلۆجی تایبەتی بەخۆی هەیە بۆ دروستکردنی ئەم هێشووانە و شوێنی دەرکەوتنیان. زمانی کوردی هێشووی دوویی هەیە وەک (st-) (şt-) و (rd-) لە (دەست) و (گەشت) و (بەرد)دا.

ئەم جۆرە هێشووبانە لە زمانی کوردیدا هەمیشە لە دوای ڤاوڵی برگەکەوە دێن. زمانی ئینگلیـزی هێـشـووی دوویی و سـێـیی هەیە وەک (sp-) و (spr-) لە (spin) و (spring)دا... هتد.

لە زمانی کوردیدا فۆنیمی (ş - s - j - c - k - x) لەگەڵ (w) هێشوو دروست دەکەن. ئەم جۆرە هێشووبانە هەمیشە لە سەرەتای برگە دەردەکەون.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| X | | | Xw | Xwar - Xwê |
| K | | | Kw | Kwâ - Kwêr |
| C | + (W) | = | Cw | Cwâr |
| J | | | Jw | Jwân - Jwâmêr |
| S | | | Sw | Swend - Swân |
| Ş | | | Sw | Şwên -Şwân |

کە ڤاوڵی (ê) دەبێ بەناوکی برگەکە - لەبەر سروشتی ڤاوڵەکە و ئەم (W)یە ئیدغام assimilation پەیدا دەبێ و لە ئەنجاما ئەم جۆرە دەنگە دروست دەکەن کە لە فۆنەتیکا بە Short - Front - rounded lips ناودەبرێ و لە هەندێ زمانا (وەک فەرەنسی) فۆنیمێکە. لە زمانی کوردیدا ناشێ بەفۆنیمێکی سەربەخۆ لە قەڵەم بدرێ چونکە ئەو دەنگانەی لە ئەنجامی ئیدغامەوە دروست دەبن ناخرێنە ناو سیستەمی فۆنیمەکانی زمانەوە.

گریمان (وێ) لە زمانییا کوردیدا بۆتە فۆنیمێکی سەربەخۆ لە ئەنجامی گۆڕینێکی تایبەتی. سەرەڕای ئەمەش نووسینی بەم جۆرەی سەرەوە شتێکی ناڕەوا نییە. نووسین شتێکی دەسکردە پێکهاتنە لەسەریا لەلایەن کۆمەڵەوە هیچ کار ناکاتە سەر جەوهەری زمانەکە. هەموو میللەتی ئینگلیز کە دەنووسی (night) ئەو (gh)ەی دەخاتە ناو بێ ئەوەی هیچ دەنگێ لە قسەکردنا بنوێنێ.

لە ڕستەی

Did he believe that Caesar could see the people Seize the Sea.

لە وشەی:

| | |
|---|---|
| he | (e) |
| believe | (ie) |
| caesar | (ae) |
| see | (ee) |

people (eo)
seize (ei)
seas (ea)

هەموو دەنگ دەنوێنن (ی). سەرەڕای ئەمەش کەسێ جۆری قسەی خۆی ئەگۆڕێ لەبەر ئەمانە واتا نووسین کار لە جۆری قسەکردن ناکات. بەلای منەوە لەبەر هۆی بەستراو بەسیستەمی زمانەکەوە بە(وێ) بنووسرێ ڕاسترە.

هەمان شت لەگەڵ ئەو فۆنیمەی لە ئەلف و بێی عەرەبیدا تیپی بۆ نییە واتا /i/.

ئەوە چەند ساڵە زمانی کوردی بەئەلف و بێی عەرەبی دەنووسرێ، کەچی هیچ خوێندەوارێک هەستی بەگیروگرفتێکی وا نەکردووە باس بکرێ لەبەر نەبوونی ئەم فۆنیمە. ئەم فۆنیمە لە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی کوردیدا پێشبینە Predictable واتا ئەو بینە فۆنۆلۆجییەی تیایا دەردەکەوێ فەرزی دەکا تۆ بیڵێی با هیچ نیشانەیەکیشی بۆ دانەنرابێ.

سەر و بۆر و ژێر (الفتحة والضمة والكسرة) سێ فۆنیمن لە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی عەرەبی، کەچی لە زۆربەی زۆری چاپکراوەکانی هیچ سیمایەکیان لە نووسینا بۆ نییە، کەچی هیچ گیروگرفتێ بەدی ناکرێ.

دەربارەی (ئـ)، بەلای منەوە سروشتی نووسینی کوردی بەئەلف و بێی عەرەبی ئەم (ئـ)یەی بەسەر زمانی کوردیدا سەپاندووە. هەر وەک چۆن (i)ی لە نووسینا لەناو بردووە.

لەو گۆڕینانەی لە ئاستی فۆنۆلۆجیدا بەسەر زمانا دێ ئەمانەن:

١- گۆڕینی فۆنیمێ بەفۆنیمێکی تر.

٢- گۆڕینی دەنگێ تەنیا لە هەندێ بینەدا بەدەنگێکی تر.

٣- توانەوە و نەمانی دەنگێ لە هەندێ بینەدا و بوونی بەدەنگێکی تر لە هەندێ بینەی تر.

٤- توانەوە و نەمانی دەنگ لە هەندێ بینەدا.

یێکێ لەو گۆڕینانەی لە ئاستی فۆنۆلۆجیدا بەسەر زمانی کوردی (خواروو) هاتبێ توانەوەی دەنگی (د)یە لە هەندێ بینەدا، وەک (د)ی نیشانەی هەمیشەیی. ئەم دەنگە تواوەتەوە و نەبۆتە دەنگێکی تر.

daxom ⟶ axom
damxward ⟶ amxward

که ئەمە بەئەلف و بێی عەرەبی ئەنووسرێ:
(دەکەم) = (ەکەم) و (ە) لە سەرەتای وشەدا دەرناکەوێ و نانووسرێ لە سیستەمی ئەلف و بێی عەرەبی بۆیە (ئـ)ی پێوە لکێنراوە ڕای گرێ و بووە بە(ئە).
هەروا دەرنەکەوتنی (ئـ) لە هیچ وشەیێکی تری کوردی و بوونی بە(ی) یا (و) لەو وشانەی لە (عەرەبی)یەوە وەرنەگیرێن ئەمە ئەسەلمێنێ:
سؤال = سوال
بئر = بیر ... هتد.
کاتێ باسی ئیملا دەکرێ هەر (پیت) و چۆنیەتی لە یەکدانیان دێتە خەیاڵ. لە هەموو زمانێکا گەلێ کەرسەی فۆنەتیکی تری واهەیە(وەک هێزstress، ئاوازەintonation،... هتد) کە دەوریان لە گۆڕینی مانادا جیاوازی نییە لەو دەورەی فۆنیمە جیاوازەکان دەیگێڕن. لەگەڵ ئەوەشا گوێیان نادرێتێ چونکە هەموو پێش بینێ Pridicable - مەبەستی قسەکەرو شوێنی وشەکە لە ڕستە و شوێنی ڕستەکە لە قسەکردنا بڕیار دەدەن و دەری دەخەن. وەک:
نوستن - دوو مانای هەیە.
گەر هێزەکە stress بخرێتە سەر بڕگەی یەکەم مانای (ئەوان) نووستن - دەدا.
گەر هێزەکە بخرێتە سەر بڕگەی دووەم مانای نوستن (خۆشە) - دەدا... هتد.
ئەم جۆرە کەرەسانە زۆر گرنگن و هیچ زمانێک نییە نەیبێ بەلام لە نووسینا هەموو پشتگوێ خراون.
گەر ئەو ئیملایەی ئێستەمـــان بەراوردی بکەین لەگەڵ ئیملای میللەتانی تری وەک ئینگلیزی و چینی و فرەنسی ئەوسا هەست بەوە دەکەین ئێمە لە چاو ئەو میللەتە پێشکەوتووانە گیروگرفتی ئیملاییمان چەند کەمە.
گریمان توانیمان ئیملایێ پێک بهێنین پڕ بەپێستی زمانەکەمان بێ... زمان دەگۆڕێ و نووسین وشکە و ناگۆڕێ... زۆری پێ ناچێ دیسان زمانەکە و جۆری نووسینەکەی لە یەک دەترازێن و جیا دەبنەوە... وەک ئەوەی بەسەر زمانی ئینگلیزی هاتووە.
زۆربەی زۆری ئەم گـیـروگـرفـتـانە چارەســەر دەکـرێن تەنها بەپێکهاتن لەسەر دەستنیشانکردنی فۆنیمەکانی کوردی و جۆری نووسینیان. و لێکدانیان بەگرتنەبەری پەیڕەوێکی زانستیی دوور لە نارەزووی شەخسیی لە بڕیاردانیشا نەبێ مەسەلەی(مێژوو و ئابووری) ڕەچاو بکرێن... جا پێک وەرن.

**پەراوێز:**

١- مەسەلەی هەمان ڕیزە دەنگ زیاتر لە یەک مانا دەبەخشێ Homophony یا هەمان مانا بەزیاتر لە یەک ڕیزە دەنگ Synongmy دەردەبڕێ کۆسپ نییە لەسەر ڕێگەمان لێرە. چونکە ژمارەی ئەم جۆرە وشانە یەکجار کەمن لە هەموو زمانێکا و لە نرخی ئەم تەزەرییەیە کەم ناکاتەوە.

سەرچاوەکان:

1- Abercrombie, D. (1907) "Elements of General phonelics" Edinburgh.

2- Fromkin, V. and Rodman, R. (1978) "An introduction to Lanquage".

3- Fudge, E. C. (1970) "Phonology" in New Horizons in Linguistics. J. Lyons.

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد - بەغدا، ژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٨٢، لاپەڕە ٤٣٤-٤٣٩ بڵاوکراوەتەوە.**

# لایەنێکی جیاوازی

بەراوردکردن و پێشاندانی جیاوازی نێوان دوو شێوە یا دوو زمان ڕێڕەوی تایبەتیی خۆی هەیە و بەشێکە لەو دەستکەوتانەی زانست بەگشتی و زانستی زمان بەتایبەتی و سەر بەو لقەیە کە بەزانستی زمانی بەراوردی Comparative Linguistcs ناسراوە.

بەراوردکردنی دوو شێوە یا زمان و پێشاندانی لایەنە جیاواز و لە یەکچووەکانیان هەنگاوی دوای لقێکی بنجیی تری زانستی زمانە کە بەزانستی زمانی وەسفی -Dis criptive Linguistics ناو دەبرێت.

لە پێش هەموو شتێکدا پێویستە لقە گرنگەکانی زانستی زمان کە بەکار دەهێنرێن بۆ شیکردنەوەی زمان بزانین چین، وەک سەرەتایێک بۆ ڕێگا پاککردنەوە بۆ چوونە ناو باس ئینجا نموونەییێکی زۆر گرنگی جیاوازیی نێوان کرمانجیی خواروو و ژووروو دەخەمە ڕوو کە زمانەوانانمان بەهەڵە بۆی چوون.

**لقەکانی زانستی زمان:**

زانستی زمان بریتییە لە کۆمەڵێک بواری بەیەک بەستراو بەکاردەهێنرێن بۆ شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی زمان. گرنگترییان (زانستی زمانی وەسفی و مێژوویی و بەراوردی)ن .

١- زانستی زمانی وەسفی: Discriptive Linguistics

ئەم لقە بایەخ بەشیکردنەوە و پێشاندانی شێوە و چۆنیەتی کارکردنی زمان دەدات کە لەلایەن کۆمەڵێک خەڵکەوە لە کاتێکی دەستنیشانکراوا بەکار دەهێنرێت. کاتەکە دەشێ ئێستا بێ و دەشێ ڕابردووبێ. ئەو زمانانەی هێشتا خۆیان نەخستۆتە ناو چوارچێوەی نووسین، بێگومان، ناکرێ شێوەی پێشوویان پیشان بدرێت [هەرچەندە هەندێ ڕێڕەوی تایبەتی هەن کە بەهۆیانەوە گوایا ئەتوانرێت شێوەی قۆناغە پێشووەکانی زمان دروست بکرێتەوە، بەڵام ئەنجامێکی ئەوتۆ بەدەستەوە نادەن].

دەتوانرێت باسی شێوەی ڕابردووی زمانێ بکرێ و لێی بکۆڵرێتەوە کەی نووسراوی تەواوی ئەو ساتە تایبەتییەمان بەدەستەوە بوو. بۆ نموونە زمانی لاتینی کە ئێستا

زمانێکی مردووه بەڵام نووسراوێکی زۆری لە پاش بەجێ ماوە کە بەهۆیانەوە دەتوانرێت لێکۆڵینەوەیێکی تەواوی ئەوسای زمانی لاتینی پێشکەش بکرێت. زمانی ئینگلیزیی کۆن و ناوەڕاست و نوێ بۆ ماوەی (١٥٠٠) ساڵی بەسەرچوو، نووسراوی بەردەوامی هەبووە و ماوە، بەهۆی ئەم نووسراوانە ئەتوانرێ شێوەی تەواوی هەج قۆناغێکی ئەم (١٥٠٠) ساڵەی زمانی ئینگلیزی پێشکەش بکرێت.

لێکۆڵینەوەی زمان لەسەر بناغەی زانستی زمانی وەسفی بایەخ بەزمانەکە دەدات تەنیا لەو ساتە تایبەتییەدا. واتا، نابێ باسی هیچ قۆناغێکی تری زمانەکە بکرێت چ ڕابردوو چ داهاتوو. هەروا لەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەدا نابێ باسی زمانێکی تر بکرێت چ دوور چ نزیک. هەروەکو چۆن بەکامیرا وێنەی کابرایێک لە ساتێکی دیاریکراوا وەردەگیرێت و ئەم وێنەیە تەنیا شێوەی ئەو ساتە زۆر تایبەتییەی ژیانی ئەم کابرایە پێشان دەدات؛ زانستی زمانی وەسفیش ئاوا، دەبێ شێوەی ئەو ساتە تایبەتییەی زمانەکە پێشان بدات.

زانستی زمانی وەسفی بەگرنگترین لقی زانستی زمان دەژمێررێت چونکە بەبێ بەجێهێنانی ئەم لقە، لقەکانی تر بەجێ ناهێنرێن.

٢- زانستی زمانی مێژوویی Historical Linguistics

لێکۆڵینەوەیە لە پەرسەندن و گۆڕینی زمان بەتێپەڕینی کات و ڕێگە و هۆی ئەم گۆڕینە لە کاتێکەوە بۆ کاتێ و دۆزینەوە و دەسنیشانکردنی ئەو هۆیانەی کاردەکەنە سەر زمان و دەیگۆڕن.

ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە دەبێ لەسەر بناغەی پێشاندانی لایەنە لەیەکچوو و جیاوازەکانی هەمان زمان لە دوو یا چەند قۆناغێکی جیاوازدا دامەزرابێ.

٣- زانستی زمانی بەراوردی Comparative Linguistics

لە زانستی زمانی بەراوردیدا دوو یا چەند زمانێ یا شێوەیێ یا هەمان زمان یا شێوە لە دوو قۆناغی جیاوازدا لە یەک یا چەند ڕوویەکەوە بەراورد دەکرێن.

زانستی زمانی بەراورد دوو لقە، یەکەم بەراوردکردن لەسەر بناغەی پێوەندیی مێژوویی و خزمایەتی نێوان ئەم زمانانە و دووری و نزیکییان لەیەک و دۆزینەوەی ئەو زمانانەی سەر بەیەک بنەماڵەن. دووەم بەراوردکردنی دوو یا چەند زمانێ بۆ پێشاندانی لایەنە جیاواز و لەیەکچووەکانیان بێ ئەوەی گرنگێتی بدرێتە پێوەندی مێژوویی نێوانیان. بۆ نموونە زمانەکانی تورکی و یابانی و سواهیلی لە ئەنجامی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە خراونەتە

یەک گرووپەوە لە لێقڵی مـــۆرفۆلۆجیدا چونکە هەمـــوو سەر بەو کـــۆمەڵـــەن کە بە agglutinative ناو دەبرێن. واتا لە لێقڵی مۆرفۆلۆجیدا لەیەک دەکەن. ئەم جۆرە لێکۆڵینەوە و دابەشکردنە بە Typological classification ناو دەبرێت.

بۆ بەراوردکردنی دوو شێوە یا زمان دەبێ ئەم دوو شێوە یا زمانە پێشتر هەریەکە بەجیا شی بکرێتەوە ئنجا بەراورد بکرێن.

**ئاستەکانی زمان:** Levels of languags

زمان دیاردەیێکی یەکجار ئاڵۆز و چووەناویەکە، بۆیە شیکردنەوەی شتێکی ئاسان نییە و بەجارێ ناکرێ. زانایانی زمان بۆ ئەوەی بەرگێکی زانستی بکەنە بەر زمان شناسی، زمانیان دابەش کردۆتە سەر چەند لێقڵێ. دەسنیشانکردن و دۆزینەوەی ئاستەکانی زمان خۆی دەسکەوتێکی گرنگی زانستی زمانە. چەند بیروباوەڕێکی جیا هەن دەربارەیان و هەر جۆرە لێکۆڵینەوەیەکیش دابەشکردنی تایبەتیی خۆی هەیە. بۆ ئەم باسەی ئێستامان پێویستە ئاستەکان بەم جۆرە دابەش بکرێن.

وەک زانراوە بچووکترین کەرەسەی زمان تاکە دەنگەکانیەتی. لێکۆڵینەوە لە دەنگەکانی زمان و دەسنیشانکردنی چۆنیەتی دروستبوون و گواستنەوە و وەرگرتنیان لەلایەن گوێگرەوە فۆنێتیکە Phonetics. ئەمەیان ئاستێ.

کۆمەڵە دەنگێک کە هەموو بەیەکەوە هەمان نرخیان هەبێ لە زمانێکی تایبەتیدا یەک فۆنیم Phoneme پێک دەهێنن. چەند فۆنیمێک بەپێی یاسا فۆنۆلۆجییەکانی تایبەتی بەزمانەکەوە لەیەک دەدرێن و برگە Syllable دروست دەکەن. ئەو ئاستانەی باس کران لایەنی بێ واتای زمان دەگرنەوە.

هەروەها بەیەک یا زیاتر لە یەک فۆنیم، مۆرفیم Morpheme دروست دەبێ. مۆرفیم بچووکترین کەرەستەی واتاداری زمانە کە لە ڕێزمانا دەورێکی هەیە.

بەیەک مۆرفیم یا زیاتر وشە Word دروست دەبێ. بەیەک وشە یا زیاتر فرێز Phrase دروست دەبێ و چەند فرێزێک ڕستە Sentence دروست دەکەن. ئەم نەخشە و وێنەیە ئاستەکانی زمان و پێوەندی نێوانیان ڕوون دەکەنەوە.

| دەنگ | فۆنێتیک | بێ واتا |
|---|---|---|
| فۆنیم | فۆنۆلۆجی | |
| برگە | | |
| مۆرفیم | مۆرفۆلۆجی | بە واتا |
| وشە | | |
| فریز | سینتاکس | |
| ڕستە | | |

نەخشەی ژمارە (١)

نەخشەی ژمارە (٢)

واتا بەگشتی چوار ئاست لە زمانا دەستنیشان دەکرێت. گەر بمانەوێ دوو شێوە یا زمان بەراورد بکەین دەبێ پێشتر ئاستەکە دەستنیشان کەین و هەردوو زمان یا شێوەکە لەم ئاستەدا شی بکەینەوە ئینجا بەراوردیان بکەین و لایەنە لەیەکچوو و جیاوازەکانیان دەربخەین. دەتوانرێت لایەنێ لە ئاستی هەڵبژێردرێت لە دوو زمان یا شێوەدا و بەراورد بکرێن وەک ئەوەی بەتەمایین لەم وتارەدا پێشکەشی کەین ئەویش ڕاناوە لە ئاستی سینتاکسا. ئەوەی تا ئێستا وترا تەنیا سەرەتاییک بوو بۆ چوونە ناو باس و پیشاندانی چۆنیەتی کارکردنی لایەنێکی گرنگی زمانی کوردی لە دوو شێوەی جیاوازدا.

یەکێ لە جیاوازییە هەرە دیارەکانی نێوان کرمانجیی خواروو و ژووروو، لە ڕاناو و چۆنیەتی دابەشبوون و کارکردنیاندایە.

لەم‌وتارەدا باسی ڕاناونەکرێ تەنیا لە ڕووی سینتاکسەوە. واتا پێوەندی ڕاناوی لکاو و جودا بەبەشەکانی تری ڕستەوە. بۆیە لێکۆڵینەوەکە لە ڕووی ئاستەکانی تری زمانەوە ساکار دێتە بەرچاو.

***

دابەشبوونی ڕاناوەکانی جودا و لکاو لە کرمانجیی خواروو و ژووروودا لەم نەخشەی خوارەوە ڕوون کراوەتەوە .

| کەس و ژمارە | کرمانجیی خواروو | | | کرمانجیی ژووروو | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ڕاناوی جودا | ڕاناوی لکاو | | ڕاناوی جودا | | ڕاناوی لکاو |
| | | A | B | A | B | |
| ١ ت | من | م | م | من | ئەز | م |
| ٢ ت | تۆ | ت | یت | تە | تو | ی |
| ٣ ت | ئەو | ی | Ø، ات، یت | وی، وێ | ئەو | Ø، ت، یت |
| ١ ک | ئێمە | مان | ین | مە | ئەم | ین |
| ٢ ک | ئێوە | تان | ن | وە | هون | ن |
| ٣ ک | ئەوان | یان | ن | وان | ئەو | ن |

نەخشەی ژمارە(٣)

**کرمانجیی خواروو:**

له کرمانجیی خواروودا بکەر و فرمان له کەس و ژمارەدا ڕێک دەکەون. واتا بکەر له چ کەس و ژمارەیەکدا بێت فرمانیش ڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارە وەردەگرێت. بۆ نموونه گەر بکەر له کەسی یەکەمی تاکدا بێ، فرمانیش ڕاناوێکی لکاوی سەر بەیەکەمی تاک وەردەگرێت.

گەر بکەر له کەسی دووەمی کۆبێ، فرمانیش ڕاناوێکی لکاوی سەر بەدووەمی کۆ وەردەگرێت... هتد.

من خوارد - م.

ئێوه نوست - ن.

وەک له نەخشەی ژمارە (۳)دا ڕوون کراوەتەوە کرمانجیی خواروو یەک سێت ڕاناوی جودا و دوو سێت ڕاناوی لکاوی هەیە (بۆ کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی تاک و کۆ). سێتە جیاوازەکانی ڕاناوی لکاو له کرمانجیی خواروودا هەمان دەوریان هەیە وەک نیشانەی ڕێکەوتن، بەڵام دەرکەوتنیان بەسراوە بەجۆری فرمانەکە (تێپەڕ یا تێنەپەڕ) و کاتی فرمانەکە (ڕابردوو یا داهاتوو)ەوە.

سێتی (A) لەگەڵ فرمانی تێپەڕی ڕابردوودا دەردەکەوێت بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن Agreement, Concord لەگەڵ بکەری ڕسته له کەس و ژمارەدا.

من خوارد - م.

تۆ خوارد - ت.

ئەو خوارد - ی.

ئێمە خوارد - مان.

ئێوه خوارد - تان.

ئەوان خوارد - یان.

یەکێ له تایبەتییەکانی ئەم سێته ئەوەیە که شوێنیان له ڕستەدا دەگۆڕێت بەپێی قاڵبی فرمانەکە (سادە یا لێکدراو) و دەرکەوتن و دەرنەکەوتنی بەشەکانی تری ڕسته (بەرکاری ڕاستەوخۆ Direct object و بەرکاری ناڕاستەوخۆ Indirect object.)

گەر پریدیکەیت Pridicate بریتی بێ تەنیا له فرمان و فرمانەکە و هیچ پێشگرێکی لەگەڵا نەبێ، ئەوه ڕاناوه لکاوەکە بەرەگی فرمانەکەوە دەلکێ.

ئێمە نووسی - مان.

ڕاناوی ئەم سێتە بەیەکەم پێشگرەوە دەلکێ کەی پێشگرێ یا زیاتر لە پێشگرێ لەگەڵ ڕەگی فرمانەکە دەرکەوت.

ئێوە هەڵ - تان - دە - گرت.

تۆ دا - ت - نا.

گەر پریدیکەیت بریتی بوو لە فرمان (چ سادە چ لێکدراو) و بەرکاری ڕاستەوخۆ و بەرکاری ناڕاستەوخۆ، ڕاناوی لکاوی سێتی (A) بەبەرکاری ڕاستەوخۆوە دەلکێ[1].

ئێوە گوڵ - تان بۆ من دەنارد.

ڕاناوی لکاو بەبەرکاری ناڕاستەوخۆوە دەلکێ کەی بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەکەدا دەرنەکەوت.

ئەوان بۆ تۆ - یان نارد.

ڕاناوەکە بەپریپۆزیشنەوە Preposition دەلکێ کەی بەرکاری ڕاستەوخۆ و بەرکاری ناڕاستەوخۆ لە ڕستەکەدا دەرنەکەوتن.

ئەو بۆ -ی هێنا.

لەوەی ڕابورد دەردەکەوێت کە - ڕاناوی لکاوی سێتی (A) دەوری دەربڕینی ڕێکەوتن دەبینێ لە نێوان بکەر و پریدیکەیتی ڕستە لەگەڵ فرمانی تێپەڕی ڕابردوو - بەم ڕیزە بەیەکەمی ئەم بەشانەی ڕستەوە دەلکێت[2].

DO - IO - Prep - pref - VS

واتا گەر هەموو ئەمانە لە ڕستەدا دەرکەوتن، DO ئەبێ بەیەکەم و ڕاناوەکە بەمەوە دەلکێ. گەر DO دەرنەکەوت ئەوە IO دەبێ بەیەکەم و ڕاناوە لکاوەکە بەمەوە دەلکێ. کە DO و IO دەرنەکەوتن پریپۆزیشن دەبێ بەیەکەم و ڕاناوەکە بەمەوە دەلکێ. گەر IO، DO و Prep دەرنەکەوتن ئەوە بەپێشگری یەکەمەوە ئەلکێ... کەی پێشگریش نەبوو ئەوسا ڕەگی فرمانەکە ئەبێ بەیەکەم و ڕاناوەکە بەمەوە دەلکێ[3].

... یاسای ژمارە (١)

سێتی (B) لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕی ڕابردوو و تێپەڕ و تێنەپەڕی داهاتوودا دەردەکەوێت بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لە نێوان بکەر و فرمانی ڕستەدا.

سێتی (B) هەمیشە بەرەگی فرمانەوە دەلکێ.

...... پاسای ژمارە (٢)

ئێمە نوست - ین.

ئێوە دەخۆ - ن.

تۆ دەڕۆ - یت.

دەرکەوتنی سێتە جیاوازەکانی ڕاناوی لکاو وەک ئامرازی ڕێکەوتن لەم نەخشەی خوارەوە ڕوون کراوەتەوە.

| جۆری فەرمان / کات | تێپەڕ | تێنەپەڕ |
| --- | --- | --- |
| ڕابردوو | A | B |
| داهاتوو | B | B |

نەخشەی ژمارە (٤)

تاکو ئێرە دەوری سێتە جیاوازەکانی ڕاناوی لکاو وەک ئامرازی ڕێکەوتن لە کرمانجیی خوارووا ڕوون کرایەوە. بێجگە لە دەوری ڕێکەوتن ئەم ڕاناوانە چەند دەورێکی تریشیان هەیە. با سەیرێکی ئەم ڕستانەی خوارەوە بکەین کە فرمانەکانیان هەموو لە کاتی ڕابردوودان.

١- أ- تۆ ئەوان - ت نارد.

ب- تۆ نارد - ت- ن.[٤]

٢- أ- ئەوان تۆ - یان دەنارد.

ب- ئەوان دە - یان - نارد - یت.

٣- أ- خوا تۆ -ی بۆ ئەوان نارد.

ب- خوا بۆ ئەوان-ی نارد - یت.

ج- خوا تۆ -ی بۆ نارد -ن.

د- خوا بۆ -ی نارد -ن - یت.

٤- أ- ئەو كتێبەكەی تۆ -ی فرۆشت.

ب- ئەو كتێبەكە -ی فرۆشت - یت.

لەو ڕستانەی سەرەوە (أ و ب) هاوواتان Synonymous.

لە (أ) بەركاری ڕاستەوخۆ بەڕاناوێكی جودا (ئەوان) دەربڕاوە. ئامرازی ڕێكەوتن (ت) بەمەوە لكاوە.

لە (ب) هەمان بەركار بە ڕاناوێكی لكاو (ن) دەربڕاوە كە سەر بە سێتی (B)یە و هەمان كەس و ژمارەی هەیە وەك ڕاناوە جوداكە. ئامرازی ڕێكەوتن بەڕەگی فرمانەكەوە لكاوە.

لە كۆمەڵی دووەما وەك كۆمەڵی یەكەم (أ و ب) هاوواتان.

لە (أ) بەركاری ڕاستەوخۆ بەڕاناوێكی جودا دەربڕاوە (تۆ). ئامرازی ڕێكەوتن (یان) بەمەوە لكاوە.

لە (ب) هەمان بەركار بەڕاناوێكی لكاوی سەر بەهەمان كەس و ژمارەی سێتی (B) دەربڕاوە (یت) و بەڕەگی فرمانەكەوە لكاوە. ئامرازی ڕێكەوتن (یان) بەپێشگری (دە)وە لكاوە.

لە كۆمەڵی سێیەما ڕستەی (أ، ب، ج، د) هەموو هاوواتان.

لە (أ) بەركاری ڕاستەوخۆ و بەركاری ناڕاستەوخۆ بەڕاناوی جودا دەربڕاون (تۆ، ئەوان). ئامرازی ڕێكەوتن (ی) بەبەركاری ڕاستەوخۆوە (تۆ) نووساوە.

لە (ب) بەركاری ڕاستەوخۆ بەڕاناوێكی لكاوی سێتی (B)ی سەر بەهەمان كەس و ژمارەوە (یت) دەربڕاوە. ئامرازی ڕێكەوتن بەبەركاری ناڕاستەوخۆوە (ئەوان) لكاوە.

لە (ج) بەركاری ناڕاستەوخۆ بەڕاناوێكی لكاو دەربڕاوە. (ن) لكاوە بەڕەگی فرمانەكەوە.

لە (د) بەركاری ڕاستەوخۆ و بەركاری ناڕاستەوخۆ هەردووك بەڕاناوی لكاو دەربڕاون (ن، یت). ئامرازی ڕێكەوتن (ی) بەپریپۆزیشنەوە (بۆ) لكاوە.

لە كۆمەڵی چوارەما، ناوی هەیی لە (أ) بەڕاناوێكی جودا دەربڕاوە (تۆ).

لە (ب) هەمان ناو بەڕاناوێكی لكاوی سێتی (B)ی سەر بەهەمان كەس و ژمارەوە دەربڕاوە (یت).

[لەوەی ڕابورد دەردەکەوێت کە ئەو ڕاناوە لکاوانەی دەوری ڕێکەوتن لە ڕستەدا بەجێ ئەهێنن لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕی ڕابردوو و (تێپەڕ و تێنەپەڕی داهاتوو) -واتا سێتی (B)- ئەتوانن جێی بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ و ناوی هەیی possessive noun بگرن لەگەڵ فرمانی تێپەڕی ڕابردوو].

کە بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هەردووک بەڕاناوی لکاو دەربڕان، ڕیزبوونیان لەگەڵ ڕەگی فرمانا بەم جۆرە دەبێ:

ڕەگی فرمان -بەرکاری ناڕاستەوخۆ- بەرکاری ڕاستەوخۆ.

...... یاسای ژمارە (٣)

با سەیرێکی ئەم نموونانەی خوارەوە بکەین کە فرمانەکانیان هەموو لە کاتی داهاتوون.

١- أ- ئەوان ئێوە دەنێر -ن.

ب- ئەوان دە - تان - نێر - ن.

٢- أ- خوا ئەو بۆ ئێمە دەنێر - ێت.

ب- خوا بۆ ئێمە -ی دەنێر - ێت.

ج- خوا ئەو - مان بۆ دەنێر - ێت.

د- خوا بۆ - مان -ی دەنێر - ێت.

٣- أ- تۆ کتێبەکەی ئەو دەفرۆش - یت.

ب- تۆ کتێبەکە -ی دەفرۆش - یت.

لە کۆمەڵی یەکەما (أ و ب) هاوواتان. لە (أ) بەرکاری ڕاستەوخۆ بەڕاناوێکی جودا دەربڕاوە (ئێوە).

لە (ب) بەرکارە ڕاستەوخۆکە بەڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارەی سێتی (A) دەربڕاوە (تان) و لکاوە بەپێشگری (دە)وە بەپێی یاسای ژمارە (١).

لە کۆمەڵی دووەما (أ، ب، ج، د) هەموو هاوواتان. لە (أ) بەرکاری ڕاستەوخۆ و بەرکاری ناڕاستەوخۆ هەردووک بەڕاناوی جودا دەربڕاون (ئەو، ئێمە).

لە (ب) بەرکاری ڕاستەوخۆ بەڕاناوێکی لکاوی سەر بە هەمان کەس و ژمارەی سێتی (A) دەربڕاوە (ی) و لکاوە بەبەرکاری ناڕاستەوخۆوە (ئێمە).

لە (ج) بەرکاری ناڕاستەوخۆ بەهەمان جۆر بەڕاناوێکی لکاوی سێتی (A) دەربڕاوە (مان) و لکاوە بەبەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکەوە (ئەو).

له (د) بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هەردووک بەراناوی لکاو دەربڕاون (ی، مان) و لکاون بەپریپۆزیشنەوە (بۆ).

له کۆمەڵی سێیەما (أ و ب) هاوواتان. له (أ) ناوی هەیی بەراناوێکی جودا دەربڕاوە (ئەو). له (ب) هەمان ناو بەراناوێکی لکاوی سێتی (A)ی خاوەن هەمان کەس و ژمارە دەربڕاوە (ی) و لکاوە بەبەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکەوە (کتێبەکە).

لەو ڕستانە هەموو ئامرازی ڕێکەوتن سەر بەسێتی (B)یە و بەرەگی فرمانەکانەوە نووساون بەپێی یاسای ژمارە (٢).

[لەوەی ڕابورد دەردەکەوێت کە ئەو ڕاناوە لکاوانەی دەوری ڕێکەوتن دەبینن لەگەڵ فرمانی تێپەڕی ڕابردوو -واتا سێتی (A)- دەتوانن جێی بەرکاری ڕاستەوخۆ و بەرکاری ناڕاستەوخۆ و ناوی هەیی ڕستە بگرن له کاتی داهاتوودا. ئەو شوێنەی له ڕستەدا دەیگرن دەسنیشان دەکرێت بەپێی یاسای ژمارە (١)].

گەر بەرکاری ڕاستەوخۆ و بەرکاری ناڕاستەوخۆ هەردووک بەراناوی لکاو دەربڕان لەگەڵ کاتی داهاتوودا، دەکەونە دوای پریپۆزیشنەوە و لەگەڵ کاتی ڕابردوودا دەکەونە دوای ڕەگی کارەوە. ڕیزبوونیان بەم جۆرە دەبێت.

پریپۆزیشن، ڕەگی کار - بەرکاری ناڕاستەوخۆ - بەرکاری ڕاستەوخۆ.

... یاسای ژ (٤)

بۆ ئەوەی بەرکاری ڕاستەوخۆ یا بەرکاری ناڕاستەوخۆ یا ناوی هەیی ڕستەیێ بەراناوێکی لکاو دەربڕێ:

١- سەیری کاتی فرمانەکە دەکرێت. گەر ڕابردوو بێت ڕاناوە لکاوەکە له سێتی (B)وە وەردەگیرێت. گەر کاتەکە داهاتوو بێت ئەوە له سێتی (A)وە وەردەگیرێت.

٢- ڕاناو یا (ناو)ە جوداکە له چ کەس و ژمارەیەکدا بێت ڕاناوە لکاوەکەش دەبێ هەمان کەس و ژمارەی هەبێ.

٣- جێگیراوەکە (واتا بەرکاری ڕاستەوخۆ... هتد) لا دەبرێت و بەپێی یاساکانی ژمارە (١ - ٤) شوێنی ڕاناوە لکاوەکە له ڕستەدا دەسنیشان دەکرێت.

بۆ نموونە گەر بمانەوێ بەرکاری ڕاستەوخۆی ئەم ڕستەیە:

من تۆ -م بۆ ئەوان دەنارد.

بەراناوێکی لکاو دەربڕین.

١- کاتی فرمانەکە ڕابردووە - واتا ڕاناوی لکاو لە سێتی (B) وەردەگیرێت.

٢- بەرکارەکە لە کەسی دووەمی تاکە (تۆ) -ڕاناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکی سێتی (B) (یت)ە.

٣- ڕاناوی لکاوی سێتی (B) بەپێی یاسای ژمارە (٢) هەمیشە بەرەگی فرمانەوە دەلکێت.

٤- بەلابردنی بەرکاری ڕاستەوخۆ (تۆ) بەرکاری ناڕاستەوخۆ ئەبێ بەیەکەم بۆ وەرگرتنی ڕاناوی سێتی(A) کە لەم حاڵەتەدا دەوری ڕێکەوتن دەبینێ بەپێی یاسای ژمارە (١).

لە ئەنجاما ڕستەکە وەک ئەوەی خوارەوەی لێ دێ.

من بۆ ئەوانم دەناردیت.

بەهەمان ڕێگا، گەر بمانەوێ بەرکارە ناڕاستەوخۆکەی ڕستەکە (ئەوان) جێگیرکەین بەراناوێکی لکاو.

١- کات ڕابردووە - ڕاناوی لکاو لە سێتی (B)وە وەردەگیرێت.

٢- کەسی سێیەمی کۆیە - ڕاناوەکە (ن)ە.

٣- ڕاناوە جوداکە (ئەوان) لائەبرێت.

٤- بەپێی یاسای ژمارە (٢) ڕاناوە لکاوەکەی سێتی (B) بەرەگی فرمانەکەوە دەلکێ و ئامرازی ڕێکەوتن (م) لە شوێنی خۆی ئەمێنێ بەپێی یاسای ژمارە (١).

لە ئەنجاما ڕستەکە وەک ئەوەی خوارەوەی لێ دێ:

من تۆم بۆ دەناردن.

گەر بمانەوێ لەم ڕستەیە بەرکاری ڕاستەوخۆ و بەرکاری ناڕاستەوخۆ هەردووک بەراناوی لکاو دەربڕین هەمان ڕێگە دەگرینە بەر و بەپێی یاسای ژمارە (٢) دوو ڕاناوە لکاوەکە بەم جۆرە بەرەگی فرمانەکەوە دەلکێن و ئامرازی ڕێکەوتن بەپرپیۆزیشنەوە دەلکێ بەپێی یاسای ژمارە (١) چونکە لێرە دەبێ بەیەکەم.

من بۆ - م نارد - ن - یت.

دەرکەوتنی ڕاناوی لکاو بۆ دەربڕینی بەرکار لە کرمانجیی خوارووداا لەم نەخشەیەی خوارەوە ڕوون کراوەتەوە.

| داهاتوو | ڕابردوو | |
|---|---|---|
| A | B | تێپەڕ |
| - | - | تێنەپەڕ |

نەخشەی ژمارە (٥)

لەبەر ئەم دیاردەیە لەم ڕستانەی خوارەوە دەوری بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ، بکەر و بەرکاری ناڕاستەخۆ، بکەر و ڕاناوی هەیی ئاڵوگۆڕ بوون تەنیا بەگۆڕینی کاتی فرمانەکان.

١- دە - تان - نێر - ین. (داهاتوو)

تان: بەرکاری ڕاستەوخۆیە.

ین - بکەرە

ب- دە - تان - نارد - ین(ڕابردوو)

تان - بکەرە

ین - بەرکاری ڕاستەوخۆیە

أ- بۆ - یان دەهێن - یت (داهاتوو)

یان: بەرکاری ناڕاستەوخۆیە

یت: بکەرە

ب- بۆ - یان هێنا - یت (ڕابردوو)

یان: بکەرە

یت: بەرکاری ناڕاستەوخۆیە

أ- ئوتومبیلەکە - تان دەفرۆش -م (داهاتوو)

تان- ڕاناوی هەیی

م- بکەرە

ب- ئوتومبیلەکە - تان فرۆشت - م (ڕابردوو)

تان- بکەرە

م- ناوی تەلکە

نەخشەی ژمارە ٤ و ٥ لە یەک نەخشەدا کۆ دەکرێنەوە.

| | رابردوو | | داهاتوو | |
|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| تێپەڕ | A | B | B | A |
| تێنەپەڕ | B | – | B | – |

نەخشەی ژمارە (٦)

## کرمانجیی ژووروو

وەک لە نەخشەی ژمارە (٢) ڕوون کراوەتەوە کرمانجیی ژووروو بەپێچەوانەی کرمانجیی خواروو دوو سێت ڕاناوی جودا و یەک سێت ڕاناوی لکاوی هەیە.

یەکێ لە تایبەتییەکانی شێوەی کرمانجیی ژووروو ئەوەیە کە لەگەڵ فرمانی تێپەڕدا لە کاتی ڕابردوودا فرمان لەگەڵ بەرکاری ڕاستەوخۆ ڕێک دەکەوێت لە کەس و ژمارەدا. واتا بەرکار لە چ کەس و ژمارەیەکدا بێت فرمانیش ڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارە وەردەگرێت ئەم دیاردەیە لە زانستی زمانا بەئێرگەتیڤ ناو دەبرێت Ergative Case[٥].

من هون دیت – ن.

وە ئەز دیت – م.

ئەوانەی باسی جیاوازیی نێوان کرمانجیی خواروو و ژووریان کردووە وایان لە قەڵەم داوە گوایا فرمانی تێپەڕی ڕابردوو ڕاناوی لکاو وەرناگرێت. لە ڕاستیدا فرمانی تێپەڕ لە ڕابردوودا ڕاناوی لکاو وەردەگرێ بەڵام وەرگرتنەکەی بەندە بەدەرکەوتن و دەرنەکەوتنی بەرکارەوە، چونکە لە تێپەڕی ڕابردوودا فرمان لەگەڵ بەرکارا ڕێک دەکەوێت لە کەس و ژمارەدا.

واتا بەرکار (نەک بکەر) لە چ کەس و ژمارەیەکدا بێت و فرمانیش ڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارە وەردەگرێت. کەی ڕستەکە بێ بەرکار بوو (یا بەرکارەکە لە کەسی سێیەمی تاک بوو)[٦] فرمان هیچ ڕاناوێکی لکاو وەرناگرێت. چونکە ڕاناوی لکاوی کەسی سێ یەمی تاک بە مۆرفیمی سیفر zero morpheme دەردەکەوێ.

من خار

وان خار

مه ئەو دیت.

بەلام

وە ئەز دیت -م.

من هون دیت -ن.

١- ڕاناوی جودا

سێتی (A) لەگەڵ ڕابردووی تێپەڕ دەردەکەوێت وەک بکەر و لە کاتی داهاتوودا وەک بەرکار. فرمان هەرگیز لەگەڵیا ڕێک ناکەوێت. کە وەک بکەر دەردەکەوێت (واتا لە کاتی ڕابردوو) فرمانەکە لەگەڵ بەرکار ڕێک دەکەوێت.

من هون دیت -ن.

کە وەک بەرکار دەردەکەوێت (واتا کاتی داهاتوو) فرمان لەگەڵ بکەرا ڕێک دەکەوێت.

ئەز وە دبین -م.

سێتی (B) وەک بکەری فرمانی تێنەپەڕ لە ڕابردوو و بکەری تێنەپەڕو تێپەڕی کاتی داهاتوو دەردەکەوێت.

ئەز نڤست -م. تێنەپەڕی ڕابردوو

ئەز دنڤ -م. تێنەپەڕی داهاتوو

ئەم دخۆ -ین. تێپەڕی داهاتوو

سێتی (B) وەک بەرکاری تێپەڕی ڕابردووش دەردەکەوێت.

تە ئەوان دیت -ن.

بەپێچەوانەی سێتی (A)، سێتی (B) هەمیشە لەگەڵ فرمانا ڕێک دەکەوێت لە کەس و ژمارەدا، چ وەک بکەر چ وەک بەرکار دەرکەوێت.

دەرکەوتنی سێتە جیاوازەکانی ڕاناوی جودا لە کرمانجیی ژووروودا وەک بکەر و بەرکار لەگەڵ فرمانی تێپەڕ و تێنەپەڕ لە ڕابردوو و داهاتوودا بەپێی ئەو شیکردنەوەی لەسەرەوە پێشکەش کرا لەم نەخشەیەی خوارەوە ڕوون کراودتەوە.

| | ڕابردوو | | داهاتوو | |
|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| تێپەڕ | A | B | B | A |
| تێنەپەڕ | B | – | B | – |

نەخشەی ژمارە (٧)

نەخشەی ژمارە (٧) - کە دەوری ڕاناوە جوداکانی کرمانجیی ژووروو ڕوون ئەکاتەوە - یەکە لەگەڵ نەخشەی ژمارە (٦)- کە دەوری ڕاناوە لکاوەکانی کرمانجیی خواروو ڕوون ئەکاتەوە.

لەژێر تیشکی ئەم شیکردنەوەیەدا دەردەکەوێت کە ئەو دەورانەی سێتە جیاوازەکانی ڕاناوی لکاو لە کرمانجیی خوارووەدا دەیبینن، سێتە جیاوازەکانی ڕاناوی جودا لە کرمانجیی ژووروودا دەیبینن.

کرمانجیی ژووروو تەنیا یەک سێت ڕاناوی لکاوی هەیە، دەوریشی تەنیا بەجێهێنانی ڕێکەوتنە لە نێوان بکەر یا بەرکار و فرمانی ڕستەدا.

بەم جۆرە تەنیا یەک جیاوازی (لە سیما) و لەیەکچوون (لە بنج)دا لە نێوان هەردوو کرمانجیدا دەستنیشان کرا.

پەراوێزەکان:

١- یا بە ئەو وشانەی کە بە Quantifier ناو ئەبرێن وەک (زۆر - هەندێک - کەم ... هتد) گەر لە پێش بەرکاری ڕاستەوخۆوە دەرکەوت وەک لە:

ئێمە زۆر - مان دیاری بۆ ئازاد نارد.

٢- لێرە بۆ ئاسانی ئەم کورتکراوانە بەکارهێنراون:

بەرکاری ڕاستەوخۆ direct object (DO)

بەرکاری ناڕاستەوخۆ indirect object (IO)

پریپۆزیشن preposition (Prep)

پێشگر prefix (Pref)

[لێرە مەبەست یەکەم پێشگرە کە لەگەڵ ڕەگی فرمانا دەردەکەوێ]

ڕەگی فرمان VS verb stem

٣- بۆ کەسی سێیەمی تاک سێتی (B) هیچ سیمایەکی دیاری نییە لەگەڵ کاتی ڕابردوو. لەگەڵ کاتی

داهاتوودا (ات - یّت) دەردەکەویّت. گەر ڕەگی فرمانەکە کۆتایی بە(ۆ) یا (ە)وە هاتبیّ ڕاناوی لکاو قالبی (ات) وەردەگریّت. لە هەموو باریّکی تردا (یّت)ە.

٤- لە ڕابردوودا گەر بەرکاری ڕاستەوخۆ بەڕاناویّکی لکاو دەربڕابیّ و فرمان تاکە پەناگەیەک بیّ بۆی، هەردوو ڕاناوە لکاوەکان واتا - ڕاناوی ڕیّکەوتن و ڕاناوی بەرکاری بەڕەگی فرمانەکەوە دەلکیّن و ڕیزبوونیان بەم جۆرە دەبیّ.

ڕەگی فرمان - ئامرازی ڕیّکەوتن - بەرکاری ڕاستەوخۆ. (نارد - یان - یّت)

تەنیا کە بکەر لە سیّیەمی تاکا بیّ ڕیزبوونیان بەم جۆرە دەبیّ.

ڕەگی فرمان - بەرکاری ڕاستەوخۆ - ئامرازی ڕیّکەوتن.

وەک لە:

نارد - ین -ی. ئەو ئیّمە -ی نارد.

بینی - م -ی. ئەو من -ی بینی.

٥- بۆ زانیاری دەربارەی ئەم دیاردەیە سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

1- Comrie, B. (1973) "The Ergative - Variations on a theme". Lingua 32. PP. 239 - 253.

2- Mathews, W. K. (1953) "The Ergative constructon in modern Indo - Aryan". Lingua 3. PP. 391 - 406.

3- Pireiko, L. A. (1968) "Osnovnye voprosy ergativnosti na materiale indoiranskix jazikov". Moscow. Nauka.

٦- چونکە ڕاناوی لکاو بۆ ڕابردوو لە کەسی سیّیەمی تاک هیچ نیشانەیەکی دیاری نییە.

سەرچاوەکان:

1- Amin, W. O. (1976) "Some fundamental rules of Kurdish Syntax Structure" Lon don.

2- Amin, W. O. (1979) "Aspects of the verbal Construction in Kurdish" M. Phil The sis - University of London.

3- Robins, R. H. (1971) "General Linguistics" London.

4- Comrie, B. (1973) "The Ergative - Variatons on a theme". Lingua 32. PP. 230 - 253.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیّراق - دەستەی کورد - بەغدا، ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٨٣، لاپەڕە ٢٥٤-٢٧٦ بڵاوکراوەتەوە.

## پاشبەندەکان

لە ڕێزمانی کوردییا کێشەیێکی زۆر لەسەر دەستنیشانکردنی پێشبەندەکان Preposition و ژمارە و ئەرکیان هەیە. ئەم باسە تخون ئەم کێشەیە ناکەوێ، تەنیا ئەو پێشبەندانە دەگرێتەخۆ کە پاشبەندی Postposition بەرامبەریشیان هەیە[١].

بەشێوەیێکی گشتی هەموو ئەوانەی باسی پێشبەندیان کردووە لەسەر ئەم شەشە پێک هاتوون (بۆ، بە، لە، تا، وەک، بێ). لەمانە ئەم سێیە (بۆ، بە، لە) بەچەند قاڵبێکی تر و وەک پاشبەندیش دەردەکەون. ئەم وتارە هەوڵدانە بۆ دەستنیشانکردنی یاساکانی دەرکەوتنی ئەم پاشبەند و قاڵبە جیاوازانە کە ڕێزمانی کوردی هێشتا چارەسەری نەکردوون.

هەموو ئەو پێشبەندانەی کە لەگەڵ ئەو جۆرە فرمانانە دەردەکەون کە چەمکی گوێزانەوە دەگەیەنن Dative Case (وەک چوون بۆ... دان بە... هتد) دەشێ پێشبەندەکە بەپاشبەندی فرمانی (ـە) جێگیر بکرێ.

ئێوە هاتن بۆ سلێمانی

ئێوە هاتن -ە سلێمانی

تۆ دات بە ئەو

تۆ دات-ە ئەو

تۆمان نارد بۆ هەولێر

تۆمان نارد -ە هەولێر

گەر کاتی فرمانەکە لە ئێستەی تەواودا بێ Present Perfect[٢] پاشبەندە فرمانییەکە قاڵبی (تە) دەگرێتەخۆ.

هێناومانە بۆ ئێرە

هێناومانە -تە ئێرە

ناردوومە بۆ بەغا

ناردوومە -تە بەغا

گەر ڕەگی فرمانەکە بەکپ Consonant کۆتایی هاتبێ... بەنەمانی ڕاناوی لکاو لەگەڵ

ڕەگی فرمانەکە (وو) دەبێتە (ۆ) و (ـە) دەتوێتەوە.

ئێمە ناردوومانە بۆ بەغا

ئێمە ناردوومانە -تە بەغا

ئێمە ئازادمان ناردۆتە بەغا

هەمان شت گەر فرمانەکە تێنەپەڕ بێ و بکەری ڕستەکە لە کەسی سێیەمی تاکدا بێ - وەک باس کرا (وو) دەبێتە (ۆ) و فرمانی بێ هێز (ـە) دەتوێتەوە.

ئەو ڕۆیشتووە بۆ بازاڕ

ئەو ڕۆیشتۆتە بازاڕ[٣].

لە ڕووی پێوەندیی نێوان پێشبەند و بوونیان بەپاشبەند، ئەم فرمانانە دەبنە سێ کۆمەڵ:

١- ئەوانەن کە پێشبەندەکەیان (بۆ)یە و بەشێوەییەکی گشتی ناوەڵکاریان لە دوا دێ وەک:

هاوێشتم بۆ ئاسمان - هاوێشتمە ئاسمان

ڕۆیشت بۆ سلێمانی - ڕۆیشتە سلێمانی

دەچین بۆ سەیران - دەچینە سەیران

دەیبەم بۆ بازاڕ - دەیبەمە بازاڕ

هێنای بۆ هەولێر - هێنایە هەولێر

فڕین بۆ ئاسمان - فڕینە ئاسمان

پەڕی بۆ چاوی - پەڕییە چاوی

خزی بۆ خوارەوە - خزییە خوارەوە

... هتد

٢- ئەوانەن کە پێشبەندەکەیان (بە)یە:

بەخشیم بەئەو ــ بەخشیمە ئەو

بووم بەمامۆستا ــ بوومە مامۆستا

کردم بەپیاو ــ کردمە پیاو

٣- ئەوانەن کە تەنیا بەهۆی پاشبەندەوە ئەم حاڵەتە دەردەبڕن و پێشبەندی بەرامبەریان نییە. بەشێوەیەکی گشتیش یەکێ لەم ناوەڵکارانە لە دوای فرمانەکە دەردەکەوێ:

(ناو، نزیک، لای، سەر، ژێر، تەنیشت، ژوور، پێش، دوای... هتد).

خستمە ناو دۆلابەکەوە
ڕشتمە سەر ئەرز
کەوتمە نزیک تۆ
... هتد

دەرکەوتنی پاشبەندی بەرامبەر (بۆ) و(بە) لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

| پێشبەند | پاشبەندی فرمانی بەرامبەر | |
|---|---|---|
| | گەر کاتی فەرمانەکە ئیستەی تەواوبێ | لە هەموو کاتێکی ڕێزمانی تردا |
| بۆ | تە | ــە |
| بە | تە | ــە |

لەگەڵ فرمانی (دان - گەیشتن...)دا[٤] ئەگەر ئەو ناوە یا ڕاناوەی لە دوای پێشبەندی (بە) دەردەکەوێ بەڕاناوێکی لکاو دەربڕا[٥] پێشبەندی (بە) دەبێتە پاشبەندێکی فرمانی و قاڵبی (ێ) دەگرێتەخۆ.

دوو بزوێنی (ـە) و (ێ) هاتنە پاڵ یەک (ی) لە نێوانیانا دەرکەوت و بوو بە(بدەیێ).
لە هەندێ شێوەدا لە جیاتی ئەم (ی)یە (ر) دەردەکەوێ و دەبێتە:
کتێبەکەم بدەرێ[٦].
گەر بەرکاری ڕاستەوخۆ (کتێبەکە) لابرا ڕاناوی لکاو دەچێتە سەر پێشگری (ب) و دەبێتە (بمدەرێ).
فرمانەکە داخوازیی تاکە... گەر بکرێتە کۆ ئامرازی کۆی داخوازی (ن) لە نێوان دوو بزوێنەکەدا دەردەکەوێ. ئەوسا پێویست بەم (ی) یا (ر)یە ناکات.

یاسای کردنی پێشبەندی (بە) بەپاشبەندی (یٚ) لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

| پێشبەند | پاشبەندی بەرامبەر لەگەڵ فەرمانی دان - گەیشتن...! |
| --- | --- |
| بە | یٚ |

ژ (٢)

گەر ئەو ناوە یا ڕاناوەی کە لە دوای پێشبەندی (بە) و (لە) دەردەکەوێ بەڕاناوێکی لکاو دەربڕا، (بە) دەبێتە (پێ) و (لە) دەبێتە (لێ):

قسەکەی پێ ووتین

شتەکەتان لێ وەردەگرین

ئەم یاسایە لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە

| پێشبەند | گەر ناو یا ڕاناوی دوای بەڕاناوێکی لکاو دەربڕرا |
|---|---|
| بە | پێ |
| بە | لێ |

همموو پاساکان لەم وێنەیەدا کۆ کراونەتەوە:

| ئامراز | پێشبەند Preposition | | پاشبەند Postposition (Verbal) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | گەر ناوەکەی دوای بە ڕاناوێکی لکاو دەربڕا | | کاتی فەرمان لە ئێستەی تەواودایێ | | هەموو کاتێکی ڕێزمانی ئێستەی تەواو نەبێ | | لەگەڵ فەرمانی (دان-کەیشان) گەر ناوەکە بەڕاناوێکی لکاو دەربڕا | |
| بە | پێ | بەتۆ دەڵێم<br>↓<br>پێت دەڵێم | تە | دلومە بەئازاد<br>↓<br>داومەتە ئازاد | ـە | دەیدەم بەتۆ<br>↓<br>دەیدەمە تۆ | ێ | دام بەتۆ<br>↓<br>دامیتێ |
| لە | لێ | لە تۆ دەترسم<br>↓<br>لێت دەترسم | – | – | – | – | – | – |
| بۆ | – | – | تە | ناردوومە بۆ بەغا<br>↓<br>ناردوومەتە بەغا | ـە | دەچم بۆ بازاڕ<br>↓<br>دەچمە بازاڕ | – | – |

پەراوێزەکان:

١- مەبەست لە پاشبەند Posposition ئەو پاشگرەیە کە لە ڕووی ڕێزمانییەوە هەمان دەوری پێشبەند (پریپۆزیشن) دەبینێ.

٢- ئێستای تەولو Present Perfect ئەو کارەیە کە لە ڕابردوودا ڕووی دا و بڕایەوە بەڵام تەئسیری مایە ئێستا... پاسای دارشتنی ئەم کاتە لە زمانی کوردییا بەم جۆرەیە.

(ڕەگی ڕابردوو + وو + ڕاناوی لکاو + ـە).

لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕا تەنیا لە کەسی سێیەمی تاکدا (ـە) دەردەکەوێ.. لەگەڵ فرمانی تێپەڕا لە کەسی سێیەمی تاکدا مۆرفیمی بۆش empty morphem (تی) دەردەکەوێ.

| تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|
| خواردوومە | نوستووم |
| خواردووتە | نوستوویت |
| خواردوویە(تی) | نوستووە |
| خواردوومانە | نوستووین |
| خواردووتانە | نوستوون |
| خواردوویانە | نوستوون |

بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی چەمکی کات و کاتەکانی زمانی کوردی سەیری ئەم وتارەم بکەن.
«چەند یاسایێکی مۆرفۆلۆجیی دارشتنی فرمانە، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ ۱۰۹ ئازاری ۱۹۸٦ ل(۲۵۸-۲٦٤).

۳- ئەو فـرمـانە لێکدراوانەی بەپاشگری (ەوە)ی وەک (خـواردنەوە - بردنەوە... هتـد) دادەرژێن، پاشگری (ەوە)، لەگەڵ کاتی ئێستەی تەواودا، قالبی (تەوە) دەگرێتە خۆ و بەر هەمان ئەو یاسا فۆنۆلۆجییانە دەکەوێ کە باس کران.

| | |
|---|---|
| رابردووی سادە | ئێمە بردمانەوە. |
| ئێستای تەواو | ئێمە بردوومانەتەوە. |
| کە راناوی لکاو لەگەڵ فرمانا نامێنێ | ئێمە مەرجەکەمان بردۆتەوە. |

٤- لەوانەیە فرمانی تری لەم جۆرە هەبێ.

٥- بۆ یاساکانی جێگیرکردنی بەرکاری راستەوخۆ و ناراستەوخۆ بەراناوێکی لکاو سەیری سەرچاوەی ژمارە (۲) بکەن.

٦- وەک یاسایێکی فۆنۆلۆجیی گشتیی دەرکەوتنی ئەم (ر)یە:
لە فرمانی دلخوازیی تاکا... گەر رەگی داهاتووی فرمانەکە بەبزوێن کۆتایی هاتبێ و دوای ئەم بزوێنە بزوێنێکی تر دەرکەوت... ئەم (ر)یە پەیا دەبێ.

خستن ← خە [ شەکە بخەرە گیرفانتەوە ]
خواردنەوە ← خۆ-ەوە [ ئاوەکە بخۆرەوە ]
... هتد.

سەرچاوەکان:

۱- وریا عومەر ئەمین (۱۹۸٤) یاسایێکی فۆنۆلۆجی، گۆڤاری رۆژی کوردستان ژ (٦٦).
۲- وریا عومەر ئەمین (۱۹۸۳) رێزمانی راناوی لکاو، گۆڤاری کاروان، ژمارە (۸) (ل٦٨-٧٤).
۳- رێزمانی ئاخاوتنی کوردی (۱۹۷٦) کۆڕی زانیاریی کورد. بەغدا.
4- Lyons, J. (1971) "Introduction to theoretical Linguistics" Cambridge.
5- Greenberg, J. H. (ed) (1963) "Universals in language". Cambridge, Mass.: MIT Press.
6- Matthews (1974) "Morphology" Cambridge University Press, Cambridge.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد - بەغدا، ژمارە (۱۵)ی ساڵی ۱۹۸٦، لاپەرە ۱۸۲-۱۹۳ بلاوکراوەتەوە.

# فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی

زۆربەی ئەوانەی باسی دەنگەکانی زمانی کوردییان کردووە فۆنەتیک و فۆنۆلۆجییان لێک جیا نەکردۆتەوە. بابەتەکانی فۆنۆلۆجی بەفۆنەتیکی ناودەبەن و ناوی فۆنۆلۆجی ناهێنن[1].

فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی دوو بواری زۆر جیاوازن. هەریەکە باسی لایەنێکی زمان دەکات و هەر یەکە ئامانج و پەیڕەوی تایبەتیی خۆی لە شیکردنەوەدا هەیە. هەر باسێکی زمانەوانی لە دەنگەکانی زمان بکۆڵێتەوە و ئەم دوو لایەنە جیا نەکاتەوە تێکەڵوپێکەڵ دەردەچێ و بەر پەیڕەوی زانستی ناکەوێ.

ئەم باسە هەوڵدانە بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێ جیاوازی لە نێوان ئەم دوو لقەی زانستی زمان.[2]

کە یەکێ قسە دەکات زانیاری (کە لە مێشکییا پارێزراوە) دەخاتە ناو قاڵبی ڕیزە دەنگێکەوە، کە بەئەندامانی ئاخاوتن دروستیان دەکات. دەنگەکان بەهۆی شەپۆڵەکان لە هەوادا دەگوێزرێنەوە. گوێ وەریان دەگرێ و هەواڵەی مێشکیان دەکات. مێشک شییان دەکاتەوە دەیانپارێزێ - واتا: قسە بەلای کەمی سێ قۆناغی هەیە.

فۆنەتیک ئەو لقە زانستی زمانەیە کە لە دروستکردن و گواستنەوە و وەرگرتنی دەنگەکانی زمان دەکۆڵێتەوە وەک دیاردەیێکی گشتی. واتا دەنگەکانی زمان دەشێ بەلای کەمی لە سێ سووچەوە سەیریان بکرێ و لێیان بکۆڵرێتەوە:

١- لە ڕووی دروستکردنەوە Articulatory phonetics ئەمە میکانیزمییەتی ئەندامانی ئاخاوتن دەگرێتەوە.

٢- لە ڕووی چۆنیەتیی گواستنەوەی دەنگەکان لە هەوادا بەهۆی ئەو شەپۆلانەی بەهێزی ڕەوتی بای لە سییەکانەوە هاتوو و جوولانەوەی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەبن

Acoustic phonetics.

٣- لە ڕووی وەرگرتنی ئەم دەنگانەوە بەگوێ و شیکردنەوە و پاراستنیان لە مێشکا Au-ditory phonetics ئەمەیان میکانیزمییەت و فسیۆلۆجییەتی گوێ و مێشک دەگرێتەوە.

لەبەر چەند هۆیێک کە پەیوەندییان بەسروشتی ئامانجەکانی زانستی زمانەوە هەیە... زانستی زمان لە بواری وەسفیدا بەشێوەیێکی گشتی بایەخ هەر بەلقی یەکەم دەدا. دوو لقەکەی تر بواری تریان لێ بۆتەوە. پەیوەندییان زیاتر بەلقەکانی تری زانستەوەی وەک فیزیا و کۆمپیوتەر... هتد هەیە، یا وەک بابەتی سەربەخۆ لەناو چوارچێوەی زانستی زمانی گشتیدا باس دەکرێن. لەم باسەدا بەکورتی لە چەمکی فۆنەتیک لە ڕوانگەی دروستکردنەوە دەدوێین. ئینجا لەگەڵ فۆنۆلۆجییا بەراوردیان دەکەین و جیاوازیی نێوانیان ڕوون دەکەینەوە.

فۆنەتیک ئەو لقەی زانستی زمانە کە لە کەرەسە هەرە خاوەکانی زمان دەکۆڵێتەوە و شییان دەکاتەوە. کەرەسە خاوەکانی زمان ئەو تاکە دەنگانەن کە بەهێزی ڕەوتی بای لە سییەکانەوە هاتوو و[٣] لە ئەنجامی کۆمەڵە جوولانەوەیێک کە لە پەردەی ناوپنچکەوە دەست پێ دەکات و سۆرێنچک و قورگ و بەشەکانی زار و لووت بەشداری دەکەن، دروست دەکرێن.

**ئەندامانی ئاخاوتن:**

١- لێوەکان

٢- ددانەکان

٣- پووک

٤- ڕەقە مەلاشوو

٥- نەرمە مەلاشوو

٦- زمانۆکە
٧- پێشەوەی زمان
٨- ناوەڕاستی زمان
٩- دواوەی زمان
١٠- گەروو
١١- لەهات
١٢- ژێیەکانی دەنگ
١٣- سەری زمان
١٤- بۆشایی لووت

فۆنەتیک ڕوونی دەکاتەوە چۆن هەر تاکە دەنگەی زمان دروست دەکرێت... لە چ بەشێکی زاردا... هەڵوێستی ئەندامانی ئاخاوتن لە کاتی دروستکردنیان چۆنە، تایبەتییەتی و سیماکانی هەر دەنگە چییە و چۆن لە دەنگەکانی تر جیا دەکرێتەوە... هتد.

بۆ نموونە فۆنەتیک بەم جۆرە ڕوونی دەکاتەوە چۆن دەنگی (ک) دروست دەکرێت:[ناوەڕاستی زمان بەرز دەبێتەوە و خۆی لە نەرمە مەلاشوو دەدات... ڕێی بای لە سییەکانەوە هاتوو دەگرێ و تەوژمێ دروست دەبێ. لە پڕ زمان نزم دەبێتەوە. دەنگی (ک) دروست دەبێ].

گەر لە کاتی دروستکردنی ئەم دەنگە (ژێ[٤])کان لەرینەوە دەنگەکە دەبێتە (گ). واتا (ک) و (گ) لە هەمان شوێنا لە زاردا دروست دەکرێن، ئەوەی ئەم دوو دەنگە هاوشوێنە homorganic لێک جیا دەکاتەوە هەڵوێستی (ژێ)کانە. لە کاتی دروستکردنی (ک)دا نالەرنەوە و لە (گ) دەلەرنەوە.

بۆ دروستکردنی دەنگی (س). بەشی پێشەوەی زمان نزیک بەشی پێشەوەی مەلاشوو دەبێتەوە و کەلێنێ پێک دەهێنێ. بای لە سییەکانەوە هاتوو بەم کەلێنەدا تێدەپەڕێ دەنگی (س) دێتە بەرهەم.

گەر لە کاتی دروستکردنی ئەم دەنگە ژێکان لەرینەوە دەنگەکە دەبێتە (ز).

گەر دواوەی زمان بەرەو نەرمە مەلاشوو بەرز کرایەوە دەنگەکە دەبێتە (ص).

[س]، [ز] و [ص] هاوشوێنن. ئەوەی لێکیان جیادەکاتەوە هەڵوێستی ژێکان و زمانە.

بۆ دروستکردنی دەنگی [پ] لێوی خوارەوە و سەرەوە دێنە یەک و ڕێی بای لە سییەکانەوە هاتوو دەگرن. تەوژمی پەیا دەبێ لێوی خوارەوە لە پڕ تزم دەبێتەوە وەک تەقینەوەیێک دەنگی [پ] دێتە بەرهەم.

گەر لە کاتی وتنی ئەم دەنگە ژێکان لەرینەوە دەنگەکە دەبێتە [ب]. گەر بای لە سییەکانەوە هاتوو لە لوتەوە دەرهێنرا دەبێتە [م].

لەوەی ڕابورد دەردەکەوێ کە هەر چەند دەنگێک لە هەمان شوێن لە زاردا دروست دەکرێن. ئەم دەنگانە (هاوشوێن)ن. بۆ نموونە:

[ب، پ، م] هاوشوێنن هەموو بەلێکدانی لێوی سەرەوە و خوارەوە دروست دەبن. پێیان دەوترێ (لێوی) bilabial.

لە [ت، د، ن] سەری زمان خۆی لە ددانەکانی سەرەوە دەدات. پێیان دەوترێ (ددانی) dental..

لە [ف، ڤ]دا لێوی خوارەوە خۆی لە ددانەکانی سەرەوە دەدات پێیان دەوترێ لێودانی labio - dental.

لە [ک، گ]دا ناوەڕاستی زمان خۆی لە مەڵاشوو دەدات، پێیان دەوترێ (مەڵاشوویی) palatal. ئیدی بەم جۆرە.

ئەوەی دەنگە هاوشوێنەکان لێک جیادەکاتەوە هەڵوێستە manner of articulation.

ئەو هەڵوێستانەی ناومان هێنان ئەمانە بوون.

١- هەڵوێستی ژێکانی دەنگ لە کاتی دروستکردنی دەنگەکان. (لەرینەوە - نەلەرینەوە).

ئەو دەنگانەی کە لە کاتی دروستکردنیان ژێکان لەرینەوە بە(ژێدار) voiced ناودەبرێن وەک [ب، ز، گ، ڤ، د].

ئەو دەنگانەی کە لە کاتی دروستکردنیان ژێکان ئەلەرینەوە وەک [پ، س، ک، ف، ت]. بە(بێ ژێ) voicless.

٢- هەڵوێستی [زار] بەرامبەر [لووت]. ئەو دەنگانە لە کاتی دروستکردنیان گەر بای لە سییەکانەوە هاتوو لە زارەوە دەرچێ بە(زاری) oral ناودەبرێن. وەک [ت، ڤ، ش، خ...] گەر بایەکە لە لووتەوە دەرچێ بە(لووتی) nasal ناودەبرێن وەک [م، ن].

٣- هەڵوێستی دواوەی زمان [بەرزی] بەرامبەر [نزمی]. ئەو دەنگانەی کە لە کاتی دروستکردنیان دواوەی زمان بەرەو نەرمە مەلاشوو بەرز دەبێتەوە بەقەڵەو (مەلاشوێنراو) palatized ناودەبرێن وەک [ڵ، ط، ص].

واتا هەر دانە دەنگەی زمان بەدوو لایەن دەستنیشان دەکرێت.

١- شوێنی دروستکردن Place of articulation

٢- هەڵوێستی دروستکردن Manner of articulation ئەم لایەنانە سیماکانی فۆنێتیکی phonetic features دەنگەکانن.

واتا: هەر دەنگەی چەند سیمایەکی هەیە. وەک:

سیماکانی [ب] ئەمانەن:

١- لێوی bilabial

٢- ژێدار voiced

٣- زاری oral

سیماکانی [پ] ئەمانەن:

١- لێوی bilabial

٢- بێ ژێ voicless

٣- زاری oral

سیماکانی [م] ئەمانەن:

١- لێوی bilabial

٢- ژێدار voiced

٣- لووتی nasal

جیاوازیی نێوان ئەم سێ دەنگە هاوشوێنە لەم نەخشەیەدا روون کراوەتەوە.

| | | لێوی |
|---|---|---|
| | زاری | لووتی |
| ژێدار | ب | م |
| بێ ژێ | پ | – |

سیماکانی [ف] ئەمانەن:

١- لێوددانی labio - dental ٢- بێ ژێ voicless

سیماکانی [ڤ] ئەمانەن:

١- لێو ددانی labio - dental ٢- ژێدار - voiced

| | لێوددانی |
|---|---|
| ژێدار | ڤ |
| بێ ژێ | ف |

دەنگەکانی هەر زمانێ دەشێ بەم پەیڕەوە پۆلێن بکرێ و هەموو لە یەک نەخشەدا کۆ بکرێنەوە. بۆ نموونە دەنگەکانی زمانی کوردی بەم جۆرە پۆلێن کراوە[٥]:

| | لێوی | لێوددانی | ددانی | پووکی | پووکە-مەلاشوویی | نەرمە-مەلاشوویی | زمانۆکەیی | گەروویی | ژێیی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تەقیو | پ ب | | ت د | | | ک گ | | | |
| خشەدار | | ف ڤ | | س ز | ش ژ | | خ غ | ح ع | ه |
| شەکاوە | | | | چ ج | | | | | |
| کەپوویی (لووت) | م | | ن | | | | | | |
| لازمانی | | | | ل ڵ | | | | | |
| هەژۆک | | | | ر ڕ | | | | | |
| شێوە بزوێن | و (w) | | | | ی (y) | | | | |

دەنگەکـانی زمـان لە ڕوویەکی ترەوە دەبنە کپ Consonant و بزوێن Vowel. لە ڕووی چۆنیەتی دروستکردنیان فۆنەتیک بەم جۆرە جیایان دەکاتەوە.

گەر لە کاتی دروستکردنی دەنگ دوو بەشی زار پێک کەوتن یا بەڕادەیێ لێک نزیک بوونەوە خشە دروست بکات ئەوە (کپ)ە. گەر پێک نەکەوتن ئەوە (بزوێن)ە.

[ت] دەنگێکی کپـە، چونکە لە دروسـتکردنیا پێشـەوەی زمـان خۆی لە ددانەکـانی سەرەوە دەدات. (گ) کپە، چونکە ناوەڕاستی زمان خۆی لە نەرمە مەلاشوو دەدات. بەڵام (ا، ـە، ۆ، وو، و، ی، ێ...) هەموو بزوێن، چونکە لە کاتی دروستکردنیان هیچ بەشێکی زار بەهیچ بەشێکی تر ناکەوێ و بای لە سییەکانەوە هاتوو بێ تەگەرە بەزارا تێدەپەڕێ.

دەنگە بزوێنەکـانیش بەهۆی چەند سـیـمـایێک لێک جیـادەکرێنەوە و پۆلێن دەکـرێن. سیماکانی بزوێنەکان ئەمانەن:

١- هەڵوێستی زمان چۆنە. واتا چ بەشێکی بەرز دەبێتەوە و چ بەشێکی نزم دەبێتەوە. بۆ ئەمە زمان کراوەتە سێ بەش.

١- پێشـەوەی زمان

٢- ناوەڕاستی زمان

٣- دواوەی زمان

٢- هەڵوێستی لێوەکان (خڕێ) rounded یا بەش بوونەتەوە spread.

٣- درێژی و کورتیی دەنگەکە...

بۆ نموونە لە دروســتکردنی دەنگی [و]دا دواوەی زمــان بەرەو نەرمــە مــەلاشــوو بەرز دەبێتەوە. لێوەکان شێوەی (خڕ) دەگرنە خۆ وەک لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

[و] [وو]

[ی] [î]

ئەگەر دەنگەکە درێژکرایەوە دەبێتە [وو].

بۆ دروستکردنی دەنگی [ی] ئاوەڕاستی زمان بەرەو نەرمەمەلاشوو بەرزدەبێتەوە. لێوەکان لە باری ئاساییدا دەمێنێنەوە...

گەر دەنگەکە کورت کرایەوە دەبێتە [i].

فۆنەتیک هەر لەو دەنگانە ناکۆڵێتەوە کە لە نووسینا بەپیت دەردەبڕێن. کەرەسەی (دەنگی)ی تر هەن کە زۆر گرنگن لە زمانا، بەلام لە نووسینی ئاساییدا هیچ نیشانەیێکیان بۆ نییە. وەک:

١- هێز stress وزەییێکی زیاترە (بەگوێرەی بەشەکانی تر) دەخرێتە سەر یەکێ لە بڕگەکانی وشە یا دەستەواژە. بۆ نموونە لە وشەی [ئازاد]دا هێز کەوتۆتە سەر دوابڕگە. لە وشەی [چونکە] هێز کەوتۆتە سەر بڕگەی یەکەم. لە وشەی [نوستن]دا هێز دەکەوێتە سەر بڕگەی یەکەم گەر مەبەست (ئەوان نوستن) بوو، دەکەوێتە سەر بڕگەی دووەم گەر مەبەست بابڵێین (نوستن خۆشە) بوو.

٢- ئاوازە intonation. گۆڕینی ئاوازی ڕستەیە بۆ گەیاندنی مەبەستی جیاواز. هەر ڕستەیێک دەیان مانا دەگەیەنێ بەپێی ئاوازەکەی. وەک لەم ڕستەیەدا:

ئازاد دوێنێ دوو کتێبی چاکی بۆ هێنام.

ڕستەکە بکەرە وەلامی ئەم پرسیارانە، [کێ، کەی، چەند، چی، چۆن] دەردەکەوێ بۆ هەریەکە ئاوازێکی هەیە جیاواز لەوانی تر.

٣- تۆن ton ئاوازی بڕگە یا وشەیە. لە هەندێ زمانا بەگۆڕینی ئاوازی بڕگە یا وشە مانای وشەکە دەگۆڕێ، وەک زمانی بورمی و تایلاندی.

فۆنەتیک لەو کەرەسانە هەموو دەکۆڵێتەوە وەک کەرسەی زمان بەگشتی.

### فۆنۆلۆجی

هەر زمانێک دەستەیێک یاسای تایبەتی بەخۆیەوەی هەیە:

١- فۆنیمەکانی (لە دەنگەکانییەوە) دەستنیشان دەکات.

٢- لەناو قالبی بڕگەی فۆنەتیکیدا ئەم فۆنیمانە لێک دەدات بڕگەی فۆنۆلۆجی پێک دەهێنێ.

٣- لە ئەنجامی لێکدانی فۆنیمەکان. دەنگ هەیە دەگۆڕێ. هەیە دەتوێتەوە. هی تازە پەیا دەبێ... هتد.

ئەو یاسایانەی ئەو ئەرکانە جێبەجێ دەکەن بەیاساکانی فۆنۆلۆجی ناودەبرێن.

واتا: فـۆنۆلۆجی شـتێکی تایبـەتییـە بەپێـچـەوانەی فـۆنەتیک کـە گـشتـییـە. بۆ جیاکردنەوەی جیاوازیی نێوان فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی ئەم بەراوردییە دەخەینە ڕوو:

زمـانی کـوردی و عـەرەبی[61] لەم شـەش دەنگە بەشـدارن. [ر، ڕ، س، ص، ل، ڵ] وەک لەم نووسینانەدا دەردەکەوێ.

| دەنگ | کوردی | عەرەبی |
|---|---|---|
| ر | پەری | برد (سەرما) |
| ڕ | کڕین | حر (گەرما) |
| س | سەوز | سماء (ئاسمان) |
| ص | صاڵ | صباح (بەیانی) |
| ل | لانک | لیل (شەو) |
| ڵ | گوڵ | الله (خوا) |

ئەوەی سـەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە لە نووسـینی زمـانی کوردیدا (ر) و (ڕ) جیاکراونەتەوە، کـەچی لە هی عـەرەبییـا جیـانەکـراونەتەوە و بەدووان یەک نیـشـانەیان هەیە. هۆی ئەمـە ئەوەیە لە زمانی کوردیدا (ر) و (ڕ) دوو شتی جیان، وەک: چۆن (س) و (ل) یا (س) و (ب) جیـان، چونکە ئەم دوو دەنگە واتا (ر) و (ڕ) دەتوانن لە هەمـان بینـەدا دەرکەون و مانا بگۆڕن؛ وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێ.

| | |
|---|---|
| برین | بڕین |
| کەر | کەڕ |
| وەرین | وەڕین |
| پەری | پەڕی |
| ... هتد. | |

لە زمـانی عـەرەبیـشـا ئەم دوو دەنگە جیاوازە هەن بەڵام یەک نرخیان هەیە. چونکە هیچ وشـەیێـک لەم زمـانەدا نادۆزرێتـەوە تـیـایا (ر) و (ڕ) ئاڵـوگـۆڕ بکرێ کـار لە مـانا بکات. هۆی جیـاوازیی نێوانیـان ئەنجامی کارتێکردنی ئەو بینە جیاوازانەیە کە تیـایا دەردەکەون. بەم جـۆرە (ر) و (ڕ) لە زمـانی کـوردیدا دوو فـۆنیـمی جیـان و لە زمـانی عـەرەبیـدا سـەر بەهەمان فۆنیـمن.

بەپێچەوانەوە. دوو دەنگی [س] و [ص] لە زمانی کوردییا دوو شێوەی جیای هەمان فۆنیمن جیاوازیی نێوانیان لە ئەنجامی ئەو بینە جیاوازانەیە کە تیایا دەردەکەون... لە زمانی کوردییا هیچ وشەیێک نییە تیایا [س] و [ص] ئاڵوگۆڕ بکرێ و کار لە مانا بکات، کەچی لە زمانی عەرەبیدا دەتوانن لە هەمان بینەدا دەرکەون و کار لە مانا بکەن. بۆیە لە زمانی عەرەبیدا [س] و [ص] دوو فۆنیمی جیان.

سلب - صلب

سار - صار

عسیر - عصیر

عسی - عصا

فسیح - فصیح

مس - مص... الخ.

بەهەمان پەیڕەو (ل) و (ڵ) لە زمانی عەرەبییا دوو شێوەی جیای هەمان فۆنیمن. دەرکەوتنیان لە بینەی جیاوازدا ئەم جیاوازییەی پێ بەخشین. کەچی لە زمانی کوردیدا دوو فۆنیمی جیان، چونکە دەتوانن لە هەمان بینەدا دەرکەون و کار لە مانا بکەن وەک لە:

چل - چڵ

گەل - گەڵ

گول - گوڵ

پەلە - پەڵە... هتد.

بەبەراوردکردنی زمانی کوردی و عەرەبی لە ئاستی فۆنەتیکی و فۆنەلۆجی لەم شەش دەنگەدا ئەم ئەنجامەمان دەست دەکەوێ:

| فۆنۆلۆجی | | دەنگ | | فۆنۆلۆجی |
|---|---|---|---|---|
| فۆنیم | کوردی | فۆنەتیک | عەرەبی | فۆنیم |
| /ر/ | پەری | [ر] | برد | /ر/ |
| /ڕ/ | پەڕی | [ڕ] | حر | |
| /س/ | ساڵ | [ص] | صهر | /ص/ |
| | سەوز | [س] | سهر | /س/ |
| /ل/ | چل | [ل] | علم | /ل/ |
| /ڵ/ | چڵ | [ڵ] | الله | |
| ٥ | | ٦ | | ٤ |

واتا ئەم شەش دەنگە هاوبەشە پێنج (فۆنیم) لە زمانی کوردیدا و چوار فۆنیم لە زمانی عەرەبیدا پێک دەهێنن.

ئەم دەنگانە چ لە زمانی کوردیدا بن چ لە زمانی عەرەبیدا، چ لە هەر زمانێکی تردا بن بەهەمان جۆر و پەیڕەو دروست دەکرێن. ئەمە لایەنە گشتییەکەیە و ئەرکی فۆنەتیکە ڕوونی کاتەوە چۆن دروست دەکرێن، بەڵام وەک دەرکەوت هەر زمانەی جۆرە نرخێک بەو دەنگانە دەدات. ئەمە لایەنە تایبەتییەکەیە و ئەرکی فۆنۆلۆجییە.

بۆ دەستنیشانکردنی فۆنیمەکانی هەر زمانێ ئەو جووتە وشانە بەراورد دەکرێن کە بەتەواوی وەک یەک وان لە تاکە دەنگێ نەبێ و ئەم جیاوازییە کار لە مانا دەکات وەک (بیر، پیر، سیر، تیر، میر، شیر، ژیر، لیر)... هتد[٧].

جۆری دووەمی یاسا فۆنۆلۆجییەکان ئەوانەن کە لەناو قاڵبی برگەی فۆنەتیکدا فۆنیمەکان لەیەک دەدەن و برگەی فۆنۆلۆجی پێک دەهێنن.

تا ئێستا هیچ قوتابخانەیێکی زانستی زمان نەیتوانیوە پێناسینێکی بێ کەلەبەری برگە پێشکەش بکات. بەشێوەییێکی گشتی دوو جۆری لێ جیاکردۆتەوە.

یەکەم: **برگەی فۆنەتیکی**: ئەم جۆرەیان گشتییە. هەموو زمانانی جیهان تیایا بەشدارن. پەیوەندیی بەفسیۆلۆجییەتی هەناسە وەرگرتن و چۆنیەتی کارکردنی ئەندامانی ئاخاوتنەوە هەیە. لەناو چوارچێوەی ئەم قاڵبە گشتییەدا زمانەکان جیاوازی پێشان دەدەن لە چۆنیەتی لێکدانی فۆنیمەکانیان. واتا: هەر زمانەی یاسای تایبەتیی خۆی هەیە بۆ لێکدانی

فۆنیمەکانی لەناو قاڵبی برگەدا. ئەم لەیەکدانە تایبەتییە برگەی فۆنۆلۆجی پێک دەهێنێ.

**دووەم - برگەی فۆنۆلۆجی:** لە هەموو زمانێکا بزوێن نازوکی برگە پێک دەهێنێ. لەگەڵ ئەم بزوێنەدا دەشێ چەند فۆنیمێکی کپ دەرکەوێ. ژمارەی ئەو کپانە و سروشتی ریزبوون و دەرکەوتنیان پێکەوە لە زمانەکانا جیاوازە. بۆ نموونە: فۆنیمی (s - p - r) لە زمانی کوردی و ئینگلیزییا هەن. ئەم سێ فۆنیمە دەتوانن لە زمانی ئینگلیزیدا (هێشوو)ێک cluster لەناو قاڵبی برگەدا پێک بهێنن، وەک لە برگەی (spring)دا... ئەم سێ دەنگە هەرگیز ناتوانن بەم شێوەیە لە زمانی کوردیدا دەرکەون. واتا لە زمانی ئینگلیزیدا یاسایێکی فۆنۆلۆجی هەیە بەهۆیەوە ئەم سێ فۆنیمە یەک دەگرن و هێشوو پێک دەهێنن. لە زمانی کوردیدا ئەم یاسایە نییە...

لە زمانی عەرەبیدا هەرگیز دوو کپ (بێ بزوێن لە نێوانیانا) لە سەرەتای برگەدا دەرناکەوێ.

کەچی لە زمانی کوردییا بۆی هەیە دوو کپ لە سەرەتای برگە پێکەوە هێشوو دروست بکەن، وەک (برا، درا، خوا، جوان... هتد)...

هەندێ فۆنیم هەرگیز پێکەوە دەرناکەون یا هەرگیز یەکێکیان پێش ئەوی تر ناکەوێ.. ئەو یاسایانەی سروشتی ریزبوونی فۆنیمەکان لەناو قاڵبی برگەدا دەستنیشان دەکەن. یاسای فۆنۆلۆجین.

**جۆری سێیەمی** یاسا فۆنۆلۆجییەکان ئەوانەن کە بەهۆیانەوە لە ئەنجامی لە یەکدانی فۆنیمەکان (لە هەندێ حاڵەتدا) دەنگ هەیە دەتوێتەوە، وەک توانەوەی (ە)ی ئامرازی پێناسین (ەکە) کە (ان)ی کۆی دەچێتە سەر:

خانووەکە - خانووەکان

هەندێ جار لە ئەنجامی لێکدانی دەنگەکان دەنگی تازە پەیا دەبێ وەک دەرکەوتنی (ی) لە نێوان دوو (ا)ی (مامۆستا) و (ان)ی کۆ.

لە هەندێ حاڵەتا دەنگ هەیە شێوەکەی دەگۆرێ. وەک گۆرینی (ۆ) بە(و)ی کپ، وەک لە... من دەخۆم = ئەو دەخوات.

لەهەر زمانێکدا کۆمەڵە یاسایێک هەیە بەهۆیانەوە توانەوە و پەیابوون و گۆرینی دەنگەکان دەستنیشان دەکات. بەم یاسایانە دەوترێ فۆنۆلۆجی (نەک فۆنەتیکی).

لە ئەنجاما دەردەکەوێ کە هەر دەنگێکی زمانی سەر بەهەج زمانێک بێ هەمان سروشت

و پێکهاتنی هەیە. [هێز، ئاوازە، ت، ل، ڵ، ک، گ... هتد] لە زمانی کوردیدا بێ... ئەسکیمۆ بێ... باسک بێ... سەنهالی بێ... هتد هەمان سروشت و پێکهاتنیان هەیە... فۆنەتیک ئەو لقەیە کە ئەم سروشت و پێکهاتنە دەستنیشان دەکا. ئەم کەرەسانە لە هەر زمانێکا بەجۆرێ بەکاردێ و یاسای تایبەتیی خۆی هەیە بۆ دەرکەوتنیان. ئەو یاسا تایبەتییانەی لە زمانە جیاوازەکانا هەن کە چۆنیەتی دەرکەوتن و بەکارهێنانی ئەم کەرەسانە دەستنیشان دەکەن بەیاساکانی (فۆنۆلۆجی) ناودەبرێن.

پەراوێزەکان:

١- بەپێی ئەو سەرچاوانەی لەژێر دەستم دان.

٢- بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی لقەکانی زانستی زمانەوە سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:

وریا عومەر ئەمین (١٩٨١) زانستی زمان چییە؟ گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژمارە (٨٨).

٣- زۆر زمان هەیە هەندێ دەنگیان تیا بەهێزی بای لە سییەکانەوە هاتوو دروست ناکرێن، ئەمانە سێ جۆرن (clicks) (ejective) (implosion).

بۆ ئەم جۆرە زمانانە سەیری سەرچاوەی ژمارە (٥) بکە ل(٩٦).

٤- ژێکان دوو پارچە گۆشتی سروشت لاستیکین ئەرکی بایۆلۆجییان ئەوەیە ناهێڵن خواردن بچێتە ناو بۆریی هەناسەوە. لە قسەکردنا، کە دێنە یەک، بەهێزی بای لە سییەکانەوە هاتوو دەلەرنەوە و سیمای ژێداری دەدەنە دەنگەکە. گەر لێک دوورکەوتنەوە با بێ تەگەرە لە نێوانیانا تێدەپەڕێ.

لەرینەوە داخراو کراوە

٥- ئەم ئەخشەیە لە ل٢١ی سەرچاوەی ژمارە (٢)وە وەرگیراوە، کە بەم جۆرەیە:

لیژنەی زمان لە کۆڕی زانیاریی عێراق - دەستەی کورد. زاراوەکانی کردۆتە کوردی.

| | Bi-labial | Labial-dental | Dental | Alveolar | Palatalalveolar | Palatal | Velar | Uvular | Pharyngal | Glottal |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Plosive | p b | | Ŝ Ẑ | | | | k g | q | | |
| Fricative | | f v | | s z | ä ë | | | x y | ˜h | h |
| Affricate | | | | ˆc j | | | | | | |
| Nasal | m | | n | | | | g | | | |
| Lateral | | | | l l̂ | | | | | | |
| Rolled | | | | r ˆr | | | | | | |
| Semi-vowel | w | | | | | y | | | | |

٦- دەشێ هەردوو زمانێکی تر بۆ ئەم جۆرە بەراوردییە هەڵبژێرێ. ئێمە زمانی عەرەبیمان هەڵبژارد، چونکە زۆربەمان شارەزای ئەم زمانەین.

٧- بۆ چۆنیەتی دەستنیشانکردنی فۆنیمەکانی زمانی کوردی سەیری سەرچاوەی ژمارە (٨) بکە.

سەرچاوەکان:


1- Abercrombie D.(1967)Elements of general phonetics. Edinbrgh.
2- Amin, Wraia Omar (1979) Aspects of the verbal construction in Kurdish. Thesis presented to the University of London.
3- FromKin. V. and Rodman. R. (1978) An introduction to Language.
4- Fudge. E. C. (1970) Phonology, in New Horizons in Linguistics. (ed.) J. Loyns.
5- Gleason. H. A. (1965) An introduction to descriptive Linguistics. Holt.
6- Robins. R. H. (1971) General Linguistics, Longman.

٧- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) فۆنۆلۆجی - گۆڤاری کاروان ژمارە (٢٠).

٨- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) ئیملای کوردی و چەند تێبینییەک. گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد. ژمارە (٩).



* ئەم وتارە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد - بەغدا، ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٨٩، لاپەڕە ٢٣٩-٢٥٩ بڵاوکراوەتەوە.

# ڕێزمانی ڕاناو لە کرمانجیی ژووروودا

زۆربەی ئەوانەی کە لە ڕووی سینتاکسییەوە لە ڕاناوەکانی کرمانجیی ژوورووییان کۆڵیوەتەوە، سنووری شیکردنەوەکانیان لە دەوری بکەریی ئەم ڕاناوانە ڕەت نەبووە و سروشتی پێوەندییان بەبەشەکانی تری ڕستەوە دەستنیشان نەکردووە، بۆیە کەموکوڕییەکی زۆر کەوتۆتە بۆچوون و ئەو یاسایانەی دایان ڕشتوون.

ئەودی لەم بارەیەوە وترابێ لە چوارچێوەی ئەوە دەرناچێ کە دەڵێ: لە کرمانجی ژووروودا دوو دەستە ڕاناوی جودا و یەک دەستە ڕاناوی لکاو هەیە وەک لەم وێنەیەدا بەپێی کەس و ژمارە ڕوون کراوەتەوە[1]:

| ژمارە | کەس | ڕاناوی جودا ١ | ڕاناوی جودا ٢ | ڕاناوی لکاو |
|---|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من | ئەز | م |
| | ٢ | تە | تو | ی |
| | ٣ | وی/وێ | ئەو | -ەت/ەت |
| کۆ | ١ | مە | ئەم | ین |
| | ٢ | وە | هوون | ن |
| | ٣ | وان | ئەو | ن |

دەستەی یەکەم لەگەڵ فرمانی تێپەڕ لە ڕابردوودا دەردەکەوێ. لەم حاڵەتەدا فرمان ڕاناوی لکاو وەرناگرێ. نموونەکانیشیان لەم بابەتەیە:

من کر

تە کر

وی / وێ کر

مە کر

وە کر

وان کر

دەستەی دووەم لەگەڵ تێنەپەڕی ڕابردوو و تێپەڕ و تێنەپەڕی داهاتوودا دەردەکەوێ. لەم حاڵەتەدا فرمان ڕاناوی لکاو وەردەگرێ وەک:

| تێنەپەڕی ڕابردوو | تێپەڕی داهاتوو | تێنەپەڕی داهاتوو |
|---|---|---|
| ئەز نڤستم | ئەز دکەم | ئەز دنڤم |
| تو نڤستی | تو دکەی | تو دنڤی |
| ئەو نڤست | ئەو دکەت | ئەو دنڤت |
| ئەم نڤستین | ئەم دکەین | ئەم دنڤین |
| هوون نڤستن | هوون دکەن | هوون دنڤن |
| ئەو نڤستن | ئەو دکەن | ئەو دنڤن |

شیکردنەوە دەری دەخات کە زۆر لایەنی تر هەن لە بارەی ئەرک و چۆنیەتیی دەرکەوتن و کارکردنی ئەم ڕاناوانە باس نەکراون. ئەم باسە هەوڵدانێکە بۆ دەستنیشانکردنی هەندێ لەو لایەنانە.

بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیی دەرکەوتن و ئەرک و پێوەندیی ڕاناوەکان بەبەشەکانی تری ڕستەوە سەیری ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە کە بەشە بنجییەکانیان (بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ... هتد) بەڕاناو دەربڕاون:

أ-

١- ئەز دنڤم

٢- تو دنڤی

٣- ئەو دنڤیت

٤- ئەم دنڤین

٥- هوون دنڤن

٦- ئەو دنڤن

ب-

١- ئەز دبینم

٢- تو دبینی

٣- ئەو دبینیت

٤- ئەم دبینین

٥- هوون دبینن
٦- ئەو دبینن

ج-
١- ئەز تە دبینم
٢- تو من دبینی
٣- ئەو وی دبینیت
٤- ئەم وە دبینین
٥- هوون مە دبینن

د-
١- ئەز تە ژ بۆ وی دهنێرم
٢- تو من ژ بۆ وان دهنێری
٣- ئەو وێ ژ بۆ من دهنێریت
٤- ئەم وان ژ بۆ تە دهنێرین
٥- هوون وی ژ بۆ مە دهنێرن
٦- ئەو مە ژ بۆ وە دهنێرن

هـ-
١- ئەز تە دبینم
تو دهێیە دیتن
٢- تو من دبینی
ئەز دهێمە دیتن
٣- ئەو وێ دبینیت
ئەو دهێتە دیتن
٤- ئەم وە دبینین
هوون دهێنە دیتن
٥- هوون مە دبینن
ئەم دهێینە دیتن
٦- ئەو وان دبینن
ئەو دهێنە دیتن

و-

١- ئەڤە کچا منە

٢- ئەڤە کورێ تەیە

٣- ئەڤە دایکا وییە

٤- ئەڤە خوشکا مەیە

٥- ئەڤە برایێ وەیە

٦- ئەڤە کچا وانە

ئەم ڕستانەی سەرەوە فرمانەکانیان هەموو لە کاتی داهاتوودان.

لە (أ)دا فرمان تێنەپەڕە بکەر و فرمان لە کەس و ژمارەدا ڕێک کەوتوون[٢]. واتا فرمان ڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارەی بکەری وەرگرتووە.

لە (ب)دا فرمان تێپەڕە. وەک (أ) بکەر و فرمان لە کەس و ژمارەدا ڕێک کەوتوون.

لە (ج)دا بەرکاری ڕاستەوخۆ دەرکەوتووە. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە، ئەو ڕاناوانەی کە بۆ دەوری بەرکاری دەرکەوتن سەر بەدەستەیێکی ترن و جیان لەوانەی کە بۆ دەوری بکەری دەرکەوتوون.

لە (د)دا بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەرکەوتووە. ئەو ڕاناوانەی کە ئەم دەورە دەبینن هەر ئەوانەن کە دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆ دەبینن.

لە (هـ)دا ڕستەکان کراونەتە بکەری نادیار[٣]. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە، کە ڕستەکان گوێزرانەوە بکەر نادیار ئەو ڕاناوانەی دەوری بەرکاریی دەبینن بەڕاناوی بەرامبەری دەستەکەی تریان جێگیرکران.

لە (و)دا دەستەی (من، تە، وی... هتد) لە حاڵەتی ئیزافە و هەییدا دەرکەوتووە.

***

ئێستا سەیری ئەم ڕستانەی خوارەوە بکە کە کاتی فرمانەکانیان لە ڕابردوودایە و ئینجا لەگەڵ ئەوانەی سەرەوە بەراوردیان بکە.

ز-

١- ئەز نڤستم

٢- تو نڤستی

٣- ئەو نڤست

٤- ئەم نڤستین

٥- هوون نڤستن

٦- ئەو نڤستن

ح-

١- من دیت

٢- تە دیت

٣- وی / وێ دیت

٤- مە دیت

٥- وان دیت

ط-

١- من تو دیتی

٢- تە ئەز دیتم

٣- وی ئەو دیت

٤- مە هوون دیتن

٥- وە ئەم دیتین

٦- وان ئەو دیتن

ی-

١- من تو ژ بۆ وی هنارتی

٢- تە ئەز ژ بۆ وان هنارتم

٣- وی ئەو ژ بۆ مە هنارت

٤- مە هوون ژ بۆ وی هنارتن

٥- وە ئەم ژ بۆ وی هنارتن

٦- وان ئەو ژ بۆ وە هنارتن

ک-

١- من تو دیتی

تو هاتییە دیتن

٢- تە ئەز دیتم

ئەز هاتمە دیتن

٣- وی ئەو دیت

ئەو هاتە دیتن

٤- مە هوون دیتن

هوون هاتنە دیتن

٥- وە ئەم دیتین

ئەم هاتینە دیتن

٦- وان ئەو دیتن

ئەو هاتنە دیتن

ل-

١- ئەڤە خوشکا من بی

٢- ئەڤە کوڕێ تە بی

٣- ئەڤە دایکا وێ بی

٤- ئەڤە برایێ مە بی

٥- ئەڤە کچا وە بی

٦- ئەڤە بابێ وان بی

لەم ڕستانەی سەرەوە کە کاتی فرمانەکانیان هەموو لە ڕابردوودایە:

لە (ز)دا فرمان تێنەپەڕە، بکەر لەگەڵ فرمانا لە کەس و ژمارەدا ڕێک کەوتووە.

لە (ح)دا فرمان تێپەڕە ئەو دەستە ڕاناوەی وەک بکەر دەرکەوتووە جیایە لەوەی لە (ز)دا و ئەوەیە کە بۆ دەوری بەرکاری لەگەڵ فرمانی کات داهاتوو دەرکەوت [سەیری (ح) بکە].

لە (ط)دا بەرکار دەرکەوتووە... ئەو ڕاناوانەی بۆ ئەم دەورە دەرکەوتوون ئەوانەن کە بۆ دەوری بکەری دەرکەوتن لەگەڵ فرمانی کات داهاتووی تێپەڕدا. [سەیری (ب) و (ج) بکە].

لە (ی)دا بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەرکەوتووە. ئەو دەستەیەی ئەم دەورەیان بینیوە هەر

ئەمانەن کە هەمان دەوریان لەگەڵ فرمانی کات داهاتوودا بینی [سەیری (د) بکە].

لە (ک)دا ڕستەکان کراونەتە بکەر نادیار. ئەو ڕاناوانەی دەوری بەرکارییان بینیوە بەڕاناوی بەرامبەریان لە دەستەکەی تر جێگیر نەکراون وەک ئەوەی لەگەڵ کاتی داهاتوودا ڕووی دا. [سەیری (هـ) بکە].

لە (ل) دەستەی (من، تە، وی... هتد) لە حاڵەتی ئیزافە و هەییدا دەرکەوتووە... وەک کاتی داهاتووە [سەیری (و) بکە].

***

بەبەراوردکردنی ئەم ڕستانەی سەرەوە کە کاتی فرمانەکانیان لە ڕابردوودایە لەگەڵ ئەوانەی پێشوو کە کاتی فرمانەکانیان لە داهاتوودایە، دەردەکەوێ:

١- ئەگەر فرمان تێنەپەڕ بێ... هەمیشە دەستەی دووەم (ئەز، تو، ئەو، ئەم، هوون، ئەو) وەک بکەر دەردەکەوێ.

٢- ئەگەر فرمان تێپەڕ بێ:

أ- دەستەی یەکەم (من، تە، وی / وێ، مە، وە، وان) دەوری بکەری لە ڕابردوو و دەوری بەرکاری لە داهاتوودا دەبینێ.

ب- دەستەی دووەم (ئەز، تو، ئەو، ئەم، هوون، ئەو) دەوری بکەری لە داهاتوودا و دەوری بەرکاری لە ڕابردوودا دەبینێ. (أ) و (ب) لەم وێنەیەدا ڕوون کراونەتەوە:

٣- هەمیشە دەستەی یەکەم بۆ دەوری بەرکاری ناڕاستەوخۆ و ئیزافە و هەیی دەردەکەوێ.

٤- فرمان هەمیشە لەگەڵ دەستەی دووەم لە کەس و ژماردا ڕێک دەکەوێ. واتا ئەگەر دەستەی دووەم دەوری بکەریی بینی فرمان لەگەڵ بکەردا ڕێک دەکەوێ. ئەگەر دەوری بەرکاریی بینی فرمان لەگەڵ بەرکارا ڕێک دەکەوێ.

دەوری ڕاناوە جوداکان دەشێ لەم وێنەیەدا ڕوون بکرێتەوە.

| | | بکەر | بەرکار | هەموو حاڵەتێکی تر |
|---|---|---|---|---|
| ڕابردوو | تێپەڕ | ١ | ٢ | ١ |
| | تێنەپەڕ | ٢ | - | |
| داهاتوو | تێپەڕ | ٢ | ١ | |
| | تێنەپەڕ | ١ | - | |

**ئەنجام**

١- ئەگەر بکەر و بەرکاری ڕستە بەڕاناو دەربڕابن بەگۆڕینی کاتی فرمانی ڕستە لە ڕابردووەوە بۆ داهاتوو یا بەپێچەوانەوە:

أ- دەبێ دەستەی ڕاناوەکان ئاڵوگۆڕ بکرێ... واتا ئەگەر بکەر یا بەرکار سەر بەدەستەی یەکەم بێ، دەبێ بگۆڕێ بەڕاناوی بەرامبەری دەستەی دووەم و بەپێچەوانەوە.

ب- دەبێ ڕێکەوتن لەگەڵ فرمانا لە نێوان بکەر و بەرکاردا ئاڵوگۆڕ بکرێت. واتا ئەگەر ڕێکەوتن لە نێوان بکەر و فرماندا بوو... دەبێ بکرێتە نێوان بەرکار و فرمان بەپێچەوانەوە.

وەک لە ڕستەی:

ئەز تە دبینم

(ئەز): بکەرە سەر بەدەستەی دووەمە.

(تە): بەرکارە سەر بەدەستەی یەکەمە.

کاتی فرمانەکەی داهاتووە. لەگەڵ بکەردا لە کەس و ژمارەدا ڕێکەوتووە. ئەگەر کاتەکەی بکرێ بەڕابردوو:

ا- (ئەز) دەبێتە (من)

ب- (تە) دەبێتە (تو)

ج- فرمان لەگەڵ بەرکاردا ڕێک دەکەوێ و ڕاناوێکی لکاوی سەر بەکەس و ژمارەی بەرکار وەردەگرێ و دەبێتە (ی). ڕستەکە دەبێتە:

من تو دیتی.

ئەگەر کات ڕابردووبێ و بکرێتە داهاتوو:

من هوون دیتن.

ئەز وە دبین -م.

٢- ئەگەر ڕستەیێکی کات داهاتووی بکەر دیار، کرایە بکەر نادیار ئەو ڕاناوەی دەوری بەرکاری دەبینێ دەگۆڕێ بەڕاناوی بەرامبەری دەستەکەی تر.

واتا (من) دەبێتە (ئەز)، (تە) دەبێتە (تو)... هتد.

وەک لەم ڕستەیەدا.

| | |
|---|---|
| تو من دبینی. | (بکەر دیار) |
| ئەز دێمە دیتن. | (بکەر نادیار) |

بەپێچەوانەوەش ئەگەر ڕستەیێکی بکەر نادیاری کات داهاتوو کرایە بکەر دیار ئەو ڕاناوەی دەوری بکەریی بینیوە دەگۆڕێ بەڕاناوی بەرامبەری دەستەکەی تر. وەک:

| | |
|---|---|
| ئەم دێینە دیتن. | (بکەر نادیار) |
| تو مە دبینی. | (بکەر دیار) |

٣- دابەشکردنی ئەو دوو دەستە ڕاناوە بەپێی دۆخ هەڵەیە چونکە هەردوو دەستە هەردوو دۆخی ڕاستەوخۆ (فاعلی) و تیان (مفعولی) لە دوو کاتی ڕێزمانیی جیاوازدا دەبینن[٤].

٤- ئەو ئەرکانەی ڕاناوە جوداکانی کرمانجیی ژووروو چۆنیەتیی ئاڵوگۆڕبوونی ئەرکیان بەهەڵگێڕانی کاتی فرمانی ڕستە... لە کرمانجیی خوارووودا لە ڕاناوە لکاوەکانا بەرچاو دەکەوێ[٥].

٥- شێوەی کرمانجیی ژووروو سەر بەو جۆرە پێڕەوەیە کە لە زانستی زمانا بەنێرگەتیڤ Ergative. ناودەبرێ[٦].

پەراوێزەکان:

١- کرمانجیی ژووروو شێوەیێکی ناوەندیی گەورەیە دەیان بێچووە شێوەی گرتۆتە خۆ. هەر راناوەی لەوانەیە زیاتر لە فۆرمێک پێشان بدات. بۆ ئەم باسە ئەو دوو دەستەیە هەڵبژێررا هەموو شێوەکە دەنوێنن.

٢- بۆ چەمکی ڕێکەوتن Concord سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە. وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) ڕێکەوتن لە زمانا - گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ (٩١).

٣- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ڕستەی بکەر نادیار لە کرمانجیی ژووروودا سەیری سەرچاوە ژ (٤) بکە.

٤- بۆ ئەم باسە سەیری سەرچاوە ژ (٧) بکە.

٥- بۆ بەراوردی لە نێوان کرمانجیی ژووروو و خواروو لە ڕووی ڕاناوەوە سەیری سەرچاوە ژ (٥) بکە.

٦- ئەگەر بەوردی بیر لە واتا و پەیوەندیی نێوان بەشە بنچینەکانی ڕستە (بکەر، بەرکار، فرمان) بکرێتەوە، دەردەکەوێ کە ئەوەی بەبکەری فرمانی تێنەپەڕ لە قەڵەم دەدرێ لە ڕاستیا بەر چەمکی بەرکاری دەکەوێ چونکە هیچ شتێ لە خۆیەوە ڕوونادات و دەبێ هۆیەکی هەبێ، ئەو هۆیە شاراوەیە، بکەرە ڕاستەقینەکەیە. بۆ نموونە کە دەڵێی (شووشەکە شکا) دەبێ کەسێ یا هێزێ ئەم شووشەیەی شکاندبێ. گەر دەرکەوت دەشێ دەربڕێ و ڕستەکە بکرێ بە(ئازاد شووشەکەی شکاند).

پێوەندیی نێوان (شووشەکە) و (شکان) لە هەردوو حاڵەتدا هەمان شتە. لە هەندێ شێوە یا زماندا ئەم پێوەندییە خۆی لە (سیما)دا Surface Structure دەردەخا لە ڕێی ڕێکەوتندا بەم جۆرە زمانە یا شێوەیە دەوترێ نێرگەتیڤ Egrative.

هەندێ زمان نێرگەتیڤی تەواوە لە هەموو حاڵەتێکا (بەرکار) و (فرمان) تیا ڕێک دەکەون لە کەس و ژمارەدا وەک زمانی باسک Basque هەشە نیمچە نێرگەتیڤە وەک شێوەی کرمانجیی ژووروو کە ئەم لایەنەی تیا هەر لەگەڵ کاتی ڕابردوودا دەردەکەوێ.

سەرچاوەکان:

١- نەورەحمانی حاجی مارف (١٩٨٧) ڕێزمانی کوردی - بەرگی یەکەم - بەغداد.

٢- جگەرخوێن (١٩٦١) ناوا و دەستوورا زمانێ کوردی - بەغداد.

٣- صادق بها ءالدين (١٩٧٦) ڕێزمانا کرمانجیی - بەغداد.

٤- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) ڕستەی بکەر نادیار - گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ (٩٥).

٥- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٣) لایەنێکی جیاوازی - گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عیراق- دەستەی کورد - بەرگی (١٠).

٦- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٣) پێوەندیی ڕاناو و فرمان لە کرمانجیی ژووروودا. گۆڤاری کاروان ژ (٢).

٧- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٥) روونکردنەوەیێک. گۆڤاری نووسەری کورد - ژ (٢) خولی (٣).

٨- وریا عومەر ئەمین ( ١٩٨) ئالوگۆڕبوونی راناو لە کرماانجیی ژووروودا - رۆژنامەی هاوکاری ژ (١٠٣٢) (١٢ - ١٢ - ١٩٨٨).

٩- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٩) راناو لە بکەر نادیاری کرماانجیی ژووروودا. رۆژنامەی هاوکاری. ژ (١٠٤٦) (١٩٨٩/١/١٠).

بەزمانی ئینگلیزی:

10- Amin, W. O. (1979) Aspects of the verbal Construction in Kurdish. Thesis presented to the University of London.

11- Comrie, B. (1973) The Ergative - Variations on theme. Lingua 32 pp. (239 - 253).

12- Mackenzine, D. N. (1961) Kurdish dialect studies London.

بەزمانی رووسی:

13- Bakaev, Ch. (1973) Izik Kurdov. SSR Maskva.

14- Kurdoev, K.(1978) Gramatika Kurdskava Izika. Maskva.

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد - بەغدا، ژمارە (٢١)ی ساڵی ١٩٩٠، لاپەڕە ٢٥٢-٢٦٢ بڵاوکراوەتەوە.**

# مەرج و یاساکانی لە زمانی کوردیدا

ڕستەی مەرجی، ڕستەیێکی لێکدراوە[1]. لە دوو ڕستەی سادە پێک دێت. دەستەیێک یاسا سروشتی دەرکەوتنی جۆر و کاتی فرمانی ئەم دوو ڕستەیە دەستنیشان دەکەن. لەم باسەدا بەشێ لەم یاسایانە دەخرێنە ڕوو. بۆ ئەمە ئەبێ کاتەکانی فرمان بزانرێن.

لە بارەی ژمارەی کاتەکان و زاراوەکانیانەوە ڕای جیاجیا هەیە[2]. کاتی واش هەیە سەرچاوەکانی ڕێزمانی کوردی ناویان نابەن[3]. کاتەکانی فرمانی ڕستەی کوردی[4] لە نەخشەی ژ(١) ڕیزکراون. زاراوەکان بەپێی چەمکی سیمانتیکیی پێوانەی زانستی زمان دەستنیشان کراون[5].

| کات Tense | جۆر Aspsct | یاسا | نموونە |
|---|---|---|---|
| ڕابردوو Past | سادە Simple | ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو[6] | هاتین خواردمان |
| | بەردەوام Continuous | دە + ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو | دەهاتین دەمانخوارد |
| | تەواو Perfect | ڕەگی ڕابردوو + بوو + ڕاناوی لکاو | هاتبووین خواردبوومان |
| | مەرجی Conditional | ب + ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو + ایە | بهاتینایە بمانخواردایە |
| ڕانەبردوو Present | سادە Simple | دە + ڕەگی داهاتوو + ڕاناوی لکاو | دەنووسین دەنووین |
| | تەواو Perfect... | ڕەگی ڕابردوو + وو + ڕاناوی لکاو + ـە لەگەڵ تێنەپەڕدا (ـە) تەنیا لەگەڵ کەسی ٣ی تاک دەردەکەوێ. | خواردوومانە نوستووین |

| Present ڕانەبردوو | مەرجی سادە<br>Simple<br>Conditional | ب + ڕەگی داهاتوو + ڕاناوی لکاو | بڕۆین<br>بشۆین |
|---|---|---|---|
| | مەرجی تەواو<br>Perfect<br>Conditional | ڕەگی ڕابردوو + ب + ڕاناوی لکاو | هاتبین<br>کردبمان |
| | داخوازی<br>imparative | ب + ڕەگی داهاتوو + (ـە ئەگەر ڕەگە بە کپ کۆتایی هاتبێ) | بنووسە<br>بشۆ |

نەخشەی ژمارە (١)

یاساکانی داڕشتنی ڕستەی مەرجی لەم نەخشەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

**یاساکانی داڕشتنی ڕستەی مەرجی**

ڕابردووی سادە - داهاتووی سادە / داخوازی / ئینشائی

١- ئەگەر (نە) هات
- من دەردەچم / دەرناچم
- تۆ بڕۆ / مەڕۆ
- چاوەڕێم بکات / نەکات

داهاتووی بەردەوام- داهاتووی بەردەوام / داخوازی

٢- ئەگەر (دە)[٧] خوێنێت (نا) نوویت
- من دەردەچم/ دەرناچم
- دەرگاکە داخە/ دامەخە

٣- ڕابردووی مەرجیی تەواو - ڕابردووی بەردەوام
ئەگەر (نە)[٧] بهاتایە - وای بەسەر (نە) دەهات

٤- ڕابردووی بەردەوام - ڕابردووی بەردەوام
ئەگەر (نە) دەهات - خۆم دەمزانی چیم دەکرد

مەرجیی داهاتووی تەواو - داهاتووی سادە / داخوازی

| | | |
|---|---|---|
| ٥- | ئەگەر (نە) هاتبێ | خۆم قسەی لەگەڵ دەکەم / ناکەم<br>تۆ خۆت بشارەوە / مەشارەوە |

داهاتووی مەرجی سادە - داهاتووی سادە / داخوازی

| | | |
|---|---|---|
| ٦- | ئەگەر<br>(نە)(٧)بچێت | پاداشتەکەی دەدەمێ / نادەمێ<br>ئاگادارم بکە / مەکە |

سەرچاوە و پەراوێزەکان:

١- بۆ ڕستەی لێکدراو Coordinated Sentence و جیاوازیی لە ڕستەی ئاڵۆز Complex سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:

Waria Omar Amin (1976) Some Fundamental rules of Kurdish Syntax Structure. London.

٢- بۆ نموونە هەندێ زمانەوان کاتی وەک (کردوومە - هاتووین... هتد) بەڕابردوو لە قەڵەم دەدەن بەڵام بەپێی چەمکی سیمانتیکی پێناسینی کاتەکان ئەمە ئێستەی تەواوە Present Perfect. بۆ پێناسینی چەمکی کاتەکان سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:

وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) هەندێ یاسای مۆرفۆلۆجیی دارشتنی فرمان - گ. ڕۆشنبیری نوێ ژ (١٠٩).

٣- سەرچاوەکانی ڕێزمانی کوردی ناوی کاتی بەردەوامی تەواو Perfect Continuous نابەن. یاساکەی لە زمانی کوردیدا بەم جۆرەیە:

لە + چاوگ + دا + [ (بوو) ـ ڕابردوو / (دە + بـ) ـ داهاتوو / (×) ـ ئێستا ] + ڕاناوی لکاو

ڕابردوو - [لە + خوێندن + دا + بوو + (م، یت، ×، ین، ن، ن)]

داهاتوو - [لە + خوێندن + دا + دە + بـ(م، یت، ێت، ین، ن، ن)]

ئێستا - [لە + خوێندن + دا + +(م، یت، ـە، ین، ن، ن)]

هەروەها ناوی ئەم جۆرە کاتەش نابەن کە لە ئەسپێکتدا Aspect جیاوازە و تایبەتە بەکارە تێپەڕەکان. پاساکانی بەم جۆرەیە:

| | | |
|---|---|---|
| ڕابردوو | سادە | کەوتمە ئیشکردن. |
| | بەردەوام | دەکەوتمە ئیشکردن. |
| | تەواو | کەوتبوومە ئیشکردن. |
| | مەرجی و خۆزگەیی | بکەوتمایە ئیشکردن. |
| داهاتوو | سادە | دەکەومە ئیشکردن. |
| | تەواو | کەوتوومەتە ئیشکردن. |
| | مەرجیی سادە | بکەومە ئیشکردن. |
| | مەرجیی تەواو | کەوتبمە ئیشکردن. |

٤- کرمانجیی خواروو.

٥- سەیری پەراوێزی ژ (٢) بکە.

٦- بۆ پاساکانی ڕاناوی لکاو سەیری ئەم کتێبە بکە:

وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو - بەغدا.

٧- [(دە) و (نا)] [(نە) و (بـ)] یەکتر لادەبەن Mutually Exclusive.

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد - بەغدا، ژمارە (٢٧ و ٢٨)ی ساڵی ١٩٩٨، لاپەڕە ٢٤١-٢٤٣ بڵاوکراوەتەوە.**

# لێکۆڵینەوەیێکی مۆرفۆفۆنێمی

سروشت و سیستەمی کارکردنی ڕاناوی لکاو بەگشتی و هی کەسی سێیەمی تاک بەتایبەتی لەلایەنە هەرە سرک و دژوارەکانی ڕێزمانی کوردییە، چ لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا چ لە ئاستی سینتاکسیدا. بەلای کەمی (١٢) ئەلەمۆرفی هەیە. هەبوونی ئەم هەموو ئەلەمۆرفە بۆ کەسی سێیەمی تاک بەڵگەی ئاڵۆزییەتی، کە بەشێکی ئەخرێتە پاڵ هۆی ڕێزمانی و بەشەکەی تری ئەخرێتە پاڵ هۆی فۆنۆلۆجی.

ئەم باسە لێکۆڵینەوەییێکی مۆرفۆفۆنیمێکیی[1] خێرای ئەو ڕاناوە لکاوەیە کە لەگەڵ ڕەگی کارا دەرئەکەوێ بۆ دەربڕینی ڕێککەوتن[2] لەگەڵ بکەری کەسی سێیەمی تاکدا.

## یەکەم: لەگەڵ کاری کاتی داهاتوودا

ئەو ڕاناوە لکاوەی کە لەگەڵ کاری کاتی داهاتوودا دەرئەکەوێ بۆ دەربڕینی ڕێککەوتن لەگەڵ بکەری کەسی سێیەمی تاکدا گەلێ شێوەی جیاوازی هەیە. هۆی وەرگرتنی ئەو قاڵبە جیاوازانە ئەو بینە فۆنۆلۆجییە جیاوازانەیە کە تیایانا دەرئەکەوێ.

گەورەترین قاڵبی خۆی بە[ات/ێت][3] دەرئەخا.

أ- یاسای دەرکەوتنی [ات]

ئەگەر ڕەگی داهاتوو بە[ۆ] یا [ـە] کۆتایی هاتبێ... ڕاناوە لکاوەکە قاڵبی [ات] ئەگرێتە خۆ. کە ئەچێتە سەر ڕەگەکە [ۆ] ئەبێتە [و]ای کپ [W] consonant و [ـە] ئەتوێتەوە.

ب- یاسای دەرکەوتنی [ێت]

ئەگـەر ڕەگی داهاتوو بەهەچ فـۆنیـمێ جگە لە /ۆ/ و /ە/ کـۆتایی هاتبێ... ڕاناوە لکاوەکە قاڵبی [ێت] ئەگرێتە خۆ.

[چوون - چ] ئە + چ + ێت ← ئەچێت

[شکاندن - شکێن] ئە + شکێن + ێت ← ئەشکێنێت

ج- یاسای لابردنی [ت]ی بەئارەزوو Optional

ئەشێ [ت]ی [ات - ێت] لابـرێ بەمـەرجێ بزوێنی لەدوا نەیێ، بێ ئەوەی کـار لە ڕێزمـانێتی بکات... بەم جۆرە [ات - ێت] هەریەکە ئەلەمۆرفێکی تریان هەیە کە [ا - ێ]ن، واتا [ات -ا] و [ێت - ێ] هەر یەکە لەگەڵ ئەوی ترا لە گۆڕینی سەربەست Free variation دان.

ئەشوات - ئەشوا

ئەبات - ئەبا

ئەچێت - ئەچێ

ئەوەرێت - ئەوەرێ

بەڵام ئەگەر بزوێنێ لە دوای [ات - ێت] هات [ت] کە ناشێ لابرێ.

ئەو ئەخواتەوە.

ئەو ئەچێتەوە.

ئەو ئەباتە ئەوێ.

ئەو ئەنێرێتە لات.

د- یاسای توانەوەی [ێ]ی [ێت]

ئەگەر ڕەگی داهاتوو بە[ێ] کۆتایی هاتبێ، [ێ]ی ڕاناوی [ێت] لەناو [ێ]ی ڕەگەکە ئەتوێتەوە و ڕاناوەکە شێوەی [ت] ئەگرێتە خۆ.

ئەشکێ + ێت + ئەشکێت

ئەسووتێ + ێت + ئەسووتێت

هـ- یاسای توانەوەی (ێ)+ لابردنی (ت)

ئەگەر یاسای لابردنی {ت} بەسەر ئەو جۆرە نموونانەی سەرەوە سەپێنرا... ڕاناوی لکاو هیچ سیمایێکی بینراوی بۆ نامێنێ و بەمۆرفیمی سیفر Morpheme Zero خۆی دەرئەخا.

ئەشکێ + ێت ⟵ ئەشکێت - ت ⟵ ئەشکێ

ئەسووتێ + ێت ⟵ ئەسووتێت - ت ⟵ ئەسووتێ

لە ئەنجاما ئەوە دەرئەکەوێ کە ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک کە لەگەڵ کاری کاتی داهاتوودا دەرئەکەوێ بەلای کەمی ئەم شەش ئەلەمۆرفەی هەیە:

| ئەلەمۆرف | یاسای دەرکەوتنی |
| --- | --- |
| ات | ئەگەر ڕەگ بە{ۆ} یا {ـە} کۆتایی هاتبێ |
| ێت | ئەگەر ڕەگ بە{ۆ} یا {ـە} کۆتایی نەهاتبێ |
| ا | بەیاسای لابردنی {ت} |
| ێ | بەیاسای لابردنی {ت} |
| ت | بەیاسای توانەوەی {ێ} |
| Ø | بەیاسای توانەوەی {ێ} + لابردنی {ت} |

**دووەم: لەگەڵ کاری کاتی ڕابردوو:**

ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک لەگەڵ کاری ڕابردوودا خۆی بەقاڵبی (ی) دەر ئەخا.

خواردی - بردی - هێنای - درووی.

۱- ئەگەر ڕەگەکە بەکپ Consonant کۆتایی هاتبێ ڕاناوەکە بەبزوێن Vowel دەرئەکەوێ.

کردی ـ kird-î

ڕشتی rişt-î

ب- ئەگەر ڕەگەکە بەبزوێن کۆتایی هاتبێ (ی)ی ڕاناو خۆی بەکپ [y] دەرئەخا.

هێنای ـ hênâ-y

دروی ـ drû-y

ج- ئەگەر ڕەگەکە بە[ی] کۆتایی هاتبێ (ی)ی ڕاناو لەناو [ی]ی ڕەگەکە ئەتوێتەوە و ڕاناوەکە هیچ سیمایێکی بۆ نامێنێ.

کڕی +ی ← کڕی
زەڕی + ی ← زەڕی

د- ئەگەر کاتی کارەکە لە ئێستای تەواودا Present Perfect بێت... لە ئەنجامی ڕووبەڕووکردنی مۆرفۆلۆجی Morphological Identification دەرئەکەوێ کە ڕاناوەکە قاڵبی (یە ... تی) ئەگرێتە خۆ.

هێناو ـ یە ... ـە ... تی

خواردوو ـ یە ... ـە ... تی

واتا ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک کە لەگەڵ ڕابردووی تێپەڕا دەرئەکەوێ ئەم چوار ئەلەمۆرفەی هەیە.

| ئەلەمۆرف | یاسای دەرکەوتنی |
| --- | --- |
| {y} | ئەگەر ڕەگ بە بزوێن کۆتایی هاتبێ |
| {î} | ئەگەر ڕەگ بە کپ کۆتایی هاتبێ |
| ø | ئەگەر ڕەگ بە {ی} کۆتایی هاتبێ |
| یە... تی | ئەگەر کاتەکە ئێستای تەواوبێ |

هـ- لەگەڵ کاری تێنەپەڕی ڕابردوودا... کەسی سێیەمی تاک سیمایێکی بینراوی نییە Zero morpheme (ø).

ئەو هات + ø
ئەو چوو +ø

و- لەگەڵ ڕستەی جووتێنراو Copulative کە ڕێزمانی هەندێ زمان بە(ڕستەی ناوی)ی ناوی ئەبات... کەسی سێیەمی تاکی کاتی ئێستا Present بە(ـە) خۆی دەرئەخا... وەک لە:

من ئازاد -م
تۆ ئازاد -یت
ئەو ئازاد -ە
ئێمە ئازاد -ین
ئێوە ئازاد -ن
ئەوان ئازاد -ن

هەموو ئەلەفۆرمەکانی ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک لەم نەخشەیەدا ڕوون کراونەتەوە:

| | کات | یاسای دەرکەوتنی |
|---|---|---|
| [illegible] | ئێستا | ات - یت - ا - ێ - ت - ø |
| | ڕابردووی تێپەڕ | y - î - ø - (یە ... تی) |
| | ڕابردووی تێنەپەڕ | ø |
| | ڕستەی جووتێنراو | ـە |

پەراوێزەکان:

١- شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجیی هەر زمانێ ئەبێ بەلای کەمی ئەم ئەرکانە بەجێ بهێنێ:
- دەستنیشانکردنی کەرەسە هەرە خاوەکانی مۆرفۆلۆجیی زمانەکە کە مۆرفیمەکانییەتی.
- دەستنیشانکردنی پێکهاتنی فۆنەتەکتیکیی مۆرفیمەکان.
- دەستنیشانکردنی ئەو یاسیانەی مۆرفیمەکان لێک ئەدەن بۆ داڕشتنی وشەکان.
- دەستنیشانکردنی ئەرکی مۆرفۆلۆجیی کەرەسە ناکەرتییەکان suprasegmental.
- دەستنیشانکردنی قاڵبە جیاوازەکانی هەمان مۆرفێم (ئەلەمۆرفەکانی) کە لە ئەنجامی کارتێکردنی بیئەی فۆنۆلۆجیی جیاوازەوە سەرهەڵئەدەن. ئەمە پەیوەندیی مۆرفۆلۆجی بەفۆنۆلۆجییەوە ئەخاتە ڕوو و یاساکانی بەمۆرفۆنیمیکی ناو ئەبرێن.
بەگوێرەی ئامانج و سنووری باسەکە، ئەشێ لایەنێکی یا بەشێکی لایەنێکی زمانەکە وەربگیرێ و

بەپێی (یەکێ یا هەموو) ئەو ئەرکانەی سەرەوە شی بکرێتەوە. بۆ نموونە گەر بمانەوێ راناوەکانی زمانی کوردی لە رووی مۆرفۆلۆجییەوە شی بکەینەوە ئەبێ ئەم هەنگاوانە بگرینە بەر:

أ- راناوە جودا و لکاوەکانی جیا کەینەوە... دوور لە هەموو جۆرە ئەرکێ.

ب- پێکهاتنی مۆرفۆلۆجییان (واتا مۆرفیمەکانیان) دەستنیشان کەین.

ج- ئەلەمۆرفەکانی هەر یەکێ لە راناوەکان دەستنیشان کەین و یاسا مۆرفۆفۆنیمەکان هەڵێنجین.

باسێکم لە ژمارە (١١٥)ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ساڵی ١٩٨٧دا بڵاوکردەوە بەناوی [رێزمانی کوردی - هەندێ شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجی] تیایا ئامانج و پێڕەو و تەکنیکی شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجیی راناوم خستەروو چاوێکی پێدا بخشێنێ[٤]:

تێبینییەک لە بارەی رەخنەکانی د. ئاورەحمانی حاجی مارفەوە کە پەیوەندیی بەمۆرفۆلۆجییەوە هەیە، لە بارەی مۆرفیمی سیفرەوەیە.

د. ئەورەحمان وای پیشان ئەدات کە (وریا عومەر ئەمین) مۆرفیمی سیفری لە (عەبدوڵلا حوسێن رەسووڵ)ەوە وەرگرتووە (رەخنەی نارەخنە - ١٩٩٨ - ل ٤٧).

ئەمەوێ ئەوە روونکەمەوە کە مۆرفیمی سیفر زاراوەیێکی زۆر باوی بواری مۆرفۆلۆجیای رێبازی (بونیەوی)ی بلومفیلدییە، لە سەرەتای سییەکانی سەدەی رابردوودا دارێژراوە بۆ ئەو مۆرفیمانەی کە دەنگیان هەیە و رەنگیان نییە و بۆ ماوەی زیاتر لە چل ساڵ، تا سەرهەڵدانی رێبازی چۆمسکی لە کۆتایی پەنجاکانا ئەزەرییەی مۆرفیمی سیفر بواری زمانەوانیی داگیر کردبوو و لە کێشەدارترین خاڵەکانی رێبازی بونیەوییەت بوو. لە هەزاران (ئەک سەدان) وتار و باس و لێکۆڵینەوە و کتێبی زمانەوانی لە هەموو جیهانا بەگەلێ زمان ناوی هاتووە و موناقەشە و هەرای لەسەر کراوە. یەکێکە لە کلیل و رێ پاککەرەوەکان بۆ سەرهەڵدانی رێبازی گوێزانەوە و بەسەری دەزووی پەیوەندیی نێوان بنچ deep strac- ture و سیما surface stracture ئەژمێررێ و چۆتە میتالانگویجی رێبازی چۆمسکی و دوای چۆمسکیش دەور و نرخی تایبەتیی خۆی لە دارشتنی یاسا مۆرفۆنیمەکانا هەیە... هتد.

(جگە لە نامەکانمدا... لە حەفتاکاندا) لە سەرەتای هەشتاکانیشەوە من زاراوەی مۆرفیمی سیفرم لە دەیان وتار و باسدا بەکارهێناوە بۆ نموونە:

١- لە ساڵی (١٩٨٢)دا لە ژمارە (٩)ی خولی (٢)ی گۆڤاری نووسەری کورددا.

٢- لە ژ (٢٤٩٣)ی رۆژی (١٩٨٤/٤/١١)ی رۆژنامەی (العراق)دا.

٣- لە ساڵی (١٩٨٦)دا لە ژمارە (٤٥)ی گۆڤاری (کاروان)دا. لە لاپەڕە (١١)ی ئەم وتارەمدا ئەڵێم.

وەک خۆی ئەیخەمە روو:

«ئێستا سەیری ئەم نموونانە بکە...

من چوو -م

تۆ چوو -یت

ئەو چوو - Ø

ئێمە چوو -ین
ئێوە چوو -ن
ئەوان چوو -ن
لە کەسی سێیەمی تاکدا... مانا و دەور هەیە، بەڵام قاڵب نییە.
زانایانی زمان بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتانە لە داڕشتن و دەستنیشانکردنی جۆری مۆرفیمەکان بابەتی (تی)یان خستۆتە خانەی مۆرفیمی بۆش empty morpheme و ئەوەی مانا و دەوری هەبێ و قاڵبی فیزیاوی نەبێ خستوویانەتە خانەی مۆرفیمی سیفر zero mopheme...».
قوتابیمان کاک عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسوڵ ئەمەی خستۆتە نامەکەیەوە (١٩٩٥) و لە لیستەی سەرچاوەکانیدا ناوی ئەم وتارە و وتاری ترم ئەهێنێ کە تیایانا ناوی مۆرفیمی سفر ئەهێنم. د، ئەورەحمان وای بۆچووە کە عەبدوڵڵا ڕەسوڵ دانەر و داهێنەری چەمک و زاراوەی مۆرفیمی سیفرە و من لەوم وەرگرتووە.
٢- بۆ ڕێککەوتن concord سەیری ئەم باسە بکەن: وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) ڕێککەوتن لە زماندا. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (٩٢).
٣- سەیری ئەم باسە بکەن:
وریا عومەر ئەمین (١٩٨٥) کەی (ات) و کەی (ێت). گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژ (٧٠).
٤- هەروەها سەیری ئەم باسانەشم بکەن:
أ- ڕوونکردنەوەیێک، گۆڤاری نووسەری کورد، ژ (٥) ساڵی ١٩٨٥.
ب- ڕەخنەی نارەخنە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١٤٠، ساڵی ١٩٩٧.
ج- پاشبەندی (ێ) لە ڕەخنەی نارەخنەدا... گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١٤٢)، ساڵی ١٩٩٨.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد - بەغدا، ژمارە (٢٩ و ٣٠)ی ساڵی ٢٠٠٢، لاپەڕە ٢٩١-٢٩٧ بڵاوکراوەتەوە.

# چەند تێبینییەک لە بارەی (نەرێ)وە

ئەوەی لە بارەی پێناسینی (نەرێ)وە باوە ئەوەیە... نەرێ چەمکێکی سیمانتیکییە وەک کەرەسەیێکی سینتاکسی لە ڕستەدا دەرئەکەوێ، بەجێ نەهێنانی ئەرکی کاری ڕستەکە ئەگەیێنێ. شیکردنەوە دەری ئەخا کە ئەم پێناسینە لە زۆر حاڵەتدا هەڵئەوەشێتەوە. زۆر جار دەرکەوتنی ئامرازی نەرێ ئەم چەمکە ناگەیێنێ و ئەم دەورە ڕێزمانییە ناگێڕێ. وەک لە:

١- ڕستەی پرسیاری (بەڵێ - نا) yes - no question بەزۆری بەشێوەی نەرێ ئاراستە ئەکرێ... کەچی لابردنی ئامرازی (نەرێ) هیچ کار لە واتا و ڕێزمانێتیی ڕستەکە ناکات.

أ- نان ناخۆیت؟

ب- نان ئەخۆیت؟

أ- ئازاد نەهات؟

ب- ئازاد هات؟

أ- ئەم وتارەت نەخوێندۆتەوە؟

ب- ئەم وتارەت خوێندۆتەوە؟

(ب)یەکان نەرێی (أ)کانن و هاوواتان.

٢- لە ڕستەی

کە نا بینم... ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا!

لابردنی ئامرازی نەرێ (نا) هیچ کار لە واتا و ڕێزمانییەتی ڕستەکە ناکات... واتاکەی وەک خۆی ئەمێنێتەوە.

کە بینیم... ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا.

٣- ڕستەی

نەکەی ئەتکوژم.

دوو مانای دژیەکی هەیە:

أ- ئەگەر بکەی ئەتکوژم.

ب- ئەگەر ئەکەی ئەتکوژم.

لە ڕستەی (ب)دا کە خورتێتی (الزام)کردنەکە ئەگەیێنێ ئامرازی (نەرێ) دەرکەوتووە... (واتا ئەبێ بیکا... نەک نەیکا).

٤- دەرکەوتنی ئامرازی (نەرێ) لەگەڵ ئاوەڵناوی (ڕادە) دار Intensifier (زۆر جوان... گەلێ دوور... هتد) هەرگیز واتای نەرێ ناگەیێنێ و تا ڕادەیەک چەمکی پێچەوانە ئەگەیێنێ. وەک لە:

ئەم کچە زۆر جوان نییە.

واتا جوانە... بەڵام تا ڕادەیەک...

## نەرێ و پێناسینی بەرکار

لە ڕووی ئەرکەوە... بەرکار ئەو کەسەیە یا ئەو شتەیە کە پێشوازیی کاری بکەری ڕستەکە ئەکات. یا کاری بکەرەکەی ئەکەوێتە سەر. وەک لە:

ئازاد ڕزگاری بینیوە.

(ڕزگار) بەرکارە چونکە کاری بینینەکە کە ئازاد بەئەنجامی داوە کەوتۆتە سەر (ڕزگار) کە بینراوە. بەڵام کە ئەو ڕستەیە ئەکرێ بە(نەرێ):

ئازاد ڕزگاری نەبینیوە.

لێرە (ڕزگار) هیچ کارێکی لە ئازادەوە بۆ نەکەوتۆتە سەر، بۆیە بەپێی پێناسینی سیمانتیکی (بەرکار) نابێ (ڕزگار) بەرکاربێ.

یەکێ لە ئەنجامە سەرەکییەکانی Klima (١٩٦٤) کە سەر بەڕێبازی چۆمسکییە، ئەوەیە کە ڕستەی سادە تەنیا یەک ئامرازی نەرێ قەبووڵ ئەکات. واتا ڕستەی سادە لە یەک ئامرازی نەرێ زیاتر وەرناگرێ.

لە زمانی کوردییا نموونەی وا هەیە کە دوو ئامرازی (نەرێ)ی تیا بەرچاو ئەکەوێ وەک لە:

من ناتوانم نەچم.

ئەم ڕستەیە مانای زۆر جیایە و پێچەوانەی ئەمە ناگەیێنێ.

من ئەتوانم بچم.

ڕستەی یەکەم (خورتێتی)ی obligation تیایە کەچی ڕستەی دووەم (ئارەزوویی)ی

optional تیایە. ئەم دوو چەمکە لەم نموونانەدا ڕوون ئەبنەوە.

من ناتوانم نەچم (ئەبێ بچم)

من ئەتوانم بچم (ئارەزووی خۆمە)

بە بەکارهێنانی یەک ئامرازی (نەرێ) جیاوازیی تر لە واتاکان دەرئەکەوێ.

من ئەتوانم نەچم.

من ناتوانم بچم.

بەڕەچاوکردنی ڕێبازی گوێزانەوەی چۆمسکی ئەبێ ئەم جۆرە ڕستانە لە بنجدا deep structure بەلێکدراو و ئاڵۆز لە قەڵەم بدرێن.

واتا ڕستەی (من ئەتوانم بچم) لە بنجدا ئەبێ لەم دوو ڕستەیە پێک هاتبێ:

١- من ئەتوانم.

٢- من ئەچم.

چەن یاسایێکی گوێزانەوە... ئەم دوو ڕستەیە لێک ئەدەن و ڕستەی سیما دێننە ئەنجام.

ڕستەی (من ناتوانم نەچم) ئەم بنجەی هەیە:

(ئەم بنجە زۆر درشتە و زۆر لایەنی نەخراوەتە ڕوو).

بەیاسای (هاولابردن) Equi-Deletion (من)ی پارستەکە لائەبرێ و زنجیرەیێک

یاسای گوێزانەوە دوو ڕستەکە لێک ئەدا و ڕستەی سیما دێنێتە ئەنجام.

لە چوارچێوەی ڕێبازی گوێزانەوەدا یاسای نەرێ لە کوردیدا ئەشێ بەم جۆرە دابڕێژرێ.

| SI: | x | - | NEG | - | Vs | x | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | 1 | | 2 | | 3 | 4 | |
| | | | | | | ⟶ | obl |
| SC: | 1 | | ∅ | | 2+3 | 4 | |

تێبینی: ل(٥٣-٥٩)ی سەرچاوە ژمارە (١) بەفراوانی ئەم ڕووەی ڕێزمانی کوردی ئەخاتە ڕوو.

سەرچاوەکان:


1- Amin, W. O. (1979) Aspects of the verbal construction in Kurdish - London University.

2- Klima, E. S. (1964) negation in English. In Foder and Kats (eds).

3- Mackenzie, D. N (1961) Kurdish dialect studies V-1 - London.

٤- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٣) نەرێ لە زمانی کوردیدا، ڕۆژنامەی العراق، ژ ٢٢٣٨.

٥- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦)، کۆڕی زانیاریی عێراق - بغداد.



* ئەم وتارە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد - بەغدا، ژمارە (٣١)ی ساڵی ٢٠٠٣، لاپەڕە ١٥٧-١٦١ بڵاوکراوەتەوە.

# پەیوەندی ڕاناو وفرمان لە کرمانجیی ژووروودا

لە پاڵ باسکردنی ڕاناو یا فرمـــان هەندێ لە زمانەوانان وایان لە قەڵەم داوە گوایا لە کرمـانجیی ژووروودا لە ڕابردووی تێپەڕدا ڕاناوی لکاو لەگەڵ فـرمـانا دەرناکەوێ، نموونەکانیشیان لەم بابەتەن.

من خار (من خواردم)

تە خار (تۆ خواردت)... هتد

ئەم بۆچوونە ڕاست نییە. لە کرمانجیی ژووروودا فرمـان لە هەموو حاڵەتێکا ڕاناوی لکاوی لە گەڵا دەرنەکەوێ... بەڵام لەبەر ئەوەی سەر بەو سیستەمە زمانی یەیە کەبە ئێرکەتیڤ Ergative ناوئەبرێن دەرکەوتن و دەرنەکەوتنی بەرکـار دەور ئەگێـڕێ لە دەرکەوتن و دەرنەکەوتنی ڕاناوی لکاو لە هەندێ حاڵەتدا. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دیاردەیە پێویستە ڕاناوە جودا و لکاوەکانی کرمانجیی ژووروو لەبەر چاو ابن.

| ژمارە | کەس | جودا ١ | جودا ٢ | لکاو |
|---|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من | ئەز | م |
| | ٢ | تە | تو | ی |
| | ٣ | وی/وێ | ئەو | - ،ت/ەت |
| کۆ | ١ | مە | ئەم | ین |
| | ٢ | وە | هوون | ن |
| | ٣ | وان | ئەو | ن |

وێنەی ژ (١)

ڕاناوی لکاو لە کەسی سێیەمی تاکدا بۆ ڕابردوو هیچ نیشانەیێکی نییە لە داهاتوودا (ت/ەت) دەرنەکەوێ.

پەیوەندیی ڕێکەوتن لە نێوان بەشە بنجییەکانی ڕستە (بکەر - بەرکار - فەرمان)، لە کرمانجیی ژووروودا لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

واتا لە ڕابردووی تێپەڕدا فرمان ڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارەی بەرکار وەرئەگری.

لە هەموو حاڵەتێکی تردا فرمان ڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارەی بکەر وەرئەگرێ.

لە ڕستەی ژ (١)دا (ئاهەنگ و ڕزگار) کە بەرکارە لابیرێ ڕاناوی لکاویش (ن) لەگەڵیا لانەچێ و نەبێ بە.

ئازاد دیت (ئازاد بینی).

(ئەز) کە ڕاناوێکی جودای سەر بەکەسی یەکەمی تاکە بخرێتە شوێنی، فرمان ڕاناوی لکاوی (م) وەرئەگرێ.

ئازاد ئـەز دیتم (ئازاد منی بینی).

ات ات

لە کەسی سێیەمی تاکدا ڕاناوی لکاو هیچ نیشانەیێکی بۆ ڕابردوو نییە، بۆیە کە بەرکار لە کەسی سێیەمی تاکدا بێت فرمان هیچ ڕاناوێکی لکاوی لەگەڵا دەرناکەوێ

من ئـازاد دیـت - (من ئازادم دی)

٣ت ٣ت

ئازاد ئەو هەنارد - (ئازاد ئەوی نارد)

٣ت ٣ت

وەک لە وێنەی ژمارە (١)دا دەرئەکەوێ دوو جۆر ڕاناوی جودا لە کرمانجیی ژووروودا هەیە دەرکەوتن و دەوریان لە ڕستەدا بەستراوە بەکات (ڕابردوو یا داهاتوو) و جۆری فەرمان (تێپەڕ یا تێنەپەڕ).

١- لە ڕستەی فرمان تێپەڕا

أ- کۆمەڵی یەکەم لە ڕابردوودا وەک بکەر و لە داهاتوودا وەک بەرکار دەرئەکەوێ.

ب- کۆمەڵی دووەم لە ڕابردوودا وەک بەرکار و لە داهاتوودا وەک بکەر دەرئەکەوێ.

٢- کۆمەڵی یەکەم هەمیشە وەک (بەرکاری ناڕاستەوخۆ) دەرئەکەوێ.

دەوری ڕاناوە جوداکان لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

| | ڕابردوو | | داهاتوو | |
|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| تێپەڕ | ١ | ٢ | ٢ | ١ |
| تێنەپەڕ | ٢ | | ٢ | |

کۆمەڵی یەکەم هەرگیز لەگەڵ فرمانا ڕێک ناکەوێ. کە دەوری بکەری ئەبینێ فرمان لەگەڵ بەرکارا ڕێک ئەکەوێ:

کە دەوری بەرکاری ئەبینێ فرمان لەگەڵ بکەرا ڕێک ئەکەوێ.

سەرچاوەکان:

١- وریا عومەر ئەمین - ڕاناو لە کرمانجیی ژووروودا - هاوکاری ژ (٦١٥) [١٩٨١/١٢/١٠].

٢- کۆڕی زانیاری کوردی - ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەغدا (١٩٧٦).

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری کاروان - ئەمیندارێتی گشتی بۆ ڕۆشنبیری و لاوان - هەولێر، ژمارە (٢)ی سالی ١٩٨٣، لاپەڕە ٤١-٤٣ بلاوکراوەتەوە.**

# ڕێزمانی ڕاناوی لکاو

١- ئە - تان - نێر - ین (ئێمە ئێوە ئەنێرین)

بەرکار بکەر

٢- ئە - تان - نارد - ین (ئێوە ئێمەتان ئەنارد)

ئەم دوو ڕستەیە لە قالبی وشەیەکدا ڕێژراون هەردوو بریتین لە (بکەر) و (بەرکار) و (فەرمان). بکەر و بەرکار تیایانا بەڕاناوی لکاو دەربڕاون.

ڕستەی یەکەم - کاتەکەی داهاتووە

ڕستەی دووەم - کاتەکەی ڕابردووە

ئەوەی سەرنج ڕائەکێشێ ئەوەیە کاتی فەرمانەکە دەوری (بکەر) و (بەرکار)ی ئاڵوگۆڕ کرد.

ئەم وتارە هەوڵدانێکە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دیاردەیەی زمانی کوردی و داڕشتنی ڕێزمانەکەی.

لە زمانی کوردیدا (خواروو) بکەر و فرمان ڕێک ئەکەون لە کەس و ژمارەدا، واتا بکەر لە چ کەس و ژمارەیەکدا بێت، فرمانیش ڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارە وەرئەگرێت. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە ئەبێ ڕاناوە جودا و لکاوەکان بەپێی کەس و ژمارە لەبەر چاوابن.

| ژمارە | کەس | جودا | ڕاناوی لکاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | ١ | ٢ | ٣ |
| تاک | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | - | ات/ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

وێنە ژمارە (١)

هەرچەندە جیاوازیی نێوان کۆمەڵی (٢) و (٣) تەنیا لە کەسی سێیەمی تاک دایە. بۆ مەبەستی شیکردنەوە جیایان نەکەینەوە[1].

جۆر و کاتی فرمان دەور نەگێڕن لە هەڵبژاردنی ڕاناوی لکاو. (مەبەست لە جۆری فرمان تێپەڕ یا تێنەپەڕە. مەبەستیش لەکاتی فرمان، ڕابردوو یا داهاتووە).

چۆنیەتی دەرکەوتنی ڕاناوی لکاو لەگەڵ فرمانا بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

وێنە ژمارە (٢)

واتا: گەر فرمانەکە لە ڕابردووی تێپەڕدا بوو کۆمەڵی یەکەم وەرئەگرێ.

ئێمە ناسی - مان.

١ک ١ک

ئەوان خوارد - یان.

گەر فرمانەکە لە ڕابردووی تێنەپەڕدا بوو بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەگەڵ بکەرا کۆمەڵی دووەم وەرئەگرێ.

ئەوان نووست - ن.

٣ک ٣ک

ئێمە نووست - ین.

١ک ١ک

گەر فرمانەکە لەکاتی داهاتوودا بوو... چ تێپەڕبێ چ تێنەپەڕ کۆمەڵی سێیەمی لەگەڵا دەرئەکەوێ بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەگەڵ بکەرا.

ئەو ئەخو - ات.

٣ت ٣ت

ئێمە ئەنوو - ین.

١ک ١ک

بۆ هەڵبژاردنی ڕاناوی لکاو بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن یەکەم - سەیری وێنە ژمارە (٢) ئەکەین. بەپێی کات و جۆری فەرمانەکە کۆمەڵەکە دەستنیشان ئەکەین ئینجا بەپێی کەس و ژمارەی بکەرەکە، بەیارمەتیی وێنە ژمارە (١) ڕاناوە لکاوەکە ئەدۆزینەوە بۆ نموونە لە:

ئێمە نارد -.

(نارد) کە ڕەگی فەرمانە، لە ڕووی جۆرەوە (تێپەڕە) و لە ڕووی کاتەوە (ڕابردووە). بەپێی وێنە ژمارە (٢) ڕاناوی لکاو ئەبێ لە کۆمەڵی یەکەمەوە وەرگیرێ. (ئێمە) کە بکەرە لە کەسی (یەکەمی کۆ) دایە. بەرامبەرەکەی بەپێی وێنە ژمارە (١)، (مان)ە. ئەلکێنرێ بەڕەگی فەرمانەکەوە و ڕستەکە ئەبێتە:

ئێمە نارد - مان.

هەروا لە:

ئەوان ئەنوو -.

(نوو) ڕەگی داهاتووی (نوستن)ە. لە ڕووی جـۆرەوە (تێنەپەڕە)، لە ڕووی کـاتەوە (داهاتوو)ە، بەهۆی وێنە ژمـارە (٢) ڕاناوی لکاو نەبێ لە کـۆمـەڵی (سـێـیـەم)ەوە وەرگـیـرێ. (ئەوان) کـە بکەرە لە کـەسـی (سـێـیـەمی کـۆ) دایە، بەپێی وێنە ژمـارە (١) بەرامبەرەکەی (ن)ە. ڕستەکە ئەبێ بە:

ئەوان ئەنوو - ن.

٣ک ٣ک

یەکێ لە تایبەتییەتەکانی کۆمەڵی یەکەمی ڕاناوە لکاوەکان واتا کۆمەڵی (م - ت - ی - مان - تان - یان) ئەوەیە شوێنی لە ڕستەدا ئەگۆڕێ بەپێی قالبی ڕستەکە.

ئەگەر ڕستەکە بەرکاری ڕاستەوخۆی هەبوو ڕاناوی لکاو بەمەوە ئەلکێ وەک لە:

ئێمە گوڵ - مان بۆ ئێوە ئەنارد.

کەی ڕستە بەرکاری ڕاستەوخۆی نەبوو ئەوسا ڕاناوی لکاوی کۆمەڵی یەکەم بەبەرکاری ناڕاستەوخۆوە ئەلکێ.

ئێمە بۆ ئێوە - مان ئەنارد.

بەلابردنی بەرکاری ناڕاستەوخۆش، پرپۆزیشن ئەبێ بە پەناگەی.

ئێمە بۆ - مان ئەنارد.

بەلابردنی پرپۆزیشنیش پێشگر ئەبێ بەپەناگەی:

ئێمە ئە -مان - نارد.

کەی پێشگریش نەبوو، ئەوسا بەڕەگی فەرمانەکەوە ئەلکێ.

ئێمە نارد - مان.

بەکورتی [کۆمەڵی یەکەمی ڕاناوە لکاوەکان بەیەکەمی ئەم بەشانەی ڕستەوە ئەلکێ بەم ڕیزە:

١- بەرکاری ڕاستەوخۆ[٢]
٢- بەرکاری ناڕاستەوخۆ
٣- پرپۆزیشن
٤- پێشگری یەکەم
٥- ڕەگی فەرمان ... یاسا ژمارە(١)]

{كۆمەڵی دووەم و سێیەم هەمیشە بەرەگی فەرمانەوە نەلكێن ...... یاسا ژمارە (٢)}

جگە لە دەوری (بكەری) ئەم ڕاناوە لكاوانە دەوری (بەركاری)ش ئەبینن. بەركاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ و (ناوی خاوەن) ئەشێ بەڕاناوێكی لكاو جێگیر بكرێن.

لەبەر ئەوەی باس باسی دەوری بەركارییە بۆیە تەنیا ئەو ڕستانە ئەگرێتەوە كە فەرمانەكانیان تێپەڕە.

وەك لە سەرەوە ڕوون كرایەوە، كۆمەڵی یەكەم لەگەڵ ڕابردووی تێپەڕ و كۆمەڵی سێیەم لەگەڵ داهاتووی تێپەڕا دەوری بكەری ئەبینن. كۆمەڵی دووەم و سێیەمیش وەك یەكن تەنیا لە كەسی سێیەمی تاكدا نەبێ.

بۆ دەوری بەركاری، ڕاناوە لكاوەكان دابەش ئەكەینە سەر كۆمەڵی (A) و (B) بەم جۆرە.

| B | | A |
|---|---|---|
| ٣ | ٢ | ١ |
| م | م | م |
| یت | یت | ت |
| ات/ێت | – | ی |
| ین | ین | مان |
| ن | ن | تان |
| ن | ن | یان |

كۆمەڵی (A) كە دەوری (بكەری) لە ڕابردوودا ئەبینێ... دەوری (بەركاری) لە داهاتوودا ئەبینێ.

كۆمەڵی (B) كە دەوری (بكەری) لە داهاتوو ئەبینێ... دەوری (بەركاری) لە ڕابردوودا ئەبینێ.

دەركەوتنی ڕاناوە لكاوەكان وەك دەوری (بكەری) و (بەركاری) لەگەڵ فەرمانی تێپەڕا لەم وێنەیەدا ڕوون كراوەتەوە:

بۆ جێگیرکردنی بەرکاری ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ یا ناوی خاوەن بەڕاناوێکی لکاو ئەم هەنگاوانە ئەگرینە بەر:

١- سەیری ڕاناوە لکاوەکە ئەکەین کە دەوری بکەری بینیوە لە کامە کۆمەڵ بوو بۆ بەرکاری ڕوو لە کۆمەڵەکەی تر ئەکەین. واتا - گەر لە کۆمەڵی (A)یەوە بوو بۆ (بەرکاری) ڕوو لە (B) ئەکەین و بەپێچەوانەوە.

٢- بەپێی کەس و ژمارەی ئەو بەشەی جێگیر ئەکرێ - بەیارمەتی وێنە ژمارە (١)، ڕاناوێکی لکاو هەڵئەبژێررێ.

٣- بەپێی یاسا ژمارە (١) و (٢) شوێنی ڕاناوەکە لە ڕستەکەدا دەسنیشان ئەکرێ.

بۆ نموونە لە ڕستەی:

ئێمە تۆ بۆ ئەو ئەنێرین.

بەرکاری ڕاستەوخۆ (تۆ) یا ناڕاستەوخۆ (ئەو) یا هەردووکیان بەیەکەوە ئەشێ بەڕاناوی لکاو جێگیر بکرێن.

١- ئەو ڕاناوە لکاوەی دەوری (ڕێکەوتن) واتا (بکەری)ی بینیوە (ین) لە کۆمەڵی (B)یەوەیە. واتا - بۆ بەرکاری ڕوو لە کۆمەڵی (A) ئەکەین.

٢- (تۆ) کە لە کەسی دووەمی تاکدایە (٢ت) بەپێی وێنە ژمارە (١) لە کۆمەڵی یەکەم بەرامبەرەکەی (ت)یە. ئەم (ت)یە شوێنی (تۆ) ئەگرێ.

٣- بەپێی یاسا ژمارە (١). (ت) کە لە کۆمەڵی یەکەمەوەیە دوای لابردنی بەرکاری ڕاستەوخۆ بە بەرکاری ناڕاستەوخۆوە ئەلکێ. بەم جۆرە ڕستەکە ئاوای لێ دێ:

کە بەرکارە ناڕاستەوخۆکە بەڕاناوێکی لکاو جێگیر ئەکرێ:

گەر فرمانی ڕستە کاتەکەی ڕابردوو بێ:

أ- کە بەرکاری ڕاستەوخۆ بەڕاناوێکی لکاو جێگیر ئەکرێت.

ب- كە بەرکاری ناڕاستەوخۆ بەڕاناوێکی لکاو دەربڕێ.

ئەوان منیان بۆ نارد - یت.

بۆ جێگیرکردنی ناوی خاوەن بەڕاناوێکی لکاو سەیری ئەم ڕستەیە بکە:

تۆ ئۆتۆمبێلەکەی منت فرۆشت.

(من) کە ناوی خاوەنە ئەشێ بەهەمان پەیڕەو بەڕاناوێکی لکاو جێگیر بکرێ. ئەو ڕاناوەی دەوری بکەری بینیوە (ت) لە کۆمەڵی (A)یەوەیە. چونکە فەرمانەکە ڕابردووی تێپەڕە.

٢- ناوی خاوەن (من) لە کەسی یەکەمی تاکدایە لە کۆمەڵی (B) بەرامبەرەکەی (م)ە.

٣- بەپێی یاسا ژمارە (٢) کۆمەڵی (١) و (٢) لە ڕاناوە لکاوەکان هەمیشە بەڕەگی فەرمانەوە ئەلکێن بەم جۆرە ڕستەکە ناوای لێ دێ.

تۆ ئۆتۆمبیلەکەت فرۆشتم.

{(ی) که دەوری بەستنی ناوی خاوەن بەبەرکاری ڕاستەوخۆوەی بینی دوای لاچوونی ناوی خاوەن دەورەکەی نامینێ و لائەچێ}.

{گەر بەرکاری ناڕاستەوخۆ بەڕاناوێکی لکاو جێگیر کرا... پرپۆزیشنی (بە) ئەبێ بە(پێ) و (لە) ئەبێ بە(لێ)...

یاسا ژمارە (٣)}

بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ئەشێ هەردووک پێکەوە بەڕاناوی لکاو جێگیر بکرێن.

أ- گەر فرمانەکە لەکاتی داهاتوودا بێ هەردوو ڕاناوە لکاوەکە بەپرێپۆزیشنەوە ئەلکێن بەم جۆرە:

پرێپۆزیشن - بەرکاری ڕاستەوخۆ - بەرکاری ناڕاستەوخۆ ...... یاسای ژمارە (٤)

ب- گەر فرمانەکە لەکاتی ڕابردوودا بێ... هەردوو ڕاناوە لکاوەکان بەڕەگی فەرمانەوە ئەلکێن بەم جۆرە:

ڕەگی فەرمان - بەرکاری ڕاستەوخۆ - بەرکاری ناڕاستەوخۆ ... یاسای ژمارە (٥)

(جێگیرکردنی هەردوو بەرکار پێکەوە بەڕاناوی لکاو زۆر کەمە لە قسەکردنا)

کەی دوو ڕاناوی لکاو بەیەکەوە بەڕەگی فەرمانەوە لکان یەکێکیان دەوری (بکەری) و ئەوی تر (بەرکاری) بینی ڕیزبوونیان بەم جۆرە ئەبێ.

ڕەگی فەرمان - بکەر - بەرکار ......... یاسای ژمارە (٦)

تەنیا گەر (بکەر) لە کەسی سێیەمی تاکدا بێت. لەم حاڵەتەدا ڕیزبوونیان بەم جۆرە ئەبێ:

ڕەگی فەرمان - بەرکار - بکەر ...... یاسا ژمارە (٧)

بەجێگیرکردنی بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەی آ و ب بەپێی ئەو یاسایانەی پێشکەش کران ڕوون ئەبێتەوە بۆ و چۆن دەوری (بکەر) و (بەرکار) ئاڵوگۆڕ ئەبێ بە گۆڕینی کاتی فەرمانەکە:

پەراوێزەکان:

١- وەک دەرئەکەوێ ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی کۆمەڵی سێیەم خۆی بە(ات) یا (ێت) دەرئەخا. ئەگەر ڕەگی کاتی داهاتووی فرمانەکە بە (ۆ) یا (ـە) کۆتایی هاتبێ ئەوە ڕاناوە لکاوەکە قاڵبی (ات) ئەگرێتەخۆ. دوای ئەوەی (ۆ) ئەبێ بە (و)ی کونسونانت و (ـە) ئەتوێتەوە.

لە هەموو حاڵەتێکی تردا ڕاناوەکە خۆی بە(ێت) دەرئەخات.

ئەو ئەمرێت.

ئەو ئەچێت

ئەو ئەنوێتە... هتد

٢- یا بەو وشانەی لە زانستی زمانا بە Quantither ناو ئەبرێن وەک (زۆر، کەم هەندێ... هتد) وەک:

من زۆر - م قسە پێ وت.

ئێمە هەندێک - مان دیاری بۆ هێنا.

سەرچاوە:

1- Amin, W. O (1979) Aspects of Verbal construction in Kurdish. London Uni versity.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨١) «ڕاناو لە کرمانجیی خوارووداء ڕۆژنامەی هاوکاری ژ ٦١٦ و ٦٣٧.

٣- کۆڕی زانیاری کورد (١٩٧٦) «ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی».

سوپاس بۆ کاک عەزیز ڕەشید حەریری کە لەم وتارە و ئەوەی لە ژمارە دووی کاروان بلاوکرایەوە ئەرکێکی زۆری کێشا...

**٭ ئەم وتارە لە گۆڤاری کۆڕی کاروان - ئەمیندارێتی گشتی بۆ ڕۆشنبیری و لاوان - هەولێر، ژمارە (٨)ی ساڵی ١٩٨٣، لاپەڕە ٦٨-٧٤ بلاوکراوەتەوە.**

# فۆنۆلۆجی

فۆنەتیک ئەو لقەی زانستی زمانە کە لە دەنگەکانی زمان ئەکوڵێتەوە.

دەنگەکانی زمان ئەشێ لە سێ ڕووەوە سەیریان بکرێ و لێیان بکۆڵرێتەوە:

١- لە ڕووی دروستکردنەوەوە... ئەمە میکانیزمیەتی ئەندامانی ناخاوتن ئەگرێتەوە.

٢- لە ڕووی گواستنەوەی دەنگەکان لە هەوادا بەهۆی ئەو شەپۆلانەی بەرەوتی بای لە سییەکانەوە هاتوو و جوولانەوەی بەشەکانی زار دروست ئەکرێن.

٣- لە ڕووی وەرگرتنی ئەم دەنگانەوە بەگوێ و شیکردنەوەیان لە مێشکدا. ئەمەیان میکانیزمیەت و فسیۆلۆجییەتی گوێ و مێشک ئەگرێتەوە.

بەم جۆرە فۆنەتیک بۆتە سێ لقی سەربەخۆ. هەریەکە پەیڕەو و ئامانجی تایبەتیی خۆی هەیە.

لەبەر هەندێ هۆ کە پەیوەندیی بەسروشت و ئامانجی زانستی زمانەوە هەیە، بەشێوەیەکی گشتی بایەخ زیاتر بەلقی یەکەم دراوە. دوو لقەکەی تر تازە داهاتوون و پەیوەندییان زۆرتر بەمەیدانەکانی تری زانستەوەی وەک فیزیا و کۆمپیوتەرەوە... هتد هەیە.

ئەم وتارە هەوڵدانێکە بۆ پێناسینی فۆنەتیک و دەرخستنی پەیوەندی نێوان فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی.

فۆنەتیک لە کەرەسە (مادی)یە هەرە خاوەکانی زمان ئەکوڵێتەوە کە ئەو تاکە دەنگانەن بەهۆی ئەندامانی ناخاوتنەوە دروست ئەکرێن لە ئەنجامی کۆمەڵە جوولانەوەیێک لە پەردەی ناوبنچکەوە دەست پێ ئەکا و سییەکان و بۆری هەناسە و قوڕگ و بەشەکانی زار و لووت هەموو تیایا بەشداری ئەکەن.

تایبەتییەتی هەر دەنگێک و هەڵوێستی ئەندامانی ناخاوتن لە کاتی دروستکردنیدا دەستنیشان ئەکات.

فۆنەتیک ڕوونی ئەکاتەوە - بۆ نموونە - دەنگی (ب) و (ک)... هتد چۆن دروست ئەکرێن و چین ئەو ڕووداوانەی ئەندامانی ناخاوتن کە وا ئەکەن ئەم دەنگانە دروست بکرێن. چییە (ب) لە (پ) جیا ئەکاتەوە؟... هتد.

فۆنەتیک تەنیا لەو دەنگانە ناکۆڵێتەوە کە لە نووسینا بەپیت دەرئەبڕێن. بەڵکو لەو کەرەسە زمانییانەش ئەکوڵێتەوە کە زۆر گرنگن لە زمانا بەلام لە نووسینا هیچ نیشانەیەکیان بۆ دانەنراوە وەک هێز stress، ئاواز intonation تۆن Tone و Pitch و Juncture هتد... سروشت و چۆنیەتی دروستکردنی ئەم کەرەسانە دەستنیشان ئەکات.

فۆنەتیک لەمانە هەموو ئەکوڵێتەوە بێ ئەوەی بایەخ بەوە بدا ئەم دەنگانە سەر بە چ زمانێکن. واتا - فۆنەتیک شتێکی گشتییە.

ئەو یاسایانەی فۆنیمەکانی زمان دەستنیشان ئەکەن و لەناو قاڵبی برگەی فۆنەتیکیدا لێکیان ئەدەن بۆ پێکهێنانی برگەی فۆنۆلۆجی و هۆی پەیابوون یا توانەوەی هەندێ دەنگ لە هەندێ حاڵەتا پیشان ئەدا، ئەمانە هەموو بەیاسا فۆنۆلۆجییەکان ناو ئەبرێن.

هەر زمانەی کۆمەڵە یاسایەکی فۆنۆلۆجیی تایبەت بەخۆیەوەی هەیە.

١- فۆنیمەکانی دەستنیشان ئەکات.

٢- لەناو قالبی برگەی فۆنەتیکیدا ئەم فۆنیمانە لەیەک ئەدا بۆ پێکهێنانی برگەی فۆنۆلۆجی.

٣- لە ئەنجامی لەیەکدانی ئەم فۆنیمانە لە هەندێ حاڵەتا - هەندێ دەنگ پەیا ئەبێ یا ئەتوێتەوە.

واتا فۆنۆلۆجی شتێکی تایبەتییە.

بۆ ڕوونکردنەوەی جیاوازیی نێوان فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی. ئەم بەراوردییە ئەخەینە ڕوو.

زمانی کوردی و عەرەبی[1] لەم شەش دەنگانەدا هاوبەشن [ر - ڕ - س - ص - ل - ڵ] وەک لەم نموونانەدا دەرئەکەوێ:

| کوردی | دەنگ | عەرەبی |
|---|---|---|
| پەری | ر | برد |
| ڕەنگ | ڕ | حر |
| سەوز | س | سماء |
| صەگ | ص | صباح |
| لانک | ل | لیل |
| گوڵ | ڵ | نضاڵ |

ئەوەی سەرنج ڕائەکێشێ ئەوەیە لە سیستەمی نووسینی زمانی کوردییا (ر) و (ڕ) جیا

کراونەتەوە کەچی لە هی عەرەبییا جیا نەکراوەتەوە و بۆ هەردووک یەک نیشـانە تەرخان کراوە.

هۆی جیاکردنەوەیان لە زمانی کوردییا ئەوەیە ئەم دوو دەنگە لەم زمانەدا دوو شتی جیا و دوو نرخی جیاوازیان هەیە چونکە ئەتوانن لەهەمان بینەدا دەرکەون و کار لە مانا بکەن. وەک لەم نموونانەدا دەرئەکەوێ

| | |
|---|---|
| برین | بڕین |
| کەر | کەڕ |
| وەرین | وەڕین |
| پەری | پەڕی ...... هتد |

واتا پەیوەندیی نێوان (ر) و (ڕ) وەک پەیوەندیی نێوان (س) و (ف) وایە:

کە [س / ر] کەس / کەر      کە [ف / ڕ] کەف / کەڕ

لە نووسینی عەرەبییا بۆ ئەم دوو دەنگە جیاوازە (ر - ڕ) یەک نیشـانە تەرخان کراوە. چونکە بەدووان یەک نرخی تیـا پیشـان نەدەن. هیچ وشەیێ لەم زمـانەدا نادۆزرێتـەوە ئەم دوو دەنگەی تیـا ئالوگۆڕ بکرێ مـانا بگۆڕێ. ئەو جیـاوازیـەی لە نێـوانیانا هەیە ئەنجـامی کـارتێکردنی ئەو بینـە جیـاوازانەیە کە تیـایا دەرئەکەون. بەم جۆرە (ر) و (ڕ) لە زمـانی عەرەبییا دوو شێوەی جیای هەمان فۆنیمن و لە زمانی کوردییا دوو فۆنیمی سـەربەخۆن.

| فۆنیم | کوردی | دەنگ | عەرەبی | فۆنیم |
|---|---|---|---|---|
| /ر/ | پەری | [ر] | برد | /ر/ |
| /ڕ/ | پەڕی | [ڕ] | حر | |

// نیشانەیە بۆ فۆنیم

[ ] نیشانەیە بۆ دەنگ

بەپێچەوانەوە... دەنگی (س) و (ص) لە زمـانی کوردییا دوو شێوەی جیـاوازی هەمـان فۆنیمن... جیاوازیی نێوانیان ئەنجامی ئەو بینـە جیاوازانەیە کە تیایا دەرئەکەون. چونکە

هیچ وشەیێک لە زمانی کوردییا نادۆزرێتەوە بەناڵوگۆڕکردنی ئەم دوو دەنگەی تیا کار لە مانا بکات. کەچی لە زمانی عەرەبییا ئەتوانن لەهەمان بینەدا دەرکەون و کار لە مانا بکەن. وەک لەم نموونانەدا دەرئەکەوێ.

سلب صلب

عسیر عصیر

سار صار

مس مص

سهر صهر ...... هتد

بەم جۆرە ئەم دوو دەنگە لە زمانی عەرەبییا دوو فۆنیم و لە زمانی کوردییا یەک فۆنیم پێک ئەهێنن.

بەهەمان پەیڕەو (ل) و (ڵ) لە زمانی عەرەبییا دوو شێوەی جیای هەمان فۆنیمن و لە زمانی کوردییا دوو فۆنیمن، چونکە ئەتوانن لەهەمان بینەدا دەرکەون و کار لە مانا بکەن.

چل چڵ

گەل کەڵ

پەلە پەڵە

گول گوڵ

| فۆنیم | کوردی | دەنگ | عەرەبی | فۆنیم |
|---|---|---|---|---|
| /ل/ | چل | [ل] | امل | ل |
| /ڵ/ | چڵ | [ڵ] | ظلم | |

بەبەراوردکردنی زمانی کوردی و عەرەبی لەم شەش دەنگانەدا لە لێڤڵی فۆنەتیکی و فۆنۆلۆجی ئەم ئەنجامانەمان دەس ئەکەوێ.

واتا ئەم شەش دەنگە هاوبەشە لە لێڤڵی فۆنەتیکیدا، (پێنج) فۆنیم لە زمانی کوردییا و (چوار) فۆنیم لە زمانی عەرەبییا لە لێڤڵی فۆنۆلۆجیدا پێک ئەهێنن.

لەژێر تیشکی ئەوەی باسکرا... پێناسینی فۆنیم و پەیوەندیی بەدەنگ و پیتەوە بەم جۆرە دەستنیشان ئەکرێ[٢].

[کۆمەڵە دەنگێکی جیاواز گەر لەناو سیستەمی زمانێکا یەک نرخ پێشان بدەن، ئەم دەنگانە هەموو لەم زمانەدا یەک فۆنیم پێک ئەهێنن. بۆ هەر فۆنیمەی، بۆ مەبەستی نووسین، نیشانەیێ دائەنرێ بەپیت لە قەڵەم ئەدرێ. واتا پیت دەنگ نانووسێ بەڵکو فۆنیم ئەنووسێ فۆنیمیش لەوانەیە کۆمەڵە دەنگێ بنووسێ. ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە فۆنیم شتێکی (مجرد)ە].

پەیوەندیی نێوان دەنگ و فۆنیم و پیت لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

وەک فۆنیمی /س/ لە زمانی کوردییا

وەک لە سەرەوە باس کرا... فۆنۆلۆجی (بەلای کەمی) سێ جۆر یاسا ئەنوێنێ. یەکەم ئەوە بوو باس کرا کە بەهۆیەوە فۆنیمەکانی زمان دەسنیشان ئەکرێن.

جۆری دووەمی یاسا فۆنۆلۆجییەکان ئەوانەن کە لەناو قالبی فۆنەتیکیدا فۆنیمەکان لەیەک ئەدەن بۆ دروستکردنی بڕگەی فۆنۆلۆجی.

تا ئێستا زانستی زمان بەهەموو قوتابخانەکانییەوە نەیتوانیوە پێناسێنێکی بێ کەلەبەری بڕگە پێشکەش بکات. بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆری لێ جیا کردۆتەوە.

یەکەم -بڕگەی فۆنەتیکی- ئەم جۆرەیان گشتییە. هەموو زمانانی جیهان تیایا بەشدارن. پەیوەندیی بەفسیۆلۆجییەتی هەناسە وەرگرتن و چۆنیەتی کارکردنی ئەندامانی ئاخاوتنەوە هەیە. لەناو چوارچێوەی ئەم قالبە گشتییەدا زمانەکان جیاوازی پێشان ئەدەن لە چۆنیەتی لەیەکدانی فۆنیمەکانیان. ئەم لەیەکدانە تایبەتییە بڕگەی فۆنۆلۆجی -کە جۆری دووەمە- پێک ئەهێنێ.

لە هەموو زمانێکا ناووکی بڕگە ڤاولێکە لەگەڵ ئەم ڤاووڵەدا ئەشێ چەن کۆنسونانتێ دەرکەوێ. ژمارەی ئەو کۆنسونانت و جۆری ڕیزبوون و دەرکەوتنیان بەیەکەوە لە زمانەکانا جیاوازن. بۆ نموونە لە بڕگەی زمانی کوردییا لە یەک تا چوار کۆنسنانت ئەشێ لەگەڵ ڤاولا لە بڕگەدا دەرکەوێ. هەرگیز لە دوو کۆنسونانت زیاتر ناکەوێتە لایەکی ڤاوڵەکەوە. لە بڕگەی زمانی ئینگلیزییا ئەشێ پێنج کۆنسونانت دەرکەوێ گەورەترینیان ئەوەیە کە سێیان ئەکەوێتە پێش ڤاوڵەکە و دووانیان ئەکەوێتە دوای. لە هەر زمانەی هەندێ فۆنیم هەن هەرگیز بەیەکەوە دەرناکەون لە پێش یا دوای ڤاوڵی بڕگەدا... هتد. ئەو یاسایانەی دەرکەوتن و ڕیزبوونی کۆنسونانتەکان لەناو قالبی بڕگەدا دەستنیشان ئەکەن یاسای فۆنۆلۆجین.

جۆری سێیەمی یاسا فۆنۆلۆجییەکان ئەوانەن کە لە ئەنجامی لەیەکدانی فۆنیمەکان -لە

هەندێ حاڵەتا- دەنگ هەیە ئەتوێتەوە. وەک توانەوەی (ە)ی ئامرازی پێناسین (ەکە) کە (ان)ی کۆی ئەچێتە سەر.

کوڕەکە + ان ——— کوڕەکان

حاڵەتی واش هەیە لە ئەنجامی لەیەکدانی فۆنیمەکان هەندێ دەنگ پەیا ئەبێ... وەک دەرکەوتنی (ی) کە فەرمانی بێ هێز (ە) ئەچێتە سەر ئەو وشانەی بەڤاوڵ کۆتاییان دێ.

ئەو مامۆستا - ە ——— ئەو مامۆستایە

یا پەیابوونی (تی) کە ڕاناوی هەیبی کەسی سێیەمی تاک (ی) و فەرمانی بێ هێز (ە) دەکەونە پاڵ یەک.

ئەو
برا - م - ە
برا - ت - ە
برا - ی - ە (تی) - برایەتی
برا - مان - ە
برا - تان - ە
برا - یان - ە

هەر زمانەی کۆمەڵە یاسایەکی دەستنیشان کراوی هەیە بۆ پەیابوون و لەناوچوونی هەندێ دەنگ لە ئەنجامی لەیەکدانی فۆنیمەکانی. ئەم یاسایانە بەیاسای فۆنۆلۆجی دەرئەبڕێن.

پەراوێزەکان:

١- زمانی عەرەبیمان هەڵبژارد بۆ ئەم بەراوردییە چونکە زۆربەی خوێنەران شارەزای ئەم زمانەن. هەچ دوو زمانێکی تر ئەشێ بۆ ئەم جۆرە بەراوردییە هەڵبژێررێ.

٢- لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد. بەرگی نۆیەم - ساڵی ١٩٨٢ (ل ٤٣٤ - ٤٤٩) وتارێکمان هەیە بەفراوانی لە چەمکی فۆنیم و چۆنیەتی دەست نیشانکردنی لە زمانا ئەدوێ. بۆ ئەوانەی ئەیانەوێ زیاتر لەم باسە بگەن.

سەرچاوەکان:

١- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) - ئیملای کوردی و چەن تێبینییەک- گۆڤاری زانیاری عێراق - دەستەی کورد. ل(٤٣٤-٤٤٠)

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) ئۆنیمەکانی زمانی کوردی - گۆڤاری نووسەری کورد ژ ٨ خولی دووەم.

3- Abercrombie, D. (1966) Elements of general Phonetics. Edinburgh.

4- Robins, R. H. (1979) "General Linguistics. An Introductory Survey. London. Longman.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری کاروان - ئەمیندارێتی گشتی بۆ رۆشنبیری و لاوان - هەولێر، ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٨٤، لاپەرە ٣٤-٣٧ بڵاوکراوەتەوە

# مردنی وشه

نەبوونی (مطلق) هەوێنی پەرەسەندنی زانست و بیرە. هەج پێناسینێک بۆ هەج دیاردەیێک لە هەج لقێکی بیر و زانستا بەدەستەوە بگرین... گەر بەقووڵی شیی بکەینەوە و لێی وردبینەوە کەلەبەر و کەموکوڕیی تیا هەر ئەدۆزینەوە. بەپێی ئەم کەلەبەر و کەموکوڕییانە پێناسینێکی تازەی بۆ دائەڕێژرێ. ئەم پێناسین و بۆچوونە تازەیەش هەمان شت گەر زیاتر لێی وردبینەوە دیسان دەرئەکەوێ کە پڕ بەپێست نییە و بەم جۆرە.

هەر قوتابخانەیێکی تازە لەهەر بوارێکدا بێ هەوڵدانە بۆ پڕکردنەوەی کەلەبەر و کەموکوڕییەکانی ئەوانی پێشووی.

زانستی زمان لەم ڕووەدا بوارێکی پڕ کێشەیە. ئەم وتارە هەوڵدانە بۆ دەرخستنی هەندێ کەموکوڕی و کەلەبەری پێناسینی وشە و مۆرفیم و دابەشکردنی زمانەکانی جیهان بەپێی پەیوەندیی نێوان مۆرفیمەکان لەناو قالبی وشەدا.

## وشە

ڕێزمانی تەقلیدی وشەی بەبنج داناوە بۆ شیکردنەوەی زمان، بەڵام نەیتوانیوە پێناسینێکی ڕێک بۆ وشە دارێژێ بشێ نەزەرییەکی گشتیی لەسەر دابنرێ و بکرێ بەپێوانە بۆ شیکردنەوەی زمان. (ڕستە لە کۆمەڵە وشەیەک پێک دێت...). (بەشەکانی ئاخاوتن بریتین لە چەن کۆمەڵە وشەیێک)... بەڵام وشە خۆی چییە و چۆن لە زمانا دەستنیشان دەکرێ... ئەمەیان ساغ نەکراوەتەوە.

ئەو پێناسین و پەیڕەوانەی بۆ چەمکی وشە دانراون ئەنجامێکی ئەوتۆ بەدەستەوە نادەن. گەلێ ناوێزە و کەلەبەریان تیا دەرئەکەوێ... یا تەنیا بۆ چەن زمانێ ئەشێن (ئەویش بەناتەواوی).

١- وشە بریتییە لە کۆمەڵە دەنگێکی بەزار دروستکراو مانایێک ئەبەخشێ...

بەخوێندنەوە و نووسینەوە پیاو ئەتوانێ هەزاران وشە بخاتە ناو مێشک و لێیەوە دەربهێنێ بێ ئەوەی زاری بکاتەوە و نقەی لێوەبێ. ئەمە ئەوە دەرئەخا کە مەرج نییە وشە بریتی بێ لە دەنگ...

گریان و پێکەنین کۆمەڵە دەنگن بەزار دروست ئەکرێن و ماناش ئەبەخشن (ئازار، خەم، شادی، گاڵتە... هتد) چۆن بەوشە لە قەڵەم ئەدرێن؟

با بڵێین (گوڵ)، (گەنم)، (ڕەش)، (با)، (دەست)، (کورت)... هتد هەریەکە وشەیەکە و بەکۆمەڵە دەنگێکی زار دروست ئەکرێ و مانایێک ئەبەخشێ. (گوڵەگەنم)، (ڕەشەبا) و (دەستکورت) هەریەکە چەن وشەن و چەن مانا ئەبەخشن؟

(گوڵ)، (گوڵەکە)، (گوڵەکان)، (گوڵەکانم) هەریەکە وشەیەکە... ئایا لە ڕووی ماناوەش هەریەکە مانایێک ئەبەخشێ؟. چ پێوانەیێک وامان لێ ئەکات بڵێین (گوڵ) و (بمانخواردنایە) هەردووک بەر چەمکی وشە ئەکەون لەکاتێکا (گوڵ) تاکە مانایەک ئەبەخشێ و (بمانخواردنایە) مانای ڕستەیەکی بەبکەر و بەرکار و فەرمان و لە ڕووی کاتەوە ئاڵۆز ئەبەخشێ. لێرە چۆن سنووری نێوان وشە و ڕستە دەستنیشان ئەکرێت؟

لە (گوڵ و موڵ) و (ئەزان و مەزان)دا، (موڵ مەزان) وشەن یا نا؟. گەر وشە بن ئەبن چین؟ دەنگن و بەزار دروست ئەکرێن و لە زمانا بەکار ئەهێنرێن.

(بار) کە زیاتر لە مانایێک ئەبەخشێ وەک لە (بارەدارێک) و (بارێکی نالەبار) بەیەک یا دوو وشە ئەژمێررێن؟...

گەلێ پرسیاری تری لەم بابەتە ئەشێ ئاراستە بکرێن بێ ئەوەی وەڵامێکی لەسەر مەنتیق دامەزراویان بۆ بدۆزرێتەوە. جگە لەمانە هەموو، چەمکی (مانا) خۆی شتێکی شاراوەیە. (مانای مانا) خۆی ساغ ئەکراوەتەوە، ئیتر چۆن ئەشێ شتێ بکرێ بەپێوانە بۆ پێناسینی شتێکی تر کە ئەو شتە خۆی شاراوە بێ و ساغ ئەکرابێتەوە.

هەچ هەوڵدانێک بۆ پێناسینی وشە بەپێی مانا هیچ ئەنجامێ بەدەستەوە نادات.

٢- وشە هەر دانەیێکی سەربەخۆیە لە زمانا بتوانێ (لە هەندێ بینەدا) دەوری ڕستەیێکی تەواو بگێڕێت. (من) وشەیێکە چونکە لە وەڵامدانەوەی (کێ خواردی؟) ئەڵێی (من). ئەم (من)ە دەوری ڕستەیەکی تەواوی گێڕاوە و کورتکراوەی ڕستەی (من خواردم)ە.

ئەمە گوایا لەگەڵ پاشگر و پێشگری وەک (-ەوە، -ن، -دا، دا-، هەڵ-، وەر-... هتد) ناکرێ. بۆیە ئەمانە بەوشە لە قەڵەم نادرێن.

ئەمەش ناشێ بکرێ بەپێوانە بۆ پێناسینی وشە لەبەر ئەم هۆیانە:

أ- ئەشێ پرسیاری وا دابڕێژرێ وەڵامەکەی پاشگر یا پێشگرێ وەک لە (دوا پاشگری

وشەی -کردنەوە- چییە؟) لە وەلاما نەڵێ (دوە)... یا بینووسە و بپرسە چی لێرە نووسراوە؟

ب- دەیەها وشە و پریپۆزیشنی وەک (بەڵام) چونکە، کەی، بۆ، تا، لەگەڵ... هتد) ناشێ بکرێن بەوەڵامی پرسیار.

٣- لە هەندێ زمانا بەپێوانەی فۆنۆلۆجی وشە دەستنیشان نەکرێت. بۆ نموونە زمان هەیە لە وشەکانیا هێز Stress نەکەوێتە سەر دوا برگەی وشەوە. واتا شوێنی هێز نەبێ بەسنووری وشە وەک لە زمانی کوردیدا. ئەمەش هەموو وشەیێک ناگرێتەوە و گەلێ ناوێزەی تیا دەرئەکەوێ وەک (بەڵام - چونکە -... هتد).

زمانی تورکی و هەنگاری لە لێقلی فۆنۆلۆجیدا سەر بەسیستەمی (ڤاوڵ هارمۆنی)ن Vowel Harmony. لەم جۆرە زمانانەدا ڤاوڵی رەگ چ جۆر بێ ڤاوڵی پێشگر و پاشگریش سەر بۆ هەمان جۆر دائەنوێنن... واتا گۆڕینی شێوەی ڤاوڵ گوێزانەوەیە لە وشەیەکەوە بۆ وشەیێکی تر. لەم جۆرە زمانانەش گەلێ ناوێزە دەستنیشان نەکرێ و ئەم پەیڕەوە ناشێ بکرێ بەپێوانە بۆ پێناسین و دەستنیشانکردنی وشە تەنانەت لەم زمانانەشدا.

ئەوەی وترا ئەوە ئەسەلمێنێ کە هیچ پێوانەیێکی سیمانتیکی یا فۆنۆلۆجی نییە بۆ پێناسینی وشە بشێ بکرێ بەبنج بۆ شیکردنەوەی زمان بۆیە زانایانی زمان ڕوویان لە وشە وەرگێڕا و لە جێگیری (بدیل)تر گەڕان. یەکێ لەم جێگیرانە چەمکی (مۆرفیم) بوو.

## مۆرفیم

مۆرفیم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە لە فۆنیمێ یا زیاتر پێک دێت و دەورێکی لە ڕێزمانا هەیە. بەگۆڕین و لابردنی هەر فۆنیمێکی یا بەلەتلەتکردنی، مانا و دەورە ئەسڵییەکەی تیا ئەچێ... واتا مۆرفیم سێ ڕووی هەیە.

١- قالبێکی فیزیاوی - فۆنیمەکانی

٢- مانایێک

٣- دەورێک لە ڕێزمانا

بۆ نموونە وشەی (مانگ) لە زمانی کوردیا یەک مۆرفیمە چونکە:

أ- قالبێکی فیزیاویی هەیە کە فۆنیمەکانییەتی (م-ا-ن-گ) ئەوەیە کە لە قسەکردنا

بەدەنگ نەبیسترێن.

ب- مانایەکی هەیە (ئەو کەرەسە ئاسمانییە کە... هتد).

ج- ئەتوانێ دەور لە ڕێزمانی کوردییا ببینێ. بۆ نموونە ئەتوانێ لە لێقڵی سینتاکسیدا وەک (بکەر) یا (بەرکار)ی ڕستە دەرکەوێ.

مانگ هەڵات

من مانگ ئەبینم

بەلابردنی هەچ فۆنیستیکی یا بەلەتلەتکردنی. قالب و مانا ئەسڵییەکەی تیا ئەچێ. (م-انگ). (ما-نگ) (مان-گ). (م-ان-گ)... هیچ مانا و دەورێکیان لە زمانی کوردییا بۆ نادۆزرێتەوە پەیوەندیی بەمانا و دەورە ئەسڵییەکەیەوە هەبێ، بۆیە مانگ یەک دانەی ساغە لەم زماندا و یەک مۆرفیمە.

پەیابوونی مانا بۆ هەندێ لە لەتەکانی مۆرفیم پەیوەندیی بەمانا ئەسڵییەکەیەوە نابێ و مەسەلە ڕێکەوتە. بۆ نموونە لە ئەنجامی ئەو لەتلەتکردنانەی مۆرفیمی (مانگ) وەک لەسەرەوە پێشکەش کرا ئەم دوو لەتە (مان-ان) مانا و دەوریان لە ڕێزمانی کوردییا هەیە ( مان - چاووگە) و (ان - ئامرازی کۆیە).

دیارە کە ئەم دوو دانەیە هیچ پەیوەندییەکیان بەمانای (مانگ)ەوە نییە.

لە ئەنجامدا مۆرفیمیش وەک وشە سەری ئەگرت و ئەشیا ببێ بەپێوانە بۆ شیکردنەوەی زمان لەبەر ئەم هۆیانە:

١- ئەو زمانانەی بەتواوە Fusional ناو ئەبرێن مۆرفیمەکان لەناو قالبی وشەکانیانا لەناو یەکا ئەتوێنەوە و دەستنیشان ناکرێن. بۆ نموونە لە زمانی عەرەبییدا (-ون) مۆرفیمی کۆیە لەگەڵ هەندێ ناو دەرئەکەوێ (معلم - معلمون، قادر - قادرون... هتد) بەلام سەدەها وشەی تیایە مۆرفیمی کۆیان هەرگیز تیا دەست نیشان ناکرێت (طالب - طلاب، عالم - علماء، أمة - أمم، علم - أعلام... هتد). چۆن لەم وشانەدا مۆرفیمەکان دەستنیشان ئەکرێن و چۆن ئەم زمانە بەپێی مۆرفیم شی ئەکرێتەوە.

٢- تەنانەت لەو زمانانەشدا کە مۆرفیمەکانی وشەکانیان بە ئاسانی دەستنیشان ئەکرێن حاڵەتی وا دێتە ئاراوە پێناسێن و چەمکی مۆرفیمان لەگەڵا ئەگونجێ. بۆ نموونە لە زمانی کوردییا، کە ڕاناوی هەیی کەسی سێیەمی تاکی (ی) و فەرمانی کاری بوونی کەسی سێیەمی تاکی کاتی ئێستا (ـە) پێکەوە دەرئەکەون (تی) پەیا ئەبێ:

تاک

کەس

١- برا - م - ە

٢- برا - ت - ە

٣- برا - ی - ە(تی)

کۆ

١- برا - مان - ە

٢- برا - تان - ە

٣- برا - یان - ە

ئەم (تی)یە قالبێکی فیزیاویی هەیە و لە لێقڵی فۆنۆلۆجیدا ئەشێ دەورێکی پێ بسپێرێ... بەڵام مانای چییە؟

ئێستا سەیری ئەم نموونانە بکە...

من چوو - م

تۆ چوو - یت

ئەو چوو -

ئێمە چوو - ین

ئێوە چوو - ن

ئەوان چوو - ن

لە کەسی سێیەکی تاکدا... مانا و دەور هەیە بەڵام قالب نییە.

زانایانی زمان بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتانە لە دابەشکردن[1] و دەستنیشان کردنی جۆری مۆرفیمەکان بابەتی (تی)یان خستۆتە خانەی مۆرفیمی بۆش emapty morpheme و ئەوەی مانا و دەوری هەبێ و قالبی فیزیاوی نەبێ خستوویانەتە خانەی مۆرفیمی صفرەوە Zero morpheme... هەر خۆشیان ئەڵێن... ئەمە هەر پۆشینە.

زمانەوانی سەدەی هەژدەم ولیەم ڤۆن هامبولت و زمانەکانی جیهانی دابەش کردە سەر سێ جۆر بەپێی پەیوەندیی نێوان مۆرفیمەکان لەناو قالبی وشەدا.

١- ئەو زمانانەی وشەکانی لە ریزە مۆرفیمێک پێکدێن و مۆرفیمەکان بەناسانی

دەستنیشـان نەکرێن و لێک جیا نەکرێنەوە ناوی نان agglutinative واتا (نووساو) (مۆرفیـمەکـان بەرێز بەیەکەوە نەنووسێن) وەک زمـانی کوردی، تورکی، یابانی، سواهیلی... هتد.

٢- ئەو زمانانەی کە مۆرفیمەکانی لەناو یەکا ئەتوێنەوە و بەئاسانی دەستنیشان ناکرێن و لێک جیا ناکرێنەوە ناوی نان fusional واتا (تواوە). وەک زمانی عەرەبی، لاتینی، گریکی... هتد.

٣- ئەو زمانانەی کە هەر وشەیێکی لە تاکە مۆرفیمێک پێکهاتووە ناوی نان Isolating واتا (دووردپەرێز). لەم جۆرە زمـانەدا هەر دانەیەکی مـانا و هەر دانەیەکی رێزمـانی بەمۆرفیمێکی سەربەخۆ دەرئەبڕێ... وەک زمانی چینی.

دوابێ ساغ بووەوە کە هیچ زمانێک لە جیهانا نییە بەتەواوی بەر یەکێ لەم سێ جۆرە بکەوێ. لە هەمـوو زمـانێکا هەر سێ قـالب بۆ دارشـتنی وشە دەستنیشـان ئەکرێن، ئەوەندیە جۆرێکیان بەسەر دووەکەی تر زاڵ ئەبێ و زمانەکە بەمەوە ناو ئەبرێ. بۆ نموونە زمانی کوردی زمانێکی نووساوە چونکە مۆرفیـمەکانی وشەکانی بەئاسانی دەستنیشان ئەکرێن و لێک جیا ئەکرێنەوە.

کوڕەکانت ←—— کوڕ - ەکە - ان - ت

بمانئووسینایە ←—— ب- مان - نووسی - ن - ایە

نموونەی دوو جۆرەکەی تریشی تیا بەرێژەیێکی کەم دەرئەکەوێ.

لە زمانی کوردییا هەموو ڕەگێکی فەرمانی ڕابردوو بە(ی) کۆتایی هاتبێ ئەم (ی)یە مۆرفیمی کاتی ڕابردووە.

| کاتی ڕابردوو | کاتی داهاتوو |
|---|---|
| نووسی | نووس |
| پرسی | پرس |
| دزی | دز |
| ناسی | ناس |

... هتد

هەموو فەرمانێکی ڕابردووی تێپەڕ بە(ا) کۆتایی هاتبێ ئەم (ا) مۆرفیمی کاتی ڕابردووە[٢].

| کاتی ڕابردوو | کاتی داهاتوو |
|---|---|
| کێلا | کێڵ |
| کێشا | کێش |
| هێنا | هێن |
| گێڕا | گێڕ |

لە هەندێ فەرمانا مۆرفیمی کاتی ڕابردوو لەناو ڕەگی کاتی ئێستا تواوەتەوە و دەستنیشان ناکرێ و جیا ناکرێتەوە.

کوشت ⟵ کوژ + مۆرفیمی کاتی ڕابردوو
هات ⟵ ێ + مۆرفیمی کاتی ڕابردوو
هێشت ⟵ هێڵ + مۆرفیمی کاتی ڕابردوو
... هتد

ئەمانە نموونەی (تواوە)ن لە زمانی کوردییا.

نموونەی (دووردپەرێز)یش Isolating ئەو وشە یەک مۆرفیمییانەن کە هیچ پاشگر و پێشگر وەرناگرن و ناچنە سەر هیچ. وەک (چونکە، بەڵام، تا، بۆ؟، کەی... هتد).

ژمارەی ئەم دوو جۆرەی دوایی زۆر کەمن بەگوێرەی جۆری یەکەم، بۆیە زمانی کوردی بەنووساو agglutinative لە قەڵەم ئەدرێ.

پەراوێزەکان:

(١) مۆرفیم لە چەن ڕوودکەوە دابەش ئەکرێ.

ا- مۆرفیم (سەربەست)ە یا (بەند). مۆرفیمی سەربەست ئەوەیە کە بەتەنیا وەک دانەیێکی سەربەخۆ دەرئەکەوێ و وشەیێکی سەربەخۆ پێک ئەهێنێ وەک (کچ، چیا، مناڵ... هتد). مۆرفیمی (بەند) ئەوەیە کە هەرگیز وەک دانەیێکی سەربەخۆ دەرناکەوێ و ئەبێ لەگەڵ مۆرفیمێکی تر دەرکەوێ وەک (-دکە، هەڵ-، نە-، -ان... هتد).

ب- مۆرفیم (ڕەگ)ە یا (لکاو)ە affix ڕەگ ئەو بەشەی وشەیە کە دوای لابردنی هەموو ئەفکسەکان (پاشگر، پێشگر، ناوگر) ئەمێنێتەوە. جیاکردنەوەی ئەم دوو جۆرە مۆرفیمە کارێکی ئاڵۆزە. بەشێوەیەکی گشتی ئەشێ بوترێ کە ڕەگ (ناوک)ی وشە پێک ئەهێنێ و لە ئەفیکس درێژترە و

بەژمارە زۆرترن لە هەر زمانێکا. ژمارەی ئەفیکسەکان (داخراوە) واتا ڕێگا ناداتە هی تر بچێتە ناویانەوە. گۆڕینی ژمارەیان بەندە بەگۆڕینی سیستەمی (ڕێزمانی)ی زمانەکە.

بۆ نموونە ڕاناوەکانی هەیی (تملک) لە زمانی کوردیدا ئەم شەشەن (م - ت - ی- مان - تان - یان) کۆمەڵێکی داخراوە ڕێگە نادەن بەهی تر بچێتە ناویانەوە. هەر ئەمانەن لای هەموو قسەکەرێکی ئەم شێوەی زمانی کوردی. کەچی مۆرفیمی ڕەگ سنوور بۆ ژمارەی نییە و دەرگای بۆ کراوەتەوە هەمیشە هی تازەی بێتە ناو. ژمارەی هەمیشە لە گۆڕیندایە بەنەمان یا پەیدابوونی هی تازە و لە قسەکەرێکەوە بۆ قسەکەری.

ئەفیکس سێ جۆرە (پێشگر، پاشگر، ناوگر) پێشگر ئەو ئەفیکسەیە کە لەپێش ڕەگەوە دەرنەکەوێ وەک (هەڵ - هەڵگرتن، ڕا - ڕاکردن، نە - نەخۆم... هتد).

پاشگر ئەو ئەفیکسەیە کە لە دوای ڕەگەوە دەرئەکەوێ وەک (ەکە - کوڕەکە، ەوە - خواردنەوە، ن- کێلان... هتد).

هەندێ دانەی ڕێزمانی هەن لە هەندێ زمانا هەم پاشگرن هەم پێشگر. وەک کۆمەڵە ڕاناوی (م - ی - ت - مان - تان - یان)

| وەک پاشگر | وەک پێشگر |
|---|---|
| خوارد - م | نە - م - خوارد |
| خوارد - ت | نە - ت - خوارد |
| خوارد - ی | نە - ی - خوارد |
| خوارد - مان | نە - مان - خوارد |
| خوارد - تان | نە - تان - خوارد |
| خوارد - یان | نە - یان - خوارد |

ناوگر ئەو ئەفیکسەیە کە لەناو ڕەگدا دەرئەکەوێ (بەپێی زانیاریی من ئەم جۆرە ئەفیکسە لە زمانی کوردییا نییە). ئەو نموونانەی هەندێ نووسەر ئەیهێنن کە گوایا ناوگرن ناشێ بەناوگریان لە قەڵەم بدەین چونکە بەر پێناسینی ناوگر ناکەون. پێوانە بۆ ناوگر ئەمانەن.

١- ڕەگ بسمێ (واتا بچێتە ناو ڕەگەوە)

٢- بەرهەمدار (منتج) بێ بچێتە سەر ژمارەیێکی زۆر ڕەگ و هەمان دەور بگێڕێ نەک تاقە وشەیێک... واتا وەک یاسا ئەبێ گشتی بێ دەرکەوتنی ئەم دەنگانە لەو نموونانەی بەناوگری لە قەڵەم ئەدەن هۆی فۆنۆلۆجییان هەیە نەک مۆرفۆلۆجی یا سینتاکسی.

٣- مۆرفیم مۆرفۆلۆجی (اشتقاقی)یە یا سینتاکسی (ڕێزمانی)یە.

مۆرفیمی مۆرفۆلۆجی ئەوەیە کە ئەچێتە سەر مۆرفیمی تر بۆ دروستکردنی وشەی تازەی خاوەن مانای تازە وەک (هەڵ - ڕا - دا - ەوە -... هتد) لەگرتن - هەڵگرتن، کردن - ڕاکردن، مان - دامان، کردن - کردنەوە).

مۆرفیمی (ڕێزمانی) ئەوەیە کە ئەچێتە سەر وشە بۆ دەربڕینی پەیوەندیی نێوان وشەکان لەناو جۆراوجۆرەکانی ڕستەدا. بۆ نموونە ئەو ڕاناوە لکاوانەی ئەکەوێ فەرمانا دەرئەکەون لە زمانی کوردیدا هەموو مۆرفیمی ڕێزمانین چونکە پەیوەندیی نێوان بکەر و فەرمان دەستنیشان ئەکەن.

من نوست - م

ئێمە نوست - ین

لە ڕستەی (کچە جوانە زیرەکەکە هات) (ە)ی (کچە) و (جوانە) مۆرفیمێکی ڕێزمانییە دەوری لەیەکدانی (ناو) و (ئاوەڵناو)ی لەم ڕستەیەدا ئەبینی، کە دەورێکی ڕێزمانییە.

مۆرفیم لە ئەنجامی کارتێکردنی ئەو بینە جیاوازانەی تیایا دەرئەکەون شێوەی جیاواز ئەگرنەخۆ. بۆ نموونە مۆرفیمی (ەکە) - کە ئامرازی پێناسینە لە زمانی کوردیدا خۆی بەم قاڵبانە پیشان ئەدا.

| | | |
|---|---|---|
| ەکە | کوڕ - ەکە | کوڕەکە |
| کە | مامۆستا - کە | مامۆستاکە |
| ەک | کوڕ - ەک - ان | کوڕەکان |
| ک | مامۆستا - ک - ان | مامۆستاکان |

(ەکە - کە - ەک - ک) هەموو شێوەی جیاوازی هەمان مۆرفیمن.. بینەی جیاواز ئەم شێوە جیاوازانەی دانێ. هەر شێوەیەک (مۆرف)ێکە شێوەکان (ئەلۆمۆرف)ی یەکترن و سەر بەهەمان مۆرفیمن.

## مۆرفیم و وشە:

وشە لە زمانی کوردیدا لە مۆرفیمێ یا زیاتر پێک دێت کەم وشەی تیا لە پێنج مۆرفیم زیاترە..

١- وشەی یەک مۆرفیمی (دڵ / کەلاوێژ / ئارەزوو)

٢- وشەی دوو مۆرفیمی (باڵ - دار / ئازاد -ی)

٣- وشەی سێ مۆرفیمی (نە - خۆ - م / نا - چ - ین)

٤- وشەی چوار مۆرفیمی (نە -ی - ناس - م / زام - دکە - ان -م)

٥- وشەی پێنج مۆرفیمی (هەڵ - ی - نە - گر - ە / پا - یار - نە - سپێر - ە).

**مۆرفیم و برگە:**

مۆرفیم و برگە دوو شتی جیان. مۆرفیم سەر بەلایەنی (مانادار - سیمانتیک)ی زمانە. برگە قالب و دارشتنە و سەر بەلایەنی بێ مانای زمانە (فۆنۆلۆجی). لەناو قالبی برگەکاندا فۆنیمەکان لەیەک ئەدرێن بۆ دروستکردنی مۆرفیمەکان. پەیوەندیی برگە و مۆرفیم لە زمانی کوردییا بەم جۆرەیە.

١- دوو مۆرفیم لە برگەیەکدا (خۆ - ت / لا - م).

٢- یەک مۆرفیم لە برگەیەکدا (مانگ / سەوز)

٣- یەک مۆرفیم لە دوو برگەدا (بەهار / ناسۆ)

٤- یەک مۆرفیم لە سێ برگەدا (گەلاوێژ / ئارەزوو / ئەستێرە).

(٢)- دان بەو ئەم یاسایە نانەوێ. سەیری ئەو سەرچاوەیە بکە - (کات و ڕەگی فرمان) گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژ ٦٥ شوباتی ١٩٨٤.


سەرچاوەکان:

١- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) (وشە) - گۆڤاری ئەمەەریی کورد ژ ٩ [illegible]

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) (مۆرفیم) - ڕۆژنامەی العراق ژ [illegible] ١٩٨٤

٣- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاریی کورد.

4- Lyons, J. (1971) (Introduction to theoretical Linguistics Cambridge.

5- Fromkin, V and Rodman, R (1974) An Introduction to language. New York.



*** ئەم وتارە لە گۆڤاری کاروان - ئەمیندارێتی گشتی بۆ ڕۆشنبیری و لاوان - هەولێر، ژمارە (٤٥)ی ساڵی ١٩٨٦، لاپەڕە ٨-١٤ بڵاوکراوەتەوە**

# نیشانەکانی کات لە زمانی کوردیدا

ڕێزمانی لاسایی کەرەوەی کوردی چاوگی بەبناغە و سەرچاوە داناوە لێیەوە ڕەگی فەرمان بەم پێڕەوە وەردەگرێ.

(بەلابردنی (ن)ی چاووگ ڕەگی ڕابردووی فەرمان وەردەگیرێ وەک:

هێنان - هێنا

کڕین - کڕی

بوون - بوو

کەوتن - کەوت

ناردن - نارد

بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو، فەرمانەکە دەخرێتە سەر کاتی داهاتوو و (دە)ی ئامرازی هەمیشەیی و ڕاناوی لکاو لادەبرێن، ئەوەی دەمێنێتەوە ڕەگی داهاتووی فەرمانەکەیە وەک:

دەخۆم بەلابردنی (دە) و (م)

(خۆ) مایەوە... ئەمە ڕەگی داهاتووی (خواردن)ە

دەنووین بەلابردنی (دە) و (ین)

(نوو) مایەوە... ئەمە ڕەگی داهاتووی (نوستن)ە... هتد

ئەم پێڕەوە هیچ لایەنێکی پێکهاتنی مۆرفۆلۆجیی ڕەگی فەرمان و پەیوەندیی نێوان بەشەکانی دەرناخات...

ئەم باسە هەوڵدانێکە بۆ جیاکردنەوەی کەرەسەکانی (ڕەگ) و (کات) و (دەستنیشانکردنی ئامرازەکانی کات لە زمانی کوردیدا).

بۆ دەستنیشانکردنی کەرەسە پێکهێنەرەکانی فەرمان:

١- سەیری ئەم دوو ڕستەیە بکە.

أ- ئەو نامە دەنووسێ

ب- من نامە دەنووسم

ڕستەی (أ) و (ب) لە هەمان کۆمەڵە کەرەسە پێک هاتوون. تاکە جیاوازییەک لە نێوانیانا ئەوەیە کاتی فەرمانی (أ) لە ڕابردوو دایە و هی (ب) لە داهاتوو دایە.

لە ئەنجامی ڕووبەڕووکردنی مۆرفۆلۆجی Morphological Identification[1]. دەردەکەوێ کە ئەوەی کاتەکەی کرد بەڕابردوو دەرکەوتنی (ی)یە لەگەڵ ڕەگی فەرمانا.

(من) بەرامبەر (من)

(نامە) بەرامبەر (نامە)

(م) بەرامبەر (م)

(دە) بەرامبەر (دە)

(نووســ) بەرامبەر (نووسی)

ئەو دانە ڕێزمانییەی کاتی فەرمانەکەی لە داهاتووەوە کرد بەڕابردوو (ی)یەکەیە. ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەم (ی)یە مۆرفیمێکە و نیشانەی کاتی ڕابردووە. دەچێتە سەر هەندێ ڕەگی وەک (کڕ - فڕ - سڕ - دز - مژ - کوڵ - کۆک -... هتد) و دەیانکاتە ڕەگی ڕابردوو.

کڕ دەبێتە کڕی

فڕ دەبێتە فڕی

سڕ دەبێتە سڕی

دز دەبێتە دزی

مژ دەبێتە مژی

کوڵ دەبێتە کوڵی

کۆک دەبێتە کۆکی

... هتد.

شیکردنەوە دەری دەخات کە هەموو ئەو فەرمانانەی ڕەگی ڕابردوویان بە(ی) کۆتایی دێت چ تێپەڕ بن چ تێنەپەڕ. لە هەموویانا بێ ناوێزە ئەم (ی)یە نیشانەی کاتی ڕابردووە.

بۆ داهاتوو ڕەگ هیچ نیشانەیێک وەرناگرێ Unmarked[2] دەشێ مۆرفیمی کاتی داهاتووی ئەم ڕەگانە بە(سفر) Zero morphem لە قەڵەم بدرێ.

٢- بەهەمان پێڕەو ئەم جووتە ڕستانە شی بکەرەوە.

أ- ئێمە ئەرز دەکێڵێن.

ب- ئێمە ئەرزمان دەکێلا.

ا- ئەوان ڕێگا دەپێون.

ب- ئەوان ڕێگایان دەپێوا.

ا- تۆ جگەرە دەکێشیت.

ب- تۆ جگەرەت دەکێشا.

لە ئەنجامی ڕووبەڕووکردنی مۆرفۆلۆجی ئەم جووتە ڕستانەی سەرەوە دەردەکەوێ کە (أ) و (ب) لە هەموویانا لەهەمان کۆمەڵە کەرەسە پێک هاتوون. تاکە جیاوازییەک لە نێوانیانا ئەوەیە لە (ب)دا فەرمان لەکاتی ڕابردوو دایە و لە (أ)دا لە داهاتودا دایە... ئەوەی کاتەکەی لە داهاتووەوە کرد بەڕابردوو دەرکەوتنی (أ) بوو لەگەڵ ڕەگی فرمانا. ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەم (أ)ە مۆرفیمێکە و نیشانەی یا ئامرازی کاتی ڕابردووە لەگەڵ ڕەگی وەک. (هێن - کێش - پێو - کێل... هتد)دا دەردەکەوێ.

بۆ داهاتوو وەک ئەوانی پێشوو لەگەڵ ئەم ڕەگانە هیچ ئامراز و نیشانەیەک دەرناکەوێ و دەشێ مۆرفیمی سفری بخرێتە پاڵ.

شیکردنەوە دەری دەخات کە ئەو فرمانانەی ڕەگی ڕابردوویان بە(ا) کۆتایی دێ ئەگەر تێپەڕبن بەلابردنی ئەم (أ)یە ڕەگی داهاتوو دەست دەکەوێ. ئەگەر تێنەپەڕ بن نیشانە بۆ کاتی داهاتوو سەر هەڵدەدا وەک لەم ڕستانەدا دەردەکەوێ.

أ- ئەوان دەگریان.

ب- ئەوان دەگرێن.

أ- شیرەکە دەکولا.

ب- شیرەکە دەکولێ.

أ- تۆ دەترسایت.

ب- تۆ دەترسێیت.

أ- ئەو دەڕووخا.

ب- ئەو دەڕووخێ (یت).

لەم جووتە ڕستانەی سەرەوە (أ) و (ب) لە هەمان کۆمەڵە و کەرەسە پێک هاتوون. تاکە جیاوازییەک لە نێوانیانا ئەوەیە ڕەگی ڕستەکانی (أ) بە(أ) کۆتایی دێت و هی (ب)ەکان بە (ێ). ئەم ئالوگۆڕەیە کاتی فرمانەکەی لە ڕابردووەوە کرد بەداهاتوو و ئەنجامەوە ئەوە شیکردنەوە [illegible] دەری دەخات کە ئەمەو فرمانێکی تێنەپەڕ ڕەگی ڕابردووی

بە(ا) کـۆتایی بێت بەگـۆڕینی ئەم (ا)ـە بە(ێ) ڕەگـەکـە دەبێ بەداهاتوو. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە (ا) و (ێ) دوو نیشانەی کاتن لەگەڵ هەندێ ڕەگا دەردەکەون.

ئەم دوو نیشانەیە لە فـرمانی بکەر نادیاریشا سەر هەڵدەدەن. وەک لە:

ا- ئەوان دەکوژران.

ب- ئەوان دەکوژرێن.

بەرووبەڕوو کـردنی مـۆرفـۆلۆجـیی ئەم دوو ڕسـتـەیە دەردەکـەوێ کـە ئەوەی کـاتی فـرمانەکەی لە ڕابردووەوە کرد بەداهاتوو و بەپێچەوانەوە ئاڵوگۆڕبوونی (ا) و (ێ) بوو. کە ئەمە بەڵگەی ئەوەیە (ا) نیشانەی ڕابردووە و (ێ) هی داهاتووە.

٣- لەم جووتە ڕستانەی خوارەوە فـرمانی (ا) و (ب) لەهەمان کەرەسەی ڕێزمانی پێک هاتوون.

ا- جاران گوڵم دەچاند.

ب- ئێستا گوڵ دەچێنم.

ا- نامەم دەنارد.

ب- نامە دەنێرم.

ا- گەنمیان دەبژارد.

ب- گەنم دەبژێرن.

لەم ڕستانەی سەرەوەدا کاتی فرمانی ڕستەکانی (ا) لە ڕابردوو دان و (ب) لە داهاتوو دان. جگە لە دەرکەوتنی (د) لەگەڵ ڕابردوودا.

(ا) لەگـەڵ ڕابردوو و (ێ) لەگەڵ داهاتوودا لەم ڕسـتـانەدا سـەریان هەڵدایەوە. ئەم دوو نیشـانەیە بەم شێـوەیە لە هەمـوو ئەو فـرمانانەدا دەردەکـەون کە بە (د) کۆتاییـان دێ و (ا)یان هەیە. واتا لەگەڵ هەندێ ڕەگا.

(ێ)نیشـانەی کاتی داهاتووە.

(ا - د) نیشانەی کاتی ڕابردووە.

ئەمە لە هەموو ئەو فـرمانانەشدا بەرچاو دەکەون چ بەرەسەن (تێپەڕ)بن وەک نارد/نێر - چاند/چێن - بژارد/بژێر... هتـد... چ ئەوانەی لە تێنەپەڕەوە کـراون بەتێـپـەڕ وک (شکاند/شکێن - ترساند/ترسێن)... چ ئەوانەی لە ناوە سـروشـتـیـیـەکـانەوە داڕێژراون وەک چریکاند /چریکێن - نووزاند/ نووزێن... هتد.

٤- بەرووبەڕوو کردنێکی مۆرفۆلۆجیی ئەم دوو ڕستەیە.

أ- دەچم بۆ بازاڕ.

ب- دەچووم بۆ بازاڕ.

دەردەکەوێ کە تاکە جیاوازییەک لە نێوانیانا ئەوەیە، لە (ب)دا (وو) لەگەڵ ڕەگی فرمانا دەرکەوتووە. ئەم (وو)ە کاتەکەی کرد بەڕابردوو. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم (وو)ە نیشانەیە بۆ کاتی ڕابردوو لەگەڵ هەندێ ڕەگا دەردەکەوێ. شی کردنەوە دەری دەخات کە تەنیا لەو فرمانانەی تێنەپەڕن (وو) لەگەڵ ڕەگی داهاتوودا دەرناکەوێ. ئەو فەرمانانەی ڕەگی ڕابردوویان بە(وو) کۆتایی دێت و تێپەڕن کە دەکرێنە داهاتوو... (وو) لاناچی. وەک دروون - هەنوون - گروون - سوون... هتد.

٥- لەم جووتە ڕستانەی خوارەوە:

أ- تۆ دەخەوتیت.

ب- تۆ دەخەویت.

أ- خانووەکەی دەفرۆشت.

ب- خانووەکەی دەفرۆشێت.

أ- چۆلەکەیان دەگرت.

ب- چۆلەکە دەگرن.

أ- قسەیان بەئێمە دەوت.

ب- قسە بەئێمە دەڵێن.

کاتی فەرمانی (أ) لە ڕابردوو دایە و هی (ب) لە داهاتوو دایە. ڕەگی فرمان لە ڕستەی (أ)دا بە(ت) کۆتایی هاتووە. لە (ب)دا (ت) نەماوە... (جگە لە نەمانی (ت) هەندێ گۆڕانی تریش بەسەر هەندێ لە ڕەگەکان دێت).

ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ کە هەموو ئەو فرمانانەی کاتیان لە ڕابردوو دایە و ڕەگەکانیان بە(ت) کۆتایی دێت، ئەم (ت)یە نیشانەیە (یا بەشێکە) لە نیشانەی ڕابردوو بەڵگەش ئەوەیە کە کاتی فرمانەکە دەکرێتە داهاتوو (ت) نامێنێ.

- ئەو یاسایانەی ڕەگی فرمان و نیشانەی کات لێک دەدەن و لەناو یەکیان دەتوێننەوە بەیاساکانی مۆرفۆفۆنیمی ناو دەبرێن.

گوژ + مۆرفیمی ڕابردوو ⟵ کوشت

هێن + مۆرفیمی ڕابردوو ⟵ هێنا

مر + مۆرفیمی ڕابردوو ⟵ مرد

**ئەنجام:**

١- لە ئەنجاما دەردەکەوێ کە نیشانەکانی یا مۆرفیمەکانی کات لە زمانی کوردیدا ئەمانەن.

| | ڕابردوو | داهاتوو | نموونە |
|---|---|---|---|
| ١- | ی | Ø | کڕی - کڕ |
| ٢- | ا | Ø (تێپەڕ) | هێنا - هێن |
| | | ێ (تێنەپەڕ) | سووتا - سووتێ |
| ٣- | ا + د | د ← Ø | چاند - چێن |
| | | ا ← ێ | |
| ٤- | وو | Ø (تێنەپەڕ) | چوو - چ |
| | | لەگەڵ تێپەڕا هیچ گۆڕینێ ڕوونادات | دروو - دروو |
| ٥- | ت | ت ← Ø | نیشت - نیش |
| | | | کوشت - کوژ |

٢- لە ئەنجامی دەستنیشانکردنی نیشانەکانی کات دەشێ دەستەیێک یاسا دەستنیشان بکرێن بەهۆیانەوە ڕەگی داهاتوو لە ڕابردووەوە وەربگیرێ. کە ئەمانەن...

١) ئەگەر ڕەگی ڕابردوو بە(ی) کۆتایی هاتبێ بەلابردنی ئەم (ی)یە ڕەگی داهاتوو دەست دەکەوێ بێ ناوێزە.

کڕی - کڕ

سڕی - سڕ

پژمین - پژم... هتد.

٢) ئەگەر ڕەگی ڕابردوو بە(ا) کۆتایی هاتبێ ئەم (ا)ە نیشانەی کاتی ڕابردووە... بەلابردنی، ڕەگی داهاتوو دەست دەکەوێ گەر تێپەڕ بوو... ئەگەر فرمانەکە تێنەپەڕ بێ (ێ) دەخرێتە شوێنی.

کـلا - کێل (تێپەڕ)

سـووتا - سووتێ (تێنەپەڕ)

تەنیا ئەم پێنج ناوێزەیەم دۆزییەوە.

(دا - دە / ما - مێن / (دا) نا - نێ / ژیا - ژی / (هەڵ) سا - س).

٣) ئەگەر ڕەگی ڕابردووی فـرمان بە(د) کۆتایی هاتبێ بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو (د) لادەبرێ و (ا)ی فـرمانەکە دەکرێتە (ێ)...

چاند - چێن

نارد - نێر

لە هەموو فـرمانە (د) یەکان تەنیا ئەم چوار ناوێزەیەم بەرچاو کەوت (بوورد - بوور / مرد - مر / سەند - سەن، سێن / خوارد - خۆ).

لەم ناوێزانەش تەنیا (خوارد) لە ڕاستیـیا بەناوێزە دەژمێررێ... لە ستیـیەکەی تر وەک هەموو فـرمانە دالییەکان (د) لادەبرێ... ئەوەندیە لەماندا (ا) نییە تا بگۆڕێ بە(ێ).

٤) ئەگەر کاتی ڕابردووی فـرمانەکە بە(وو) کۆتایی هاتبێ و تێنەپەڕ بێ بەلابردنی ئەم (وو)ە ڕەگی داهاتوو دەست دەکەوێ.

چوو - چ

بوو - ب

ئەگەر تێپەڕ بوو ڕەگی داهاتوو وەک ڕابردوو وایە.

دروو - دروو

گروو - گروو

هەنوو - هەنوو

٥) ئەگەر فـرمان بە(ت) کـۆتایی هاتبێ بەلابردنی ئەم (ت)یە لە بەشـێکیـانا ڕەگی داهاتوو دەست دەکەوێ.

[illegible]

خەوت - خەو

کەوت - کەو

لە بەشـێکی ئەو فـرمـانانەی ڕەگی ڕابردوویان بە(ت) کـۆتایی دێ. جگە لە لابردنی (ت) گۆڕینی تریشیان بەسەرا دێ... وەک:

خواستن - خواست - خواز / (س) بوو بە(ز)
کوشتن - کوشت - کوژ / (ش) بوو بە(ژ)
ناشتن - ناشت - نێژ / (ش) بوو بە(ژ)
... هتد

٣- لە ئەنجامی بەراوردکردن و ڕووبەڕووکردنی (٢٤٢) فـــرمانی ڕەسەنی وەرنەگیراوی سادەی بێ پێشگر و پاشگر لە دوو کاتی ڕابردوو و داهاتوودا، بۆم دەرکەوت کە ڕەگی داهاتووی لە سەدا ٨٥.٩٥٪یان بەیاسا لە ڕەگی ڕابردوویانەوە وەردەگیرێ - وەک لەم نەخشەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

| فەرمان | ژمارە | بەیاسا | ڕێژە | ناوێزە | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|---|
| ا | ١١١ | ١٠٦ | ٪٩٥.٤٩ | ٥ | ٪٤.٥١ |
| ی | ٧٦ | ٧٦ | ٪١٠٠ | - | - |
| ت | ٣٤ | ١١ | ٪٣٢.٣٥ | ٢٣ | ٦٧.٦٥ |
| د | ١٣ | ٩ | ٪٦٩.٢٣ | ٤ | ٪٣٠.٧٧ |
| وو | ٨ | ٨ | ٪١٠٠ | - | - |
| هەموو | ٢٤٢ | ٢١٠ | ٪٨٥.٩٥ | ٣٢ | ٪١٣.١٥ |

ئەگەر ئەو فـــرمانە تێپەڕانەی لە تێنەپەڕەوە وەرگیـــراون وەک (شکاند - برژاند) و ئەوانەی لەناوی سروشتییـەوە وەرگیراون وەک (قیژاند - چریکاند) و ئەو فـــرمانانەی بەهۆی پێشگر و پاشگردوە دارێژراون وەک (ڕاپەڕی - هەڵپـەڕی - پەڕییـەوە... هتـد) ڕەچاو بکرێن ڕێژەی وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو لە ڕابردوو دەگاتە ژوور ٩٧٪.

## هێز وەک نیشانەی کات

ڕستەی (درەختەکە سەوز بوو)

لە ڕووی کاتەوە دوو مانای جیای دەخرێتە پاڵ:

١- ئەگەر هێز کەوتە سەر (بوو) ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کە درەختەکە ئێستا سەوزە و لە ڕابردوودا سەوز نەبووە.

٢- ئەگەر هێز کەوتە سەر (سەوز) ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کە درەختەکە ئێستا سەوز نییە و

لە ڕابردوودا سیفەتی سەوزیی پێوە بووە.

هۆی ئەم جیاوازییە دەخرێتە پاڵ پێکهاتنی مۆرفۆلۆجیی وشەکانی ڕستەکە و سروشتی پەیوەندیی نێوانیان لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا.

بۆ مانای یەکەم ڕستەکە لە دوو وشە پێک دێت (درەختەکە + سەوزبوو).

وشەی (سەوزبوو) وشەیێکی لێکدراوە لە (سەوز + بوو) پێک هاتووە. (بوو) لێرە پاشگرێکی مۆرفۆلۆجییە چۆتە سەر (سەوز) کە ناوەڵناوە و فرمانێکی لێکدراوی تێنەپەڕی پێک هێناوە. وشەی (سەوز) هێزی خۆی دۆڕاندووە و چۆتە سەر (بوو) کە دوا برگەی وشە لێکدراوەکەیە. چونکە لە وشەی زمانی کوردیدا هێز لەسەر دوا برگەدا سەرهەڵدەدا. پەیوەندیی ڕستەیی نێوان وشەکانی ئەم ڕستەیە بۆ ئەم واتایە بەم جۆرەیە.

بۆ مانای دووەم ڕستەکە لە سێ وشە پێک دێت (درەختەکە + سەوز + بوو). پەیوەندیی ڕستەیی نێوانیان بەم جۆرەیە.

لێرە (سەوز) و (بوو) هەریەکە وشەیێکی سەربەخۆیە و ئەرکی سینتاکسیی خۆی هەیە.
(سەوز) تەواوکەری (بوو)ە بۆیە وەک وشەیێکی سەربەخۆ هێزەکەی خۆی پاراستووە.
هەمان شت لەم رستەیەی خوارەوە:

کانییەکە پڕ بوو

ئەگەر هێز خرایە سەر (بوو) واتای ئەوە دەگەیێنێ کە کانییەکە ئێستا پڕە و پێشتر پڕ نەبووە.

کانییەکە پڕ بووَ.

(َ) نیشانەی هێزە ئەگەر وشەی (پڕ) هێزی خۆی پاراست، واتای ئەوە دەگەیێنێ کە لە کاتێکی رابردوودا کانییەکە پڕ بووە و ئێستا (لەوانەیە) بەتاڵ بێ.

کانییەکە پڕَ بوو.

پەراوێزەکان:

١- بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی پێرەوی ڕووبەڕووکردنی مۆرفۆلۆجی سەیری ل (٦٥-٧٧)ی سەرچاوە ژمارە (٤) بکە.

٢- بۆ ئەم بابەتە سەیری ل(٧٩)ی سەرچاوە ژ (٥) بکە.

سەرچاوەکان:


١- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کوڕی زانیاری کورد.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) کات و ڕەگی ئەرمان - گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژ ٦٥.

٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) چەند یاسایێکی دارشتنی فەرمان گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ ١٠٩.

4- Gleason H. A. (1965) An Introduction to descriptive linguistics.

5- Lyons. J. (1971) Introduction to theoretical linguistics

6- Mathews P. H. (1974) Morphdology - Cambridg University



*** ئەم وتارە لە گۆڤاری کاروان - ئەمیندارێتی گشتی بۆ ڕۆشنبیری و لاوان - هەولێر، ژمارە (٩٢)ی ساڵی ١٩٩٢، لاپەڕە ٨٨-٩٢ بڵاوکراوەتەوە**

# کات و ڕەگی فرمان

کات لەڕێزمانا نەبێ جیا بکرێتەوە لە کاتی فیزیاوی چونکە لە زۆر حاڵەتا یەک ناگرنەوە. گەلێ جار فەرمان لە ڕستەدا ڕەگەکەی بەپێی شیکردنەوەی ڕێزمانی لەکاتی ڕابردوودایە کەچی ڕووداوەکە لە کاتێکی داهاتوودا ڕوو ئەدا و بەپێچەوانەوە. بۆ نموونە لە ڕستەی:

بەیانی کە هاتم کتێبەکەت بۆ ئەهێنم.

فـــرمانی (هاتم) لە ڕووی داڕشتنی ڕێزمانییەوە کاتەکەی ڕابردووە بەڵام ڕووداوەکە واتا (هاتنەکە) لە کاتێکی داهاتوودا ڕوو ئەدات کە (بەیانی)یە.

حاڵەتی واش هەیە فەرمانەکە بەڕەگی داهاتوو دائەڕێژرێ کەچی ڕووداوەکە لە کاتێکی ڕابردوو ڕووی داوە. وەک لە فەرمانی ڕستەی بکەر نادیاردا. لە ڕستەی:

پیاوەکە دوێنێ کوژرا.

فـــــرمانی (کوژرا) بەڕەگی داهاتووی فـەرمـانی (کـوشتن) کـە (کـوژ)ە داڕێژراوە کـەچی ڕووداوەکە لە کاتێکی ڕابردوودا ڕووی داوە کە (دوێنێ)یە.

گەلێ نموونەی تری لەم بابەتە ئەشێ بخرێتە بەرچاو بۆ ساغکردنەوە و سەلماندنی ئەوەی کە کاتی داهاتوو ڕابردووی فیزیاوی جیایە لە هی ڕێزمانی.

لە ڕێزمانی کوردییا... دوو ڕەگی جیاواز بۆ فەرمان دەسنیشـان کراون ئەوانەن کە پێیان ئەوترێ (ڕەگی کاتی داهاتوو) و (ڕەگی کاتی ڕابردوو) هەموو کاتە ڕێزمانییەکان بەم دوو ڕەگە دائەڕێژرێن.

ڕێزمانی تەقلیدی چاووگی کردووە بەسەرچاوە لێیەوە ڕەگی ڕابردوو وەرئەگرێ بەلابردنی (ن)ی چاووگ. (هەمـوو چاوگێ لە زمانی کـوردییـا بە(ن) کـۆتایی دێت... بەلابردنی ئەم (ن)ە ڕەگی ڕابردووی فەرمان دەس ئەکەوێ).

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو |
| --- | --- |
| نوستن | نوست |
| کردن | کرد |
| پژمین | پژمی |

بەلام پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی ڕابردوو داهاتووی دەسنیشان نەکردووە. واتا ئەو یاسا مۆرفۆفۆنیمانەی نەخستۆتە ڕوو کە بەهۆیانەوە ڕەگی داهاتووی فەرمان لە ڕابردووی وەربگیرێ.

لەم وتارەدا هەوڵ ئەدەین پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی کاتی ڕابردوو ڕەگی کاتی داهاتووی فەرمانی کوردی بخەینە ڕوو. واتا ئەو یاسایانەی ئەشێ بەهۆیانەوە ڕەگی کاتی داهاتوو لە هی ڕابردوو وەربگیرێ.

## یاساکانی وەرگرتنی ڕەگی کاتی داهاتوو لە ڕابردوو

هەموو چاووگێک لە زمانی کوردیدا بە(ن) کۆتایی دێت. پێش (ن) یەکێ لەم پێنج فۆنیمانە دەرئەکەوێ (ی - ا - وو - د - ت).

| | |
|---|---|
| ی | برین - پرسین - خزین |
| ا | سووتان - کێلان - گەڕان |
| وو | بوون - سوون - چوون |
| د | کردن - ناردن - خوێندن |
| ت | گرتن - خستن - کەوتن |

١- گەر هات و چاووگەکە (یائی) بوو واتا (ی)ی تیا پێش (ن) دەرکەوت ڕەگی داهاتووی بەلابردنی (ی)یەکە دەس ئەکەوێ.

| چاووگ | ڕەگی کاتی ڕابردوو | ڕەگی کاتی داهاتوو |
|---|---|---|
| نووسین | نووسی | نووس |
| ماڵین | ماڵی | ماڵ |
| پژمین | پژمی | پژم |

٢- گەر چاووگەکە ئەلفی بوو.

أ- لەگەڵ تێپەڕا ڕەگی داهاتوو بەلابردنی (ا)کە دەس ئەکەوێ.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| هێنان | هێنا | هێن |
| کێلان | کێلا | کێل |
| کێشان | کێشا | کێش |

ب- گەر فەرمانەکە تێنەپەڕ بوو ڕەگی داهاتووی بەگۆڕینی (ا) بە(ێ) دەس ئەکەوێ.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| سووتان | سووتا | سووتێ |
| گریان | گریا | گریێ |
| ترسان | ترسا | ترسێ |

ئەم چەند چاووگە ئەلفییە یەک بڕگەییانە بەر ئەم یاسایە ناکەون.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| دان | دا | دە |
| مان | ما | مێن |
| (دا)نان | نا | نێ |
| ژیان | ژیا | ژی |
| هەڵ(سان) | سا | س |

٣- گەر چاووگەکە واوی بوو...

أ- لە فەرمانی تێپەڕا ڕەگی ڕابردوو و داهاتوو یەکن.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| دروون | دروو | دروو |
| سوون | سوو | سوو |

ب- لە فەرمانی تێنەپەڕا... ڕەگی داهاتوو بەلابردنی (وو) دەس ئەکەوێ.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| چوون | چوو | چ |
| بوون | بوو | ب |

٤- گەر فەرمانەکە دالی بوو.

أ- ئەو فەرمانەی ڕەگی ڕابردوویان بە(ارد) یا (اند) کۆتایی دێت... بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتوویان (د) لائەبرێ (ا) ئەکرێ بە(ێ).[11]

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
| --- | --- | --- |
| ناردن | نارد | نێر |
| ژماردن | ژمارد | ژمێر |
| چاندن | چاند | چێن |

فەرمانی (خواردن) ناوێزەیە بەر ئەم یاسایە ناکەوێ. ڕەگی داهاتووی (خۆ)یە.

ب- ئەو فەرمانەی ڕەگی ڕابردوویان بە(رد) کۆتایی دێت و پێش ئەم (رد)ە ڤاوڵی کورتی (i) دەرکەوێ. ڕەگی داهاتوویان بەجێگیرکردنی (ـە) لە شوێنی (رد) دەستی ئەکەوێ.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
| --- | --- | --- |
| کردن | کرد | کە |
| بردن | برد | بە |

فەرمانی (مردن) بەر ئەم یاسایە ناکەوێ. (مر) ڕەگی داهاتوویەتی.

بۆ چاووگە (دالی)یەکانی تر ناشێ یاسای وا دابنرێ بەهۆیەوە یا بەهۆیانەوە پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی ڕابردوو داهاتوو دەسنیشان بکرێت...

٥- گەر فەرمانەکە (تانی) بوو... بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو لە هی ڕابردوو ئەم چەن یاسایە ئەشێ دەس نیشان بکرێت...

گەر ڕەگی ڕابردوو بە(-ەوت) کۆتایی هاتبێ... ڕەگی داهاتووی بەلابردنی (ت) دەس ئەکەوێ.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
| --- | --- | --- |
| خەوتن | خەوت | خەو |
| سرەوتن | سرەوت | سرەو |

ب- گەر ڕەگی ڕابردوو بە(ست) یا (شت) کۆتایی هاتبێ بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتووی (س) ئەکرێ بە(ز)، (ش) ئەکرێ بە(ژ) و ئەو ڤاوڵەی لە پێشیان دەرئەکەوێ (لە هەندێ حاڵەتا) ئەبێ بە(ێ).

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
| --- | --- | --- |
| ناشتن | ناشت | نێژ |
| ڕشتن | ڕشت | ڕێژ |
| گواستن | گواست | گوێز |

ئەم یاسـایە گـەلێ ناوێزەی تیـا دەرنەکـەوێ وەک (نوسـتن - نوو) (شـوشتن - شـۆ) (کوشتن - کوژ)... هتد.

ج- گـەر ڕەگی ڕابردوو بە(ب) یا (پ) دەسـتی پێ کـردبێ و بە(سـت) کـۆتایی هاتبێ... ڕەگی ڕابردوو و داهاتوو هەمان شتن.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| بیستن | بیست | بیست |
| پەرستن | پەرست | پەرست |

لە ئەنجـامـا دەرنەکـەوێ کـە ئەشێ یاسـای ڕێک و گـشـتی دەست نیـشـان بکرێت بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو لە ڕابردووەوە.

لیسـتـەیەکی (٢٤١)[٢] چاووگیم لەبەر دەسـتایە. بەدابەش کردنیـان بەسەر پێنج بەش بەپێی ئەو فۆنیـمانەی ڕەگی ڕابردوویان کۆتایی پێ دێ و بەدەسـتنیـشـان کردنی ژمارەی ئەوانەی لە هەر بەشێکا ئەکەونە بەر یاسـاکانی وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو لە هی ڕابردوو و ژمارەی ناوێزەکان و ڕێژەیان ئەم ئەنجامانەم دەست کەوت کە هەموو لەم ئەخشەیەدا ڕوون کراونەوە.

| چاووگە | ژمارە | بەر یاسا نەکەون | ڕێژە | ناوێزە | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|---|
| ا | ١١١ | ١٠٦ | ٪٩٥.٤٩ | ٥ | ٪٤.٥١ |
| ی | ٧٦ | ٧٦ | ٪١٠٠ | - | - |
| ت | ٣٤ | ١١ | ٪٢٣.٣٥ | ٢٣ | ٪٦٧.٦٥ |
| د | ١٣ | ٩ | ٪٦٩.٢٣ | ٤ | ٪٣٠.٧٧ |
| وو | ٧ | ٧ | ٪١٠٠ | | - |
| گشتی | ٢٤١ | ٢٠٧ | ٪٨٦.٧٢ | ٣٢ | ٪١٣.٢٨ |

بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە ٨٦.٧٢٪ی فەرمـانەکـانی کـوردی ئەشێ ڕەگی داهاتوویان لە ڕابردوودوە بەیاسـا وەربگیرێ. ژمارەی چاووگەکان بێگومـان ئەگۆڕێ، لەوانەیە گەلێکی تر هەبن ئەهاتبنە خەیاڵـم بیانخەمە ناو لیسـتـەکەی بەردەستم. بەڵام بەشـێوەیەکی گـشـتی گۆڕینی ژمارەکە کارێکی ئەوتۆ لە ڕێژەکە ناکات.

یاساکانی وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو لەهی ڕابردوو ئەشێ لەم ئەخشەیەدا ڕوون بکرێتەوە.

هەروا لیستەی فەرمانە ناوێزەکان خراوەتە بەرچاو. بەشێوەیەکی گشتی هەچ فەرمانی لە لیستەی ناوێزەکانا نەبوو بەیاساکان ڕەگی داهاتوویان وەرئەگیرێ.

ناوێزەکان

| | |
|---|---|
| دان - دە | بووردن - بوور |
| مان - مێن | مردن - مر |
| (دا) نان - نێ | سەندن - سەن. سێن |
| ژیان - ژی | خواردن - خۆ |
| (هەڵ)سان - س | بزووتن - بزوو |
| دیتن - بین | ڕستن - ڕێس |
| فرۆشتن - فرۆش | گەستن - گەز |
| گلۆفتن - گلۆف | خواستن - خواز |
| گوتن - ڵێ | پشکوتن - پشکوێ |
| وتن - ڵێ | نیشتن - نیش |
| هێشتن - هێڵ | لێستن - لێس |
| هاتن - ێ | کوشتن - کوژ |
| هاویشتن - هاوێ | کرۆشتن - کرۆژ |
| نوستن - نو | بزووتن - بزوو |
| پالاوتن - پاڵێو | گرتن - گر |
| خستن - خە | هاژووژتن - هاژوو |

پەراوێزەکان:

١- ئەمە هەموو ئەو فەرمانە تێپەڕانەش ئەگرێتەوە لە تێنەپەڕەوە وەرئەگیرێن وەک (مردن - مراندن). هەروا ئەو فەرمانانەش ئەگرێتەوە کە لە دەنگە سروشتییەکانەوە بەپاشگری (اند) داتەپێژرێن وەک (قیژە - قیژاندن، چریکە - چریکاندن) لەم لێکۆڵینەوەیە ئەم جۆرە فەرمانانە نەخراونەتە ڕیزەوە.

٢- چاووگی لێکدراوی وەک (ڕاکردن - هەڵکردن - کردنەوە... هتد) نەخراونەتە ناو لیستەکەوە.

سەرچاوەکان:

1- Amin, W. O. (1979) "Aspects of the verbal construction in Kurdish" Thesis presented to/the University of London.
2- Mackenie, D. N. (1961) "Kurdish Dialect Studies".

٣- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاری کورد.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆژی کوردستان - کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد - بەغدا، ژمارە (٦٥) ساڵی ١٩٨٤، لاپەڕە ٧٨-٨٢ بڵاوکراوەتەوە.

## یاسایێکی فۆنۆلۆجی

لە زمانی کوردیدا ئەو پریپۆزیشنانەی لەگەڵ ئەو جۆرە فرمانانە دەرنەکەون کە چەمکی گـــوێزانەوە ئەگـــەیەنن Dative Case وەک (چوون بۆ... دان بە... هتـــد). ئەشێ پریپۆزیشنەکە بەپاشگری فەرمانی (ـە) جێگیر بکرێت.

ئێمە هاتین بۆ سلێمانی.
ئێمە هاتین ـە سلێمانی.

ئەوان دایان بە ئازاد.
ئەوان دایان ـە ئازاد.

تۆمان نارد بۆ لای ئەو.
تۆمان نارد ـە لای ئەو.

گـەر کـاتی فـرمـانەکـە لە ئێسـتـەی تەواودا[1] بێ Present Perfect، پاشگرە فرمانییەکە قاڵبی (تە) ئەگرێتەخۆ.

ئێمە هێناومانە بۆ ئێرە.
ئێمە هێناومانە تە ئێرە

من ناردوومە بۆ بەغا.
من ناردوومە تە بەغا.

گەر ڕەگی فـــرمانەکە بەکۆنسونانت کۆتایی هاتبێ... بەنەمانی ڕاناوی لکاو لەگەڵ ڕەگی فەرمانەکە (وو) ئەبێ بە (ۆ) و فـرمانی بێ هێز (ـە) ئەتوێتەوە[2].

ئێمە ناردوومانە بۆ بەغا.
ئێمە ناردوومانە تە بەغا.
ئێمە ئازاد - مان نارد ۆ تە بەغا.

هەمان شت گەر فــرمانەکە تێنەپەڕ بوو و بکەری ڕستەکە لە کەسی سێیەمی تاکدا بێ - وەک باس کرا (وو) ئەبێ بە(ۆ) و فـــرمانی بێ هێز (ـە) ئەتوێتەوە[3].

ئەو ڕۆیشتووە بۆ هەولێر.

ئەو ڕۆیشتو تە هەولێر.
بەرزۆ بووە بە پیاو.
بەرزۆ بۆ تە پیاو.

لە ڕووی پەیوەندیی نێوان پریپۆزیشن و ئەو جۆرە فـرمانانە و جێگیرکردنیان بەپاشگر. فـرمانەکان ئەبن بە سێ بەشەوە.

بەشی یەکەم: ئەوانەن کە پریپۆزیشنەکەیان (بۆ)یە و هەمیشـە ئاوەڵکاری لە دوا دێ. وەک:

هاوێشتم بۆ ئاسمان ←—— هاوێشتمە ئاسمان.
ڕۆیشتم بۆ سلێمانی ←—— ڕۆیشتمە سلێمانی.
بردم بۆ قوتابخانە ←—— بردمە قوتابخانە.
هێنام بۆ هەولێر ←—— هێنامە هەولێر.
فڕیم بۆ ئاسمان ←—— فڕیە ئاسمان.
پەڕی بۆ چاوم ←—— پەڕییە چاوم.
خزی بۆ خوارەوە ←—— خزییە خوارەوە.

بەشی دووەم: ئەوانەن کـە پریپـۆزیشنەکـەیان (بە)یە و ناوەکـەی دوای ئەشێ چەمکی (کەسی)[٢] پێوەبێ.

بەخشیم بە ئەو ——> بەخشیمە ئەو.
بووم بەمامۆستا ——> بوومە مامۆستا.
کردم بەپیاو ——> کردمە پیاو.

بەشی سێیەم: ئەوانەن کە هەرگیز پریپۆزیشنیان لەگەڵا دەرناکەوێ... تەنیا بەهۆی پاشگری فـرمانییەوە ئەم حاڵەتەی پێ دەرئەبڕێ. وەک:

خستمە ناو دۆڵابەکە.
ڕشتمە سەر ئەرز.
کەوتە ناو چاڵەکە.

پەراوێزەکان:

١- ئێستـەی تەواو ئەو کارەیە کە لە ڕابردوودا دەست پێ ئەکاو ئەبڕێتەوە بەڵام تەئسیری تا سـەردەمی قسەکردن ئەمێنێ... وەک پێت بڵێم (فەرموو نان بخۆ) ئەڵێی (برسیم نییە خواردوومە). خواردنەکە لە ڕابردوودا دەستی پێ کردووە و براوەتەوە بەڵام تەئسیری تا کاتی قسەکردن ماوە. یاسای داڕشتنی ئەم کاتە لە زمانی کوردییا بەم جۆرەیە.

ـەکە تێپەڕبێ.

| | | |
|---|---|---|
| ڕەگی ڕابردوو + وو + | م<br>ت<br>ی<br><br>مان<br>تان<br>یان | ..... (تی)<br>+ ـە |

کە ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک (ی) چ دەوری هەیبێ (تملک) بگێڕێ چ ڕێکەوتن... لەگەڵ فـرمانی بێ هێز (ـە) دەرکەوێ... مۆرفیمی بۆش empty morpheme (تی) درای فەرمانە بێ هێزەکە دەرنەکەوێ.

**هەیی**

ئەو برا -م -ە
ئەو برا -ت -ە
**ئەو برا -ی -ە (تی)**
ئەو برا -مان -ە
ئەو برا -تان -ە
ئەو برا -یان -ە

**ڕێکەوتن**

من خوارد -وو -م -ە
تۆ خوارد -وو -ت -ە
**ئەو خوارد -وو -ی -ە - (تی)**
ئێمە خوارد -وو -مان -ە
ئێوە خوارد -وو -تان -ە
ئەوان -خوارد -وو -یان -ە

**ب- گەر فرمانەکە تێنەپەڕبێ.**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڕەگی ڕابردوو + وو + | م<br>یت<br>ـە<br>ین<br>ن<br>ن | هات - وو | م<br>یت<br>ە<br>ین<br>ن<br>ن |

٢- ئەو فـرمـانە لێكدراوانەی بەپاشـگری (ەوە)ی وەک (كـردنەوە - خـواردنەوە... هتـد) دائەڕێژرێن، لەكاتی ئیـستەی تەواودا پاشگری (ەوە) قالبی (تەوە) ئەگرێتە خۆ.

من هاتمەوە (ڕابردووی سادە)

من هاتووەمەتەوە (ئیستەی تەواو)

٣- ناو چەمكی كەسیی تیابێ وەک كەرەسەیێكی سیمانتیكی... ئەو ناوانە ئەگرێتەوە كەسێ بنوێنێ... وەک ئازاد - برا - ئەو... هتد.

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆژی كوردستان - كۆمەڵەی ڕۆشنبیریی كورد - بەغدا، ژمارە (٦٦) ساڵی ١٩٨٤، لاپەڕە ٥١-٥٢ بڵاوكراوەتەوە.**

## ئامرازەکانی بەستن

یەکێ لە ئامانجەکانی ڕێزمان دەستنیشانکردنی پەیوەندیی نێوان بەشەکانی ڕستەیە. ڕوونکی ئەم پەیوەندییە لە چۆنیەتی لەیەکدانی وشەکاندایە.

لە زمانی کوردیدا... سێ ئامرازی بەستن Conjunction هەیە. (ناو و ناو) و (ناو و ناوەڵناو) لەناو چوارچێوەی ڕستەدا لەیەک ئەدەن کە ئەمانەن (و - ی - ـە). هەریەکە ئەرکی تایبەتیی خۆی هەیە و لە حاڵەتێکی تایبەتیدا دەرئەکەوێ.

یەکێ لە یاساکانی ڕێزمانی کوردی ئەوەیە بکەر یا بەرکار (ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ... هتد) لە ناوێک یا زیاتر پێک دێت. ئامرازی لەیەکدانی ئەم ناوانە (و) یا (ی)یە. واتا هەموو ناوە لێکدراوەکان بەهۆی ئەم دوو ئامرازە ئەتوانن دەوری بەشێکی بنجیی ڕستەی وەک بکەر و بەرکار... هتد ببینن. جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە لێکدانە لەوەدایە، ئەو ناوانەی بە (و) لە یەک ئەدرێن هەموو بەشداری لە ڕووداوی فرمانەکە ئەکەن بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێیان سپێرراوە. وەک لەم نموونانەدا دەرئەکەوێ:

أ- ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ... هاتن.

ب- من ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ ئەبینم.

ج- من نامە بۆ ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ ئەنێرم.

ئەم چوار ناوە (ئازاد - ڕزگار - ئاواز - ئاهەنگ) بەئامرازی بەستن (و) لێکدراون. لە ڕستەی (أ) دەوری بکەریی ڕستەکە ئەبینن هەرچواریان لە (هاتن)دا بەشدارن.

لە ڕستەی (ب) دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکە ئەبینن. هەرچواریان بەشدارن لەوەی کە ئەبینرێن.

لە ڕستەی (ج) دەوری بەرکاری ناڕاستەوخۆی ڕستەکە ئەبینن... هەرچوار بەشدارن لەوەی کە نامەیان بۆ ئەنێررێ.

لەلایێکی ترەوە ئەو ناوانەی بە (ی) لێک ئەدرێن پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا لەسەر بناغەی هەیی دایە (Possessive). تەنیا ناوی یەکەم ڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێی سپێرراوە بەجێ ئەهێنێ. ئەم ناوەش سەر بەناوی دووەم ئەبێ و ناوی دووەم سەر بەناوی سێیەم ئەبێ و بەم جۆرە... وەک لەم نموونانەدا دەرئەکەوێ:

د- برای مامۆستای کوڕی خوشکم هات.
هـ- من برای مامۆستای کوڕی خوشکم ئەبینم.
و- من نامە بۆ برای مامۆستای کوڕی خوشکم ئەنێرم.

لەم ڕستانەدا... (برا - مامۆستا - کوڕ - خوشک) هەموو ناون بەئامرازی بەستن (ی) لەیەک دراون. لە ڕستەی (د) هەموو بەیەکەوە دەوری بکەری ئەبینن لە ڕستەی (هـ) دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆ و لە ڕستەی (و) دەوری بەرکاری ناڕاستەوخۆ ئەبینن.

لە هەموویانا تەنیا (برا)یە ڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێی سپێرراوە بەجێ ئەهێنێ. تەنیا (برا)یە لە ڕستەی (د) هاتووە و لە (هـ)دا ئەبینرێ و لە (و)دا نامەی بۆ ئەنێررێ. ئەم (برا)یە هی (مامۆستا)یە و (مامۆستا) هی (کوڕ)ە و (کوڕ) هی (خوشکم)ە.

یاسای لەیەکدانی ناوەکان لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

لەناو چوارچێوەی بەشە بنچینەییەکانی ڕستە هەر ناوەی ئەشێ ناوەڵناوێ یا زیاتری لەگەڵا دەرکەوێ. گەر هات و ناوەکە ئامرازی پێناسین (ەکە)ی لەگەڵا بوو. ناوەکە بەناوەڵناوی یەکەم و ناوەڵناوەکان بەیەکەوە بەئامرازی بەستن (ـە) لەیەک ئەدرێن. ئامرازی پێناسین (ەکە) لەم حاڵەتەدا ئەچێتە سەر دوا ناوەڵناوەوە.

ئامرازی کۆ (ان) هەمیشە بە(ەکە)ی پێناسینەوە ئەلکێ.

درەختەکان

درەختە بەرزەکان

درەختە بەرزە سەوزەکان

ڕاناوی نیـشـاندانیش (ئەمـە - ئەوە - ئەمـانە - ئەوانە) چەمکی ناسـینیـان هەیە، چونکە بەپێی لۆجیک کە پەنجە بۆ شتێ ڕائەکێشی پێی ئەناسێنێ... بۆیە گەر لەگەڵ ناوا دەرکەوێ ناو و ئاوەڵناوەکان بەئامرازی (ـە) لەیەک ئەدرێن.

کە ناو یا نـاو و ئاوەڵناو ئەچنە سـەر ڕاناوی نیـشـاندان... ئەبنە دوو بەش بەم جـۆرەی خوارەوە:

ئەم ـــــ ـە

ئەو ـــــ ـە

ئەم ـــــ انە

ئەو ـــــ انە

ناو و ئاوەڵناوەکان ئەچنە نێوانیانەوە

لە هەموو حاڵەتێکی تردا ناو و ناوەڵناو بە(ی) لەیەک ئەدرێن.

**تێبینی:** ئامرازی پێناسین (ەکە) و بێ نەناسین (ێک) و (ڕاناوی نیشاندان)... هەرگیز هیچ کامێکیان لەگەڵ ئەوانی ترا دەرناکەوێ.

× نیشانەی لەگەڵ یەکتر دەرنەکەوتنە Ø نیشانەیە بۆ ئەوەی کە ناو هیچ ئامرازێکی لەگەڵا دەرناکەوێ.

یاساکانی لەیەکدانی ناو و ناوەڵناو هەموو لەم وێنەیەدا کۆکراونەتەوە.

ئەوەی سەرنج ڕاتەکێشێ ئەوەیە، ئامرازی لەیەکدانی (ناو و ناو) و (ڕستە و ڕستە) هەمان شتە، کە (و)یە. هۆی ئەمە ئەوەیە ئەم دوو جۆرە لەیەکدانە یەک بنچیان هەیە. لەیەکدانی(ناو وناو)ئەنجامی لابردنی بەشە هاوئەرکە لەیەک چووەکانە لە چەن ڕستەیەکی لەیەکدراو بەیاسایێکی ئابووری. بەپێی ئەم بۆچوونە ڕستەی:

من و ئازاد و ڕزگار هاتین.

لە بناغەدا ئەم سێ ڕستەیەیە.

من هاتم و ئازاد هات و ڕزگار هات.

ئەم سێ ڕستەیە بە(و) لەیەک دراون. فرمانی (هاتن) لە هەر سێکیانا دووبارە بۆتەوە.

بۆ خۆ لادان لەم دووبارە بوونەوەیە تەنیا یەکێکیان بەجێ ئەهێلرێ و ئەوانی تر لائەبرێن. لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردییا فرمان هەمیشە لە کۆتایی ڕستەدا دێ فرمانی دوا ڕستە بەجێ ئەهێلرێ و ئەوانی تر لائەبرێن. تا لە ڕستە تازەکەدا فرمان لە شوێنی سروشتی خۆی بێ ڕاناوی لکاوی دوا فرمانیش لائەبرێ.

سێ بکەرەکە یەک ئەگرن هەموو بەیەکەوە ئەبن بە(من و ئازاد و ڕزگار). ئەمانە هەموو بەیەکەوە شوێنی (ئێمە) ئەگرن. بۆ ڕێکەوتن ڕاناوێکی لکاو بە فرمانەکەوە ئەلکێنرێ بگونجێ لەگەڵ کەس و ژمارەی بکەرە تازەکە.

من هاتم و ئازاد هات و ڕزگار هات.

من و ئازاد و ڕزگار هاتین

گەر بەرکار لە چەند ناوێکا پێک هاتبێ ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە (بکەر) و ( فەرمان)ی چەن ڕستەیێ هەمان شتن و بەهەمان پەیڕەو لابراون. وەک لە ڕستەی.

من تۆ و ڕزگار و ئازاد ئەبینم.

بناغەکەی ئەم ڕستەیەیە.

من تۆ ئەبینم و من ڕزگار ئەبینم و من ئازاد ئەبینم.

چونکە بکەر لە زمانی کوردیدا لە سەرەتای ڕستە دەرئەکەوێ.. بۆیە بکەری ڕستەی یەکەم بەجێ ئەهێڵرێ و ئەوانی تر هەموو لائەبرێن تا لە ڕستە تازەکەدا شوێنی سروشتیی خۆی بگرێ. چونکە فەرمان لە کۆتایی ڕستەی کوریدا دەرئەکەوێ.. بۆیە فەرمانی ڕستەی یەکەم و دووەم لائەبرێ و هی دوا ڕستە بەجێ ئەهێڵرێ.. تا لە ڕستە تازەکەدا شوێنی سروشتیی خۆی بگرێ.

من تۆ ئەبینم و من ڕزگار ئەبینم و من ئازاد ئەبینم.

من تۆ و ڕزگار و ئازاد ئەبینم.

ئامرازەکانی بەستن هەموو بەپێی ئەرکیان لەم ئەخشەیەدا ڕوون کراونەتەوە.

- و
  - ڕستە + ڕستە...
  - ناو + ناو...
    - بەشداری
    - هەیی
- ی
  - ناو + ناو...
  - ناو + ناوەڵناو...
    - (- ەکە)
    - (+ ەکە)
- ە
  - ناو + ناوەڵناو...

سەرچاوەکان:


1- Hudoleston, R. (1976) An Introduction to English Transformatinal Syntax. London.

2-Smith, N. and Wilson, D. (1979) Modem Linguistics, London.

3- Simpson, J. M. Y. (1979) A first course in Linguistics. Edinburgh.

٤- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاریی کورد - بەغدا.



* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆژی کوردستان - کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کورد - بەغدا، ژمارە (٦٧) ساڵی ١٩٨٤، لاپەڕە ٢٨-٣١ بڵاوکراوەتەوە.

# ڕێزمان چییه

بچووکترین و سادەترین کەرەسە لە زمانا ئەو تاکە دەنگانەن کە بەهۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست ئەکرێن. گەورەترین و ئاڵۆزترین دانەش لە (ڕێزمانی) زمانا ڕستەیە. پەیوەندیی نێوان دەنگ و ڕستە لەسەر پەیڕەوێکی هەرەمیی ئەم جۆرە دامەزراوە.

واتا: بەهۆی ئەو نرخانەی تاکە دەنگەکانی زمان لەناو چوارچێوەی زمانێکی تایبەتیدا پێشانی ئەدەن فۆنیمەکانی زمانەکە دەستنیشان ئەکەن. لەناو قاڵبی برگەکاندا... بەفۆنیمێ یا زیاتر مۆرفیم پێک دێت (مۆرفیم بچووکترین دانە واتاداری زمانە). بەمۆرفیمێ یا زیاتر وشە پێک دێت بەوشەیێ یا زیاتر فرێز پێک دێت... چەند فرێزێکیش ڕستە پێک ئەهێنن. دەستنیشان کردنی سروشت و چۆنیەتی پێکهاتنی ئەم کەرەسانە (دەنگ - فۆنیم - برگە - مۆرفیم - وشە - فرێز) و پیشاندانی جۆری پەیوەندیی نێوانیان و چۆنیەتی لەیەکدانیان لەناو چوارچێوەی ڕستەدا ڕێزمانی زمانەکەیە.

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆژی کوردستان - کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کورد - بەغدا، ژمارە (٦٩)ساڵی ١٩٨٦، لاپەڕە ٢٥ بلاوکراوەتەوە.**

# کەی (ات) و... کەی (ێت)

ڕاناوەکانی زمانی کوردی (کرمانجی خواروو) لەم خشتەیەدا ڕوون کراونەتەوە...

| ژمارە | کەس | جودا | ڕاناوی جودا | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | ١ | ٢ | ٣ |
| تاک | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | - | ات/ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

ئەرکی سەرەکیی ڕاناوە لکاوەکان[1] ئەوەیە لەگەڵ فرمانا دەرئەکەون بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەگەڵ بکەرا -واتا فرمان ڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارەی بکەری لەگەڵا دەرئەکەوێ و بەم جۆرە:

کۆمەڵی یەکەم لەگەڵ تێپەڕی ڕابردوو.

کۆمەڵی دووەم لەگەڵ تێنەپەڕی ڕابردوو.

کۆمەڵی سێیەم لەگەڵ تێپەڕ و تێنەپەڕی داهاتوو.

لە کۆمەڵی دووەم و سێیەما... ئەشێ (ت)ی کەسی دووەم و سێیەمی تاک لابرێ گەر پرپێۆزیشن بەپاشبەندێکی فرمانی دەرنەبڕابێ[2].

ئەچێت بۆ هەولێر

ئەچێ بۆ هەولێر. [(ت) لابرا]

ئەچێتە هەولێر. [ناشێ (ت) لابرێ]

ئەوەی سەرنج ڕائەکێشێ ئەوەیە (ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی کۆمەڵی سێیەم

دوو قـالبی هەیە... (ات) و (ێت) یا (ا) و (ێ) گـەر (ت) لابرا. واتا (ات) و (ێت) دوو ئەلەمـۆرفی هەمـان مۆرفین لە دوو بیـنەی فـۆنۆلۆجیی جیـاواز دەرئەکەون. یاسـای دەرکەوتنیان بەم جۆرەیە.

گـەر ڕەگی داهاتووی فـرمـان بە(ۆ) یا (ـە) کۆتایی هاتبێ، ڕاناوە لکاوەکـە قـاڵبی (ات) ئەگرێتە خۆ.. لەم حاڵەتەدا (ۆ) ئەبێ بە(و)ی کپ (w) و (ـە) ئەتوێتەوە.

| چاووگ | ڕەگی داهاتوو | ئێستا کەسی سێیەم |
|---|---|---|
| خواردن | خۆ | ئەخۆ - ات ⟵ ئەخوات |
| ڕۆیشتن | ڕۆ | ئەڕۆ - ات ⟵ ئەڕوات |
| کردن | کە | ئەکە - ات ⟵ ئەکات |
| بردن | بە | ئەبە - ات ⟵ ئەبات |

لە هەموو حاڵەتێکی تردا ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک لەگەڵ کاتی داهاتووی فرمانا بە(ێت) دەرئەکەوێ...

| چاووگ | ڕەگی داهاتوو | سێیەمی تاک |
|---|---|---|
| پرسین | پرس | ئەپرسێت |
| چوون | چ | ئەچێت |
| مردن | مر | ئەمرێت |
| شکان | شکێ | ئەشکێت |
| نوستن | نوو | ئەنووێت |

پەراوێز و سەرچاوەکان:

١- سیستەمی کارکردنی ڕاناوە لکاوەکان لە لایەنە هەرە ئاڵۆزەکانی ڕێزمانی کوردییە سەیری ئەم وتارانەم بکەن تیایانا هەوڵ ئەدەم تیشکێ بخەمە سەر ئەم لایەنەی ڕێزمانی کوردی:

أ- لایەنێکی جیاوازی، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق، دەستەی کورد، ژمارە (١٠) ساڵی ١٩٨٢ ل ٢٥٤-٢٧٦.

ب- ڕێزمانی ڕاناوی لکاو، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٨) ساڵی ١٩٨٣.

٢- سەیری ئەم وتارە بکەن:
وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤)، یاسایێکی فۆنۆلۆجی، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە (٦٦).
ئەم دیاردەیەی ڕێزمانی کوردی شی ئەکاتەوە و یاساکەی دەستنیشان ئەکات.
٣- لە ل١٣ی ئەم کتێبەم ئەم یاسایەم ڕوون کردۆتەوە.

3- Amin, W. O. (1976) "Some Fandamental rules of Kurdish Syntax Stucture" London.

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆژی کوردستان - کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد - بەغدا، ژمارە (٧٠) ساڵی ١٩٨٥، لاپەڕە ٢٠-٢١ بڵاوکراوەتەوە.**

## یاسای دەرکەوتنی (ر)

لەگەڵ فرمانی (دان)دا ئەگەر بەرکاری ناڕاستەوخۆ بەڕاناوێکی لکاو دەربڕا[1] پێشبەندی[2] (بە) دبێتە پاشبەندێکی فەرمانی[3] و قاڵبی (ێ) دەگرێتەخۆ.

لێرە دوو بزوێنی (ـە) و (ێ) هاتنە پاڵ یەک (ی)ی کپ لە نێوانیانا دەرکەوت و بوو بە(بدەیێ) لە هەندێ شێوەدا لەجیاتی ئەم (ی)یە (ر) دەرنەکەوێ و دەبێتە:

کتێبەکەم بدەرێ.

گەر بەرکاری ڕاستەوخۆ (کتێبەکان) لابرا ڕاناوە لکاوەکە دەچێتە سەر پێشگری (بـ) و دەبێتە:

مەدرێ.

فەرمانەکە داخوازیی تاکە. گەر بکرێتە کۆ ئامرازی کۆی داخوازی (ن) لە دوای ڕەگی فەرمانی (دە) دەردەکەوێ. ئەوسا پێویست بەم (ی) یا (ر)یە ناکات.

هەمان شت لەگەڵ فـرمانی (گەیشتن، خستن) بردن... هتد.

پەراوێزەکان:

١- بۆ دەوری بەرکاری ڕاناوە لکاوەکان سەیری ئەم وتاردم بکەن.
ڕێزمانی ڕاناوی لکاو - گۆڤاری کاروان ژ٨ (١٩٨٣). ل ٦٨-٧٤.

2- Preposition

3- Verbal Postosition.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆژی کوردستان - کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کورد - بەغدا، ژمارە (٧٢) ساڵی ١٩٨٦، لاپەرە ١٩-٢٠ بڵاوکراوەتەوە.

# زانستی زمان

ئادەمیزاد لەوەتی هەبووە و بیری کردۆتەوە سەری لە بوونی خۆی سوڕماوە. ویستوویەتی بزانێ چییە و بۆ هەیە. ئەم سروشتەی دەوروبەری چییە و چۆن پەیدا بووە. سەرەتا چۆن بووە.

ئەم ئارەزووە بەتینەی حەز لە خۆناسینکردن پاڵی پێوە ناوە بەشوێن خۆیا بگەڕێ. بۆیە ئەبینین ئەم مەسەلەیە لە هەموو ئایینێک و میسۆلۆجیایێک و فەلسەفەیێک دەنگی داوەتەوە. هەر یەکە چیرۆکی تایبەتیی خۆی دەربارەی مەسەلەی بوون هەیە. فەیلەسووفان بەدرێژایی مێژوو لەم مەسەلەیەیان کۆڵیوەتەوە و لێکیان داوەتەوە و هەوڵی وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە سەرەکییانەیان داوە.

سروشت یەگجار فراوان و ئاڵۆز و چووە ناویەکە. سنووردارێی تەمەن و توانای ئەدەمیزاد ڕێگەی ئەوەی لێ بڕیوە بتوانێ بیر لە هەموو لایەنێکی ئەم سروشتە بکاتەوە بۆیە ئادەمیزاد پشت لە دوای پشت دابەش بۆتە سەر سەدەها کۆمەڵی جیاجیا. هەر کۆمەڵەی خەریکی شیکردنەوە و تێگەیشتنی لایەنێکی یا بەشێکی لایەنێکی ئەم سروشتەیە - سوپاس بۆ نووسین و چاپەمەنی کە تەجرەبە و دەسکەوتەکانی پشتە ڕابردووەکان بەداهاتووەکان ئەگەیەنێ.

هەوڵدانی ئادەمیزاد بۆ بەکارهێنانی هێز و دیاردەکانی سروشت بۆ بەرژەوەندی خۆی دەورێکی باڵای بینیوە لە ئاشکراکردنی گەلێ لە نهێنییەکانی. بۆ نموونە ئەوانەی ئەبن بەپزیشک ئەیانەوێ لە چۆنیەتی پێکهاتن و کارکردنی لەشی ئادەمیزاد بگەن و ئەو یاسا و نیزام و پەیوەندییانەی لە نێوان ئەندامەکاندا هەن بدۆزنەوە. تا ئەگەر گیروگرفتێ لە تەندروستیدا ڕووی دا چارەسەر بکرێ. لەوانەیە مەبەستی ڕاستەوخۆی زۆربەی زۆری ئەوانەی ئەبن بەپزیشک مرۆڤایەتی یا ماددەبێ. بەلام لە پاڵ ئەمەدا مەبەستێکی مەزنی تری دوور، لە ژوور ئەمەدا هەیە. بەم کارەیان زانیاری دەربارەی چۆنیەتی پێکهاتن و کارکردنی لەشی ئادەمیزاد کۆ ئەکرێتەوە... ئەمە هەوڵدانێکی ژوور هۆشییە Un-conscious بۆ تێگەیشتن و زانینی لایەنێکی ئەم سروشتە کە بەشداری ئەکات لەوەی تیشک بخاتە سەر یەکێ لە نهێنییەکانی. هەموو لقێکی تری زانست بەم جۆرە

ئامانجێکی دوور و ناڕاستەوخۆی هەیە ئەویش هەڵدانەوەی پەردەی نهێنییەکانی سروشتە و گەیشتنە وەڵامی پرسیاری بوونە.

بەسایەی تێکۆشانی ئادەمیزاد خۆی ملیۆنەها پرسیاری سەرسوڕهێنەر دەربارەی خۆی و ئەم سروشتەی دەوروبەری ئیمڕۆ بەئاسانی و لەسەر بناغەیەکی مەنتیقی وەڵامیان ئەدرێتەوە کە جاران وەڵامەکانیان لەسەر بناغەی ئەفسانەیی ئەدرایەوە. چەندی پێ چوو تا مرۆڤ گەیشتە ئەو ڕادەیەی توانی بزانی شێوەی ئەم زەمینەی لەسەریایە چۆنە و شوێنی لە جیهانا و پەیوەندیی لەگەڵ مانگ و هەتاو و ئەستێرەکاندا چییە؟ ئەمە چیرۆکێکی یەگجار بەتامە ئەوە ئەهێنێ هەریەکە ئەختێ خۆی بەزانستی فەلەک خەریک کا تا لاپەڕەکانی گشتی تێکۆشانی ئادەمیزاد لەپێناو ناسینی خۆیی بۆ دەرکەوێ.

با بێینەوە سەر ئادەمیزاد کە بوونی یەکێکە لە هەرە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەم سروشتە. بریتییە لە سەدەها سیستەمی ئاڵۆز و چووە ناویەک. ئەو زانایانەی خەریکی ئەوەن بزانن ئادەمیزاد چییە دابەش بوونەتە سەر گەلێ کۆمەڵی جیاجیا. هەر کۆمەڵەی لە سووچێکەوە خەریکی لایەنێکیەتی. بەشێ بەتەنگ ئەوەدان بزانن ئادەمیزاد چۆن پەیدا بووە. بەشێ ئەیانەوێ ئەو قۆناغانە دەسنیشانکەن کە ئادەمیزدا لە بەری بەیانی پەیدابوونییەوە پیایاندا تێپەڕیوە. بەشێ خەریکن لەو ڕەگەزە جیاوازانە (ڕەگەزی ڕەش، سپی، زەرد، سوور) ئەکۆڵنەوە. بەشێ خەریکن لە ئادمیزاد بگەن وەک هەیە... هتد.

ئەوانەی ئەیانەوێ لە ئادەمیزاد بگەن وەک هەیە ئەیانەوێ لە چۆنیەتی پێکهاتن و کارکردنی لەشی بگەن. چاو چۆن ئەبینێ؟ گوێ چۆن ئەبیستێ؟ هەناسە چۆن وەرئەگیرێ؟ خوێن چۆن ئەسووڕێتەوە؟... هتد بارەگای هەڵسووڕاندنی هەموو ئەم دەزگایانە مێشکە. واتا هەر سیستەمێکی لەش مێشک بەشەکیەتی. جگە لەوەی مێشک هەموو ئەندامانی لەش بەڕێوە ئەبات سەرچاوەی بیرکردنەوە و شوێنی پاراستنی زانیاریشە. هەریەکە لە ئێمە چەن شت ئەزانێ، چەن شوێن و کەس ئەناسێ، چەن کارەساتی بەسەرا هاتووە... چەن خۆشی و شادیی بینیوە هەموو لەم مێشکە بچووکەدا پارێزراوە. کەی باسی شتێ کرا هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بەو شتەوە هەیە یەکسەر دێنە یاد و بەرچاو. ئەمە چ توانایەکە؟ ئەم زانیارییانە لە ڕێی هەستەکانەوە ئەچێتە ناو مێشک و لە ڕێی زمانەوە دەرئەهێنرێ.

واتا گەر ئێمە لە سروشتی زمان بگەین لەوانەیە تا ڕادەیەکی زۆر لە سروشت و

چۆنیەتی کارکردنی مێشک بکەین. کەی لە چۆنیەتی کارکردن و سروشتی مێشک گەیشتین ئەوە لە یەکێ لە نهێنییەکانی لایەنێکی هەرە گرنگی ئەم سروشتە گەیشتین. لێرە گرنگێتی زمان دەردەکەوێ. ئەو بەشەی زانست کە تەرخان کراوە بۆ تێگەیشتنی مێشک لە رێی زمانەوە بە (neuro Linguistics) ناو ئەبرێ. باشە زمان خۆی چییە و چۆن پەیدا بووە؟ بۆ یەک زمان لە جیهاندا نییە؟ بۆ هەموو زمانێ چەند شێوەیەکی هەیە؟ بۆ هەندێ زمان سەرەڕای دووری جوغرافییان لەیەک زۆر لەیەک ئەکەن و هەندێ زمان سەرەڕای دراوسێیەتیان زۆر جیاوازن؟ چۆن ئادەمیزاد ئەتوانێ ئەم بیر و خەیالانەی لە مێشکییا هەن یەکسەر بکاتە ڕیزە دەنگێک و گوێگر -گەر سەر بەهەمان زمان بێ- تێی ئەگات بێ ئەوەی ئەو شتەی پێشتر بیستبێ یا وتبێتی یا زانیبێتی... هتد. ئەو بەشەی زانست کە شوێن وەڵامی ئەم پرسیارانە کەوتووە زانستی زمانە Linguistics. واتا زانستی زمان ئەو بەشەی زانستە کە هەوڵ ئەدا بزانێ زمان چییە. لێرە کە ئەڵێین (زمان مەبەستمان زمانە بەگشتی وەک دیاردەیەکی ئینسانی) نەک زمانێکی تایبەتی. چونکە هیچ کۆمەڵە ئادەمیزادێ نییە لە جیهاندا زمانی نەبێ. هەمووش هەمان ئەرک بەهەمان ڕێگە بەجێ ئەهێنن، ئەویش گواستنەوەی ئەو بیر و خەیالانەی لە مێشکا هەیە بەهۆی کۆمەڵە دەنگێکی بەزار دروستکراو بۆ بەرامبەر. ئەمە ئەوە ئەسەلمێنێ کە هەموو زمانانی جیهانی لە هەمان پلەی پەرەسەندندان و هەموو بەقەد یەک ئاڵۆزن و ئەو زمانانەی گوایا پێیان ئەوترێ بیدائی بوونیان نییە. واتا یەک بناغەی بنجی هەیە هەموو زمانانی جیهان لەسەریا دامەزراوە. یا کۆمەڵە یاسایەکی بنجی هەن هەموو زمانانی جیهان تیایاندا بەشدارن و بەهۆیانەوە کارئەکەن. ئەرکی زانستی زمان تێگەیشتنی سروشتی ئەم بناغە گشتییەیە و دۆزینەوەی ئەو یاسا بنجییانەیە کە هەموو زمانانی جیهان تیایا بەشدارن و بەهۆیانەوە کارئەکەن.

هەر دیاردەیەکی سروشتی بەلای کەمییەوە لە چوار لایەنەوە لێی ئەکۆڵرێتەوە.

١- باری ئێستەی چۆنە و چۆن کار ئەکات. ئەمە لایەنی وەسفی ئەگرێتەوە.

٢- ئەو پلە و قۆناغانەی پیا تێپەڕیوە. ئەمە لایەنی مێژوویی ئەگرێتەوە.

٣- گەلێ سیستەمی تر هەن لە سروشتا... بەم چوو و جیاواز لێی بەراورد ئەکرێن ئەمە لایەنی بەراوردی ئەگرێتەوە.

٤- لە سەرەتادا وەک دیاردەیەکی سروشتی چۆن پەیدا بووە (واتا نژادی).

زمـانیش لەم یاسـا گـشـتـیـیـە بەدەر نیـیـە. لەم چوار ڕووەوە سـەیری ئەکـرێت و لێی ئەکۆڵرێتـەوە. واتا زانسـتی زمان وەک هەمـوو لقێکی تری زانست چوار لقی گشـتی لێ ئەبێتەوە.

۱- **زانستی زمانی وەسفی** Discriptive Linguistics

ئەم لقە بایەخ بەشیکردنەوە و پێشاندانی شێوە و چۆنیەتی کارکردنی زمان ئەدات، کە لەلایەن کۆمەڵێک خەڵکەوە لە کاتێکی دەسنیشانکراوا بەکار ئەهێنرێت.

کاتەکە ئەشێ ئێستا بێ و ئەشێ ڕابردووبێ. ئەو زمانانەی هێشتا خۆیان ئەخستۆتە ناو چوارچێوەی نووسین بێگومان ناکرێ شێوەی پێشوویان پیشان بدرێ. ئەتوانرێت باسی شێوەی قۆناغە ڕابردووەکانی زمان بکرێ و لێی بکۆڵرێتەوە کەی نووسراوی ئەو قۆناغانە بەدەستەوە بوون.

لێکۆڵینەوەی زمان لەسـەر بناغەی زانسـتی زمانی وەسفی بایەخ بەزمانەکە ئەدات تەنیا لەو سـاتە تایبەتیـیەدا. واتا، لەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەدا نابێ باسی هیچ قۆناغێکی تری زمـانەکە بکرێت. هەروا نابێ باسی هیچ زمـانێکی تر بکرێت چ دوور چ نزیک. زانسـتی زمانی وەسفی بەگرنگترین لقەکانی زانسـتی زمان ئەژمێررێ، چونکە بەبێ بەجێهێنانی ئەم لقە لقەکانی تر بەجێ ناهێنرێن.

۲- **زانستی زمانی مێژوویی** Historical Linguistics

لێکۆڵینەوەیە لە پەرەسـەندن و گـۆڕینی زمـان بەتێـپـەڕینی کـات و ڕێگە و هۆی ئەم گـۆڕینانە لە کـاتێکەوە بۆ کـاتێ و دۆزینـەوە و دەسنیـشـانکردنی ئەو هۆیانەی کـار ئەکـەنە سەر زمان و ئەیگۆڕن.

ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە ئەبێ لەسەر بناغەی پێشـاندانی لایەنە لەیەکچوو و جیاوازەکانی هەمان زمان یا شێوە لە دوو یا چەند قۆناغێکی جیاوازدا دامەزرابێ.

۳- **زانستی زمانی بەراوردی** Comparative Linguistics

لە زانسـتی زمـانی بەراوردیدا یا دوو یا چەند زمانێ یا شێوەیێ یا هەمان زمـان یا شێوە لە دوو قۆناغی جیاوازا لە یەک یا چەند ڕوویەکەوە بەراورد ئەکرێن.

زانستی زمانی بەراوردی دوو لقە:

أ- بەراوردکردن لەسەر بناغەی پەیوەندیی مێژوویی لە نێوان دوو یا کۆمەڵێک زمان بۆ دۆزینەوەی ڕادەی پەیوەندی مێژوویی و خزمایەتی نێوان ئەم زمانە و دووری و نزیکییان لە یەک و دۆزینەوەی ئەو زمانانەی سەر بەیەک بنەماڵەن Gentic classification.

ب- بەراوردکردنی دوو یا چەند زمانێ بۆ پیشاندانی لایەنە جیاواز و لەیەکچووەکانیان بێ ئەوەی گرنگیی بدرێتە پەیوەندیی مێژووی نێوانیان. مەبەست لەم جۆرە بەراوردکردنە دۆزینەوەی ئەو کەرەسە و یاسایانەیە کە کۆمەڵە زمانێ تیایا بەشدارن. ئەم جۆرە دابەشکردنە بە Typological Classifiction ناو ئەبرێت.

٤- نـژادی زمان The origin of language

ئەم بەشەی زانستی زمان هەوڵ ئەدا بزانێ لە سەرەتادا زمان چۆن پەیدا بووە. لێرە ئەڵێین (زمان) نەک (زمانێکی تایبەتی). واتا پەیدابوونی زمان بەگشتی وەک دیاردەیەکی سروشتی و ئینسانی، نەک زمانی کوردی یا عەرەبی... هتد. جیاوازی هەیە لە نێوان (نەژادی زمان) و (نەژادی زمانی کوردی) هەروەک چۆن جیاوازی هەیە لە نێوان (نەژادی ئادەمیزاد) و (نەژادی من یا تۆ...)

زمان پەیوەندیی لەگەڵ گەلێ لایەنی ئەم ژیان و سروشتە هەیە. لە ڕووی هەموو ئەم لایانانەوە ئەشێ شی بکرێتەوە و لێی بکۆڵرێتەوە. بەم جۆرە زانستی زمان یەکجار فراوان بووە. جگە لەم لقانەی باس کران گەلێ لقی تری وەک ئەوانەی خوارەوە دەسنیشان ئەکرێن:

١- زانستی زمانی دەروونی Psycholinguistics
٢- زانستی زمانی کۆمەڵایەتی Sociolinguistics
٣- زانستی زمانی دەماری Neurolinguistics

... هتد

بەڵام ئەم چوار لقەی سەرەوە لە هەمووان گرنگترن چونکە هەوڵ ئەدەن لە چەمکی زمان بگەن وەک دیاردەیەکی سروشتی.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (٨٨) ساڵی ١٩٨١، لاپەڕە ٩٢-٣١ بڵاوکراوەتەوە.

# ڕێککەوتن لە زماندا

لەگەڵێ زماناندا... هەندێ لە بەشەکانی ڕستە لەگەڵ یەک ڕێک دەکەون لە ڕووی یەک یا زیاتر لە چەمکی گرامەریی وەک کەس Person، ژمارە Number، جنس Gender و دۆخ Case. ئەم وتارە هەوڵدانێکە بۆ پێشاندانی سروشتی ڕێککەوتن Agreement لە زماندا بەگشتی و شوێنی زمانی کوردی لەناو سیستەمی ڕێکەوتندا.

١- کەس: یەکەم و دووەم و سێیەم دەستنیشانکراون.

أ- یەکەم: قسەکەر دەگرێتەوە (من، ئێمە و، هەموو ئەو وشانەی دەتوانن لە ڕستەدا جێیان بگرن).

ب- دووەم: قسە بۆکراو دەگرێتەوە (تۆ، ئێوە و، هەموو ئەو وشانەی دەتوانن لە ڕستەدا جێیان بگرن).

ج- سێیەم: قسە لەسەرکراو دەگرێتەوە (ئەو، ئەوان و، هەموو ئەو وشانەی دەتوانن لە ڕستەدا جێیان بگرن).

٢- ژمارە: لە ژمارەدا تاک Single و جووت dual و سیانی Trial و کۆ Plural دەستنیشان دەکرێت.

تاک: ئەوەیە وشەکە لە ڕووی چەمکی سیمانتیکییەوە ئیشارەت بێ بۆ تاکە شتێ یا کەسێ. (بەرد، تۆ، ئەو...). لە هەندێ زماناندا کۆ لە دووەوە دەس پێ دەکات وەک لە زمانی کوردی و تورکی و ئینگلیزی.

| | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| کوردی | من | ئێمە |
| تورکی | ben | biz |
| ئینگلیزی | I | We |

لە هەندێ زماناندا کۆ لە (سێ)وە دەس پێ دەکات وەک لە زمانی عەرەبی و سەنسەکریتی و چەند زمانێکی سلۆڤانیکی. واتا لەم جۆرە زمانانە لە ڕووی ژمارەوە تاک و جووت و کۆ دەستنیشان دەکرێن.

| کۆ | جووت | تاک |
|---|---|---|
| أولاد | ولدان | ولد |
| أنتم | انتما | انت |

زمـانی واش هەیە کـۆی لە چواردوە ددس پێ ددکـات. واتا لـەم جـۆرە زمـانانە تاک و جووت و سیانی و کۆ دەسنیـشـان دەکرێن. وەک لە زمانی فیجینی Fijian و تـیگری Tigre.[1]

٣- جنس: سێ جۆر جنس لە زمان دەسنیشان کراوە.

ا- نێر Masculine ب- مێ Feminine ج- بێ لایەن Nuter

زمانە جیاوازەکانی جیهان جیاوازی پێشان دەدەن لە ڕووی هەبوون و نەبوون و چۆنیەتی دەرکەوتنی جنس تێیـاندا لە هەندێ زمـاندا جنس هیچ جـیـا ناکـرێتـەوە وەک لە زمـانی تورکی. زمـانی واش هەیە لە هەندێ شـوێنیـدا جنس جـیـا دەکـرێتـەوە وەک لە زمـانی ئینگلیزی کە تەنیا لە ڕاناوی کەسی سێیەمدا جیا دەکرێتەوە (he - نێر، she - مێ، it - بێ لایەن) هەموو ئەمانە مانای (ئەو) دەگەیەنن.

لە کوردیی خوارووشدا لە نیدادا Vocative نەبێ جنس جیا ناکرێتەوە. (کوڕە، مامە، بەرامبەر کچێ، پووری).

لە هەندێ زماندا نێر و مێ جیا دەکرێنەوە وەک لە زمانی عەرەبی.

| | مێینە | نێرینە |
|---|---|---|
| ئەو | هی | هو |
| نووسەر | کاتبە | کاتب |

هەندێ زمـانیش لە ڕووی جنسەوە وشـەکـانی دابەش ئەبنە سـەر نێـر و مێ و بێ لایەن وەک زمانی ڕووسی.

| بێ لایەن | مێینە | نێرینە |
|---|---|---|
| Akno<br>پەنجەرە | Knîga<br>کتێب | Titrâd<br>دەفتەر |
| Mesto<br>شوێن | Karta<br>خەریتە | Stol<br>مێز |

٤- دۆخ: لە هەندێ زماناندا (دەور) لە ڕستەدا شێوەیەکی تایبەتی بەوشە دەبەخشێ پێی دەوترێ دۆخ. بۆ نموونە لە زمانی عەرەبی ئەگەر ناو دەوری فاعلیی Subjective بینی لە حاڵەتی مەرفووعیدا Agentive دەبێ. کە نیشانەکەی ئەوەیە پێی دەوترێ (ضمە).
گەر ناوەکە لە دەوری مەفعوولیدا بوو ئەوەلە دۆخی مەفعوولیدا Objective دەبێ و نیشانەکەی ئەوەیە کە پێی دەوترێ (فتحە)... هتد.

زمانانی جیهان جیاوازن لە ڕووی پێشاندانی ئەم حاڵەتانە. زمانی فنلەندی Finish (١٥) حاڵەتی هەیە. ڕووسی (٦)ی هەیە لە ئینگلیزدا (٣) هەیە ئەویش تەنیا لە ڕاناودا.

### جۆرەکانی ڕێککەوتن:

لە هەندێ زماناندا، لەناو چوارچێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستە (ناو) کە بە(ناووک)ی بەشەکە دەژمێردرێت head لە چ کەس، ژمارە، جنس یا دۆخێکدابێ، ئەو ناوی ئیشارە و ئاوەڵناو (یا ئاوەڵناوانە)ی لەگەڵیشیدا دەردەکەون سەر بۆ هەمان کەس، ژمارە، جنس یا دۆخ دادەنوێنن. بۆ نموونە لە زمانی عەرەبیدا، لە ڕستەی:

جاء الولدُ (کوڕەکە هات)

وشەی (الولدُ) ناوە دەوری فاعلی بینیوە لە حاڵەتی (مەرفوعی) دایە، نیشانەکەی ئەو (ضمە)یەیە کە لە دواییدا دەرکەوتووە. لە ڕووی ژمارەوە (تاک)ە و لە ڕووی جنسەوە (نێرینە)یە.گەر ناوی ئیشارە یان ئاوەڵناوێ (یان زیاتر) یان هەموو ئەمانەی بەیەکەوە لەگەڵدا دەرکەوت، ئەمانیش سەر بۆ هەمان ژمارە و جنس و حاڵەت دادەنوێنن.

جاء هذا الولدُ الذکي.

لە ڕستەی:

رایت البنتین.

وشەی (البنتین) ناوە دەوری (مەفعوولی) بینیوە لە ڕووی ژمارەوە (جووت)ە لە ڕووی جنسەوە(مێ ینە)یە.گەرناوی ئیشارە یان سیفەیێ (یان زیاتر)ی لەگەڵدا دەرکەوت.
ئەمانیش سەر بۆ هەمان ژمارە و جنس و حاڵەت دادەنوێنن.

رأیتُ هاتین البنتین الذکیتین الجمیلتین.

لە هەندێ زماناندا ڕێککەوتن لەناو چوارچێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستە تەنیا لەنێوان ناو و ناوی ئیشارەدا دەردەکەوێ. ئەویش تەنیا لە ژمارەدا. وەک لە زمانی ئینگلیزیدا.

This beatiful girl came.

ئەم کچە جوانە هات.

These beatiful girls came.

ئەم کچە جوانانە هاتن.

ئەم وێنەیە چەمکی ڕێککەوتن لەناو چوارچێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستە ڕوون دەکاتەوە.

(س) ئیشارەتە بۆ یەکێ یان زیاتر لەمانە (کەس، جنس، ژمارە، حاڵەت).

(+) ئیشارەتە بۆ ئەوە زمان هەیە تەنیا ناوی ئیشارە تێیدا لەگەڵ ناودارێک دەکەوێ. زمانیش هەیە ناوی ئیشارە و ناوەڵناو لەگەڵ ناودا ڕێک دەکەوێ.

ئەو جۆرە زمانانەی ڕێککەوتن تەنیا لەناو چوارچێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستەی هەیە لێرە بەجۆری (A) لە قەڵەم دەدەین. وەک زمانی ئینگلیزی.

ئەوەی تا ئێستا باس کرا ڕێککەوتن بوو لەناو چوارچێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستە. جۆرێکی تری ڕێککەوتن هەیە، ئەویش ڕێککەوتنە لەنێوان بەشە بنجییەکانی ڕستەدا. بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە (بکەر) و (بەرکار) و (فرمان) وەک سێ بەشی بنجیی ڕستە جیا دەکەینەوە.

زمان هەیە تێیدا (بکەر) و (فرمان) ڕێک دەکەوێ. وەک لە زمانی تورکیدا بکەر و فرمان لە کەس و ژمارەدا ڕێک دەکەون.

تۆ ئێمەت بینی.

ئەو زمـانانەی ڕێککەوتن تێیاندا لەنێوان بکەر و فـرماندا دەردەکەوێ بەجۆری (B) لە قەڵەم دەدەین.

زمـان هەیە (بکەر) و (بەرکـار) تێـیـدا ڕێک دەکـەون. وەک زمـانی سنهـالی -Sin halese[٢] کوردیی (خوارووش) لە ڕابردوودا ئەم دیاردەیە پێشـان دەدات.

ئەو زمانانەی ڕێککەوتن لەنێوان (بکەر) و (بەرکار)دا پێشـان دەدات بەجۆری (C) لە قەڵەم دەدەین.

زمـانی وا هەیە ڕێککەوتن تێـیـدا لەنێـوان (بەرکـار) و (فـرمـان)دا دەردەکـەوێ. وەک زمانی باسک. کرمانجی ژوورووش لە کاتی ڕابردوو بەر ئەم جۆرە زمانانە دەکەوێ.

(من ئێوەم دیت)

ئەو زمانانەی ڕێککەوتن تێیاندا لەنێوان بەرکار و فرماندا دەردەکەوێ بەجۆری (D) لە قەڵەم دەدەین. ئەم جۆرە زمانانە. لە زانستی زماندا بە Ergative ناوبراون.

جۆرەکانی ڕێککەوتن هەموو لە یەک وێنەدا ڕوون دەکرێتەوە.

(س) نیشارەتە بۆ یەکێ یا زیاتر لەمانە (کەس، ژمارە، جنس، دۆخ).

لە گەلێ زمانانداا زیاتر لە یەک جۆر ڕێککەوتنیان تێدا دەردەکەوێ. بۆ نموونە: زمانی عـەرەبی جـۆری (A) و (B) پێـشـان دەدات لە هەمـوو بارێکدا واتا بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە زمانێکی (AB)یە.

له زمانی ئینگلیزی جۆری (A)ی هەیە تەنیا لەنێوان ناو و ناوی ئیشارەدا دەردەکەوێ و جۆری (AB لەگەڵ کاری بووندا Verb to be) و کە بکەر لە کەسی سێیەمی تاکە لە کاتی داهاتوو.

Iam a student.

من قوتابیم.

We are student.

ئێمە قوتابین.

He goes at eight oclock

سەعات (٨) دەڕوات

بەم جۆرە زمانی ئینگلیزی جۆری (A) (B) پیشان دەدات. A و B خراونەتە ناو دوو کەوانەوە مانای ئەوە دەگەیەنن بەتەواوی A و B نییە.

بەم جۆرە و بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆمان دەردەکەوێ کە کرمانجی خواروو و کرمانجی ژووروو دوو سیستەمی جیاواز لە ڕووی ڕێککەوتنەوە پیشان دەدەن.

کرمانجی خواروو جۆری (C) B)یە.

کرمانجی ژووروو جۆری (D) A)یە.

**پەراوێزەکان:**

١- زمانی فیجینی سەر بەبنەماڵەی (مەلایۆ - پۆلینیەن)ە. لە یەکێ لە دوورگەکانی ئۆقیانوسی پاسفیکی قسەی پێ دەکرێت.

زمانی تیگری زمانێکی سامییە لە باکووری ئەسیوبیا قسەی پێ دەکرێ.

٢- زمانی سنهالی سەر بەگرووپی (ئیندیک)ە Indic، کە سەر بەبنەماڵەی هیند و ئەورووپییە. لە دوورگەی سریلانکە قسەی پێ دەکرێ.

سەرچاوە:

1- Lewis (G. L. (1978) Turkish. Hodder and Stoughton.

2- Lyons, J. (1968) Introduction to theoretical Lingnistics.
Gambridge University Press

3- Palmer, F(1972) Grammar. Pelican.

٤- وریا عومەر ئەمین (١٩٨١) نموونەیێک جیاوازی لەنێوان کرمانجی خواروو و ژووروودا. گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات - زانستگای بەغدا ژ (٢٤).

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (٩٢) ساڵی ١٩٨٢، لاپەرە ١٦-١٩ بلاوکراوەتەوە.

# خزمایەتی لە زماندا

هەبوونی ژمارەییێکی زۆر زمانی جیاواز جیاواز و نەبوونی تاکە زمانێ بۆ هەموو ئادەمیزادانی سەر ڕووی زەمین، هەر لە زووەوە سەرنجی مرۆڤی ڕاکێشاوە و بیری خەریک کردووە. ئەو ئەزەرییانەی هەزاران ساڵ پێش ئیسرۆ دەربارەی ئەم دیاردەیە هەبووە، بەڵگەی بایەخ پێدان و خەریکبوونی بیری ئادەمیزادە بەم مەسەلەیەوە. بۆ گەڕان بەشوێن لێکدانەوەی ئەم جۆرە دیاردانە... وەک هەر نهێنییێکی سروشتی تر -لە بێ دەسەڵاتیدا پەنا ئەبرایە بەر ئەفسانە.

تەورات کە مێژووی ئەگەڕێتەوە نزیکەی هەزار ساڵ پێش زایین ئەم چیرۆکە ئەگێڕێتەوە: «سەردەمێ ئادەمیزاد هەموو بەیێک زمان ئەدوان... گەیشتبوونە لووتکەی شارستانییەت... یەک شت مابوو بیکەن... ئەویش ئەوەبوو بگەنە لای خوا... بۆ ئەم مەبەستە ویستیان تەلارێکی بەرز دروست کەن... خواش، بۆ ئەوەی ئەمەیان بۆ نەکرێ، سزای دان... زمانی شێواندن، هەر یەکە بەجۆرێ قسەی کرد. ئیتر لەیەک نەگەیشتن... ئەمە بووە هۆی ئەوەی نەتوانن ئەم پرۆژەیە بەجێ بهێنن...».

ئەمە یەکێکە لەو چیرۆکانەی هەوڵ ئەدەن ئەم دیاردەیە لێک بدەنەوە. تا سەدەی هەژدەمیش هۆی لەیەکچوونی دوو یا کۆمەڵە زمانێ ئەدرایە پاڵ کار لەیەککردن و لەیەک وەرگرتن و ڕێکەوت.

سێر ولیەم جۆنس - زمانەوانێکی بەریتانی سەدەی هەژدەمە- لە هیند دەژیا شارەزاییێکی تەواوی زمانی گریکی و لاتینی هەبوو. کە فێری زمانی سەنسەکریتی بوو، بینی ئەم سێ زمانانە زۆر لەیەک دەکەن لە ڕووی داڕشتنی ڕەگی فرمان و ناو و ڕێزمانیانەوە. لە ساڵی ١٧٨٦دا وتارێکی بڵاوکردەوە ئەم لێکدانەوەیەی تیا پێشکەش کرد. «گریمان لاتینی و گریکی لەیەک دەکەن، چونکە لە ڕووی جوغرافییەوە گەلێ لەمێژە دراوسێن و کاریان لەیەک کردووە... ئەی زمانی سەنسەکریتی، کە هەزاران میل لێیانەوە دوورە ئەم لەیەکچوونەی چۆن پەیا کرد؟ بەهیچ جۆر ناشێ ئەم دیاردەیە بخرێتە پاڵ ڕێکەوت. هەبێ و نەبێ ئەم سێ زمانانە لە یەک سەرچاوەوە هەڵقوڵاون...».

ئەم ڕایە تازەیە دەرگاییێکی فراوانی لە ئاسۆی زمانەوانیدا کردەوە. وای لە زمانەوانانی

جیهان کرد لەسەر ئەم بناغەیە لە زمان بکۆڵنەوە. کەوتنە شیکردنەوە و بەراوردکردنی زمانان بەو ئاواتەی پەیوەندی و جۆری خزمایەتیی نێوان زمانەکانی جیهان بدۆزنەوە... سەدەها زمان کە هیچ شتێ دەربارەی نـژاد و پەیوەندییان نەدەزانرا، لە ئەنجامی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە، شوێنیان لەناو زمانانی جیهان بەتەواوی دەستنیشان کرا.

ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە لە کاتێکدا باوبوو کە ئەزدرییەی پەرەسەندنی داروین (١٨٠٩-١٨٨٢) کاری لە هەموو لایەنێکی زانست دەکرد. زانستی زمانیش لەم کارتێکردنە بێ بەش نەبوو. لە ئەنجاما ئەم ڕاستییە سەری هەڵدا (چەمکی گۆڕینە هۆی هەبوونی ژمارەییێکی زۆر زمانی جیاواز جیاواز).

گۆڕین یاساییێکی ئەزەلیی ئەم سروشتەیە باری ئێستەی هەر شتێ جیایە لەهی هەر سەردەمێکی تری. بینە envronment دەورێکی باڵا ئەگێڕێت لە ئاراستەکردنی شێوەی گۆڕین... واتا گەر هەمان سیستەم خرایە دووبینەی جیاوازەوە پاش ماوەییێک شێوەی جیاواز ئەگرنە خۆ و ئەبێ بەدوو سیستەمی جیاواز. زمانیش وەک دیاردەییێکی سروشتی لەم یاسا گشتییە بەدەر نییە. ئەگۆڕێ بەتێپەڕینی کات. باری جوغرافی و ئابووری و کۆمەلایەتی و کەلچەری و پەیوەندی لەگەڵ زمانانی تر دەور دەگێڕن لە چۆنیەتی شێوەگرتنی ئەم گۆڕینە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە بابڵێین کۆمەڵە خەڵکێ بەزمانی (ز) دەدوان لە ناوچەی.

بەتێپەڕینی کات ئەم زمانە دەگۆڕێ. ئەگەر قسەکەرەکانی هەموو بەیەکەوە مانەوە و پەیوەندیی جوغرافی و کۆمەلایەتی نێوانیان ئەپچڕا، ئەوە گۆڕینەکە لە هەموو بەشەکانیا هەمان شێوە دەگرێتە خۆ، چونکە بەهەمان بینە ئابڵوقەدراوە. بەلام ئەگەر هات و ئەم کۆمەڵە خەڵکە لەیەک دابڕان و بوون بەچەند بەشێ ج لە ئەنجامی کۆچکردن یا پەیابوونی سنوورێکی سروشتی یا دەسکرد لە نێوانیاندا.

پەیوەندیی نێوانیان دەپچڕێ. لە کاتی لەیەک دابڕانیان، بێگومان، هەموو هەمان شێوەی قسەکردنیان دەبێ. دوای جیابوونەوەیان هەریەکە دەکەوێتە بینەی تایبەتیی تازەی خۆیەوە. زمانەکە دەگۆڕێ، بەڵام چونکە ئەمجارە بەشەکانی بەیەکەوە نین گۆڕینەکە لەهەر بەشێکیدا شێوەیێکی جیاواز لەوانی تردا دەگرێتەخۆ... هەریەکە بەپێی ئەو بینەیە تازەیەی کەوتۆتە ناوی. پاش ماوەیێک دەبن بەچەند شێوەیێ.

چەند زیاتری بەسەرا تێپەڕی جیاوازیی نێوانیان زۆرتر دەبێ تا دەگاتە ڕادەیێک ئیتر لەیەک ناگەن. بەم جۆرە زمانی (ز) دوای چەند پشتێ ئەبێ بەچوار زمان.

زمانی (ز) خۆی وەک زمانێکی زیندوو نامێنێ (لەوانەیە لە نووسینا بپارێزرێ. بەم جۆرە زمانانە ئەوترێ زمانی مردوو).

ئەو زمانە تازانە دیسان بەهەمان ڕێڕەو تێدەپەڕنەوە و بەهەمان جۆر دەبن بەچەند زمانێکی تر و بەم جۆرە.

(ز١)، (ز٢)، (ز٣) و (ز٤) خوشکن (ز) دایکیانە. بەری (ز١) دەبن بەپوورزای بەری (ز٢)... و بەم جۆرە. (ز) دەبێ بەبنەماڵە.

جا كه دەڵێین فلانه زمان و فلانه زمان سەر بەهەمان بنەماڵەن. ئەوە دەگەیەنێ كه ئەم دوو زمانانه -بەو جۆرەی باس كرا- لەیەک سەرچاوەوە هاتوونەته خوارەوە و پەیوەندیی خزمایەتی (دوور یا نزیک) له نێوانیاندا هەیه. بۆ نموونه زمانی كوردی و ئینگلیزی و ئوردوو و پشتۆ. هەموو سەر بەو بنەماڵەن كه بەهیند و - ئەورووپی ناوبراوە.

كوردی و پشتۆ خوشكن - هەردووک بەرەی هەمان زمانن كه به(ئاری) ناوبراوە. ئوردوو پوورزایانه- واتا دایكی ئوردوو كه (سەنسەكریتی)یه و دایكی كوردی و ئوردوو كه (ئاری)یه خوشكن. دایكی (ئاری) و (سەنسەكریتی)یش به(هیند و ئاری) ناوبراوە.

ئینگلیزی زمانێكی (جەرمەنی)ی ڕۆژئاواییه. جەرمەنی ڕۆژئاواییش له جەرمەنییەوە هاتۆته خوارەوە... (جەرمەنی) و (هیند و ئاری) خوشكن هەردووک بەرەی هەمان زمانن كه به(هیند و ئەورووپی) ناوبراوە. پەیوەندیی نێوان ئەم چوار زمانانه و هەندێ له زمانەكانی تری هیند و ئەورووپی لەم وێنەیەدا ڕوون كراوەتەوە.

هەمــوو زمـانەکـانی تری جـیـهـان بەم جـۆرە، لەسـەر بنـاغـەی پەیوەندیی خـزمـایەتی و هاوڕەگەزی، هەر کۆمەڵەی دەبێتە بنەماڵەیێک.

لەبەر جیـاوازی و پێک نەهاتن لەسـەر پێناسـینی چەمکی و زمـان و پەیوەندیی زمـان بەشێوەوە و گۆڕینی ژمارەیان بەتێپەڕبوونی کات زۆر زەحمەتە ژمارەی زمانانی جیهان بەتەواوی دەستنیشان بکرێت. ڕا جیاوازەکان لەنێوان سێ هەزار و چوار هەزار و پێنج سەدا

دەخولێنەوە. لەم وتارە جێی ئەمە نابێتەوە بەفراوانی لەم مەسەلەیە بکۆڵرێتەوە.

جگە لە بنەماڵەی هیند و ئەورووپی چەند بنەماڵەیێکی تر و زمانە بەناوبانگەکانی تیایانا پێشکەش دەکەین.

| بنەماڵە | هەندێ لە زمانەکانی |
| --- | --- |
| سامی حامی | عەرەبی، ئەمهاری، هەوسە، عبری، سۆماڵی. |
| ئەڵتایکی | یابانی، تورکی مەنغۆلی، کۆری... |
| دراڤیدی | تامیل، تێلەگو، مەلەیالەم، کەننادا... |
| ئۆرالی | فنلەندی، هەنگاری، ئیستوانی... |
| قەفقاسی | ئەڤار، جۆرجی... |
| سینۆتبیتی | بورمی، کەنتانی، مەندەرانی، تبینی... |
| ئۆسترۆ - ئەشیتیک | کەمبۆدی، ڤێتنامی... |
| ئۆسترۆ - تای | جاوی، ئەندەنوسی، مەلەگاسی، تەلەگۆک، تایلەندی... |
| نایجرکردۆڤانی | سوایلی، ئیگبۆ، زوولور، یورۆبا. |
| هیندەمکریکی | ئەرەپاهۆ، ئۆجیبوا، ئەپاچێ، سارسی، مایا، پیما، موهاڤی، هۆپێ... |

ئایا ئەم بنەماڵانەش - لە قۆناغێ یا چەند قۆناغێکی ژوورتردا دەگەنەوە یەک؟ گەیشتنەوە پێکیان ئەمە ئەگەیەنێ کە هەموو زمانانی جیهان لە یەک سەرچاوەوە هەڵقوڵاون. گەر ئەمە ساغ بکرێتەوە گرێیەکی یەگجار ئاڵۆز لە نهێنییەکانی سروشتمان بۆ ئەکرێتەوە. چونکە زانینی نژادی زمان تیشک دەخاتە سەر زانینی نژادی نادەمیزاد.


سەرچاوە:

1- Crystal, D. (1971) Linguistics.

2- Kondratov, A (1969) Sounds and signs Mir publishishers Moscow.

3- Gleason. H. A (1965) An Introduction Descriptive Linguistics.

4- Bynon, T. (1977) Historical Linguistics Cambridge.

5- Fromkin, V. (1974) An Introduction to language.



* ئەم وتارە لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (٩٤) ساڵی ١٩٨٢، لاپەرە ٢٦-٣١ بڵاوکراوەتەوە.

# ڕستەی بکەر نادیار

گرامەری تەقلیدی بەگشتی بایەخ بەوشە و داڕشتنی وشە ئەدات. هەر وشەیێک لە زمانا قالبەکانی چین و لە چ ڕەگ و پاشگر و پێشگرێ پێکهاتوود و نژادی و ئەو قۆناغانەی پیایا تێپەڕیود و ماناکانی چین... هتد. بێ ئەودی دەوری پەیوەندی نێوان بەشە بنجییەکانی ڕستە. لە دەستنیشانکردنی قالبە جیاوازەکانی وشە دەربخات.

یەکێ لە سەختترین و ئالۆزترین لایەن لە زمانا جیاکردنەوەی لیقلی مۆرفۆلۆجی (داڕشتنی وشە) و لیقلی سینتاکسە (داڕشتنی ڕستە). ئەم سەختییە -لە زمانی کوردیدا- لەم نموونەیەدا خۆی دەرئەخات:

ئایا (ئەیانبینین) ڕستەیە یا وشەیە؟

١- گەر ڕستەبێ پێناسینی وشە چییە؟

٢- گەر وشەبێ پێناسینی ڕستە چییە؟

بێ ئەودی خۆمان بخەینە گێژاوی ئەم مەسەلەیەود، لەم قۆناغەدا وای لە قەڵەم ئەدەین کە گۆڕینی قالبی وشە دوو هۆی هەیە:

١- هۆی مۆرفۆلۆجی: هەندێ (ئەفیکس) (پێشگر و پاشگر و ناوگر) ئەخرێنە سەر ڕەگ و وشەی زمانەکەود بۆ دروستکردنی وشەی تازەی تری خاوەن مانای تازە، بێ ئەودی ئەم ئەفیکسانە هیچ پەیوەندییێکی وشەکە بەبەشێکی تری ڕستەود دەربڕن وەک(هەڵ-)، (ڕا-)، (-ەود)، (-ن) هتد.

گرتن - هەڵگرتن - ڕاگرتن

خواردن - خواردنەود

نوست - نوستن... هتد.

٢- هۆی سینتاکسی: هەندێ ئەفیکس ئەخرێنە سەر ڕەگ و وشەود بۆ دەربڕینی پەیوەندی نێوان ئەم ڕەگ و وشانە بەبەشەکانی تری ڕستەود. (ودک ڕاناود لکاودکانی پەیوەندیی نێوان بکەر و فرمان دەرئەبڕن).

بۆ جیاکردنەودی ئەم دوو لایەنە سەیری ئەم نموونەیە بکە.

(ن)ی (نوستن) لە ڕستەی

ئەوان نوستن.

جیایە لە (ن)ی (نوستن) لە ڕستەی

نوستن خۆشە

(ن)ی یەکەم پەیوەندی نێوان بکەر و فرمانی دەربڕی (واتا پاشگرێکی سینتاکسییە)
(ن)ی دووەم خرایە سەر ڕەگی فرمان بۆ دروستکردنی ناو. (واتا پاشگرێکی مۆرفۆلۆجییە).

بەم جۆرە ئەبێ قاڵبە جیاوازەکانی وشە لەناو چوارچێوەی ڕستەدا دەسنیشان بکرێت چونکە هەندێ داڕشتن و گۆڕین بەستراوە بەگۆڕینی پەیوەندی وشەکە بەبەشەکانی تری ڕستەوە. یەکێ لەم لایەنانە، لە داڕشتنی ئەو جۆرە فرمانانەدا دەرئەکەوێ کە بە(فرمانی بکەر نادیار - المبني للمجهول) ناو ئەبرێت. یاسای گۆڕینی ڕستەی بکەر دیار بۆ بکەر نادیار:

واتا:

١- بکەر و ڕاناوی لکاو لائەبرێن.
٢- بەرکار دێتە خوار و جێی بکەر ئەگرێ بەڵام چەمکی (بەرکاری)ی خۆی نادۆڕێنێ.
٣- ڕەگی داهاتووی فرمانەکە وەرئەگرێت و گەر کاتەکە لە ڕابردوودا بوو (را)ی وەک پاشگرێ ئەخرێتە سەر، گەر کاتەکە داهاتوو بوو (رێ).
٤- نیشانەی جۆری کات (مەبەست لەمە (ئە)ی هەمیشەیی و (بوو)ی ڕابردووی تەواو... هتد) شوێنی خۆی ئەگرێ.
٥- بەپێی کەس و ژمارەی بەرکارەکە ڕاناوێکی لکاوی ئەخرێتە سەر - فرمانەکە وەک تێنەپەڕ خۆی ئەنوێنێ.

کرمانجی سەروو سیستەمێکی جیاواز لەم ڕووەوە پێشان ئەدات.

واتا:

١- بکەر و ڕاناوی لکاو لائەبرێن.

٢- بەرکار دێتە خوار.

٣- چاووگی کارەکە وەرئەگیرێت.

٤- (هاتن ، ...د.کرێ ...ـدییە پێش فرمانە بەچاووگ کراوەکە.
٥- ...ی فرمانەکە لەبەر فرمانی (هاتن) ئەکرێ.
٦- بەپێی کەس و ژمارەی بەرکارەکە ڕاناوێکی لکاو بەفرمانی (هاتن)ەوە ئەلکێنرێت. وەک:

تێبینی: گەر فرمانەکە لە کاتی داهاتوودابێ و بەرکار بەڕاناو دەربڕابێ ئەوە ڕاناوەکە لە کۆمەڵی (من - تە... هتد) نەبێ. کە ڕستەکە گۆڕایە ڕستەیێکی بکەر نادیار ڕاناوەکە ئەبێ بگۆڕێت بەکۆمەڵی (ئەز - تو... هتد).

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (٩٥) ساڵی ١٩٨٢، لاپەڕە ٣٤-٣٥ بڵاوکراوەتەوە.

# زمان و ماتماتیک

قسەکردن یەکێکە لە سەیرترین و ئاڵۆزترین دیاردەکانی ئەم سروشتە. ئەختێ بیری لێ بکرێتەوە ئەم سەیری و ئاڵۆزییەی دەرئەکەوێ.

«من کە لەگەڵ تۆ قسە ئەکەم) کۆمەڵە زانیارییەک لە مێشکما هەیە (چۆن پارێزراوە...؟) ئەم زانیارییەت بۆ ئەگوازمەوە بەهۆی کۆمەڵە دەنگێ کە بەئەندامانی ئاخاوتنەوە دروستیان ئەکەم. تۆ ئەم دەنگانە بەهۆی گوێوە ئەبیستی و مێشکت شییان ئەکاتەوە (تێیان ئەگەیت) و تیایا ئەپارێزرێت.

تۆ دیسان ئەتوانی دەری برێتەوە بەهەمان پەیڕەو. واتا زمان سێ جۆر توانینی بەیەک بەستراو ئەنوێنێ.

١- توانینی دەربڕین: ئەمەیان میکانیکییەتی ئەندامانی ئاخاوتن ئەگرێتەوە کە بەهۆیانەوە ڕیزە دەنگێ دروست ئەکرێ و ماناکانیان تێهەڵکێش ئەکرێت و بەهۆیانەوە بۆ گوێگر ئەگوێزرێتەوە.

٢- توانینی وەرگرتن: ئەمەیان فسیۆلۆجیەتی گوێ و بیستن ئەگرێتەوە.

٣- توانینی شیکردنەوە و تێگەیشتن و پاراستن: ئەمەیان فسیۆلۆجییەت و میکانیزمیەتی مێشک ئەگرێتەوە.

ئەم مێشکە (کە بریتییە لەو پارچە گۆشتە) چ میکانیزمیەتێکی ئاڵۆز و سەیری هەیە کە پیاو بەهۆیەوە ئەتوانێ بەم خێراییە ئەم دەنگانە شی کاتەوە و بیانکات بەزانیاری و بیانپارێزێ و دەریانبڕێتەوە... هەر یەکە لە ئێمە چەند شت ئەزانێ... چەند کەس و شوێن ئەناسێ چەند زمان ئەزانێ...

چەند شتی خوێندۆتەوە و بیستووە... هتد هەموو ئەمانە بەوێنەوە لەم مێشکە (بچووکە)دا پارێزراون... کەی باسی شتێ کرا، هەموو ئەوانەی پەیوەندییان بەم شتەوە هەیە یەکسەر دێنە یاد و بەرچاو و قسەکەر ئەتوانێ هەمووی بەڕێکوپێکی وەک زنجیرەیێکی بەیەک بەستراو بەتەسەلسولێکی زەمەنی و مەنتیقی بگێڕێتەوە هە چ دیاردەیێک ئا بەم ڕادیە ئاڵۆز و سەیربێ، بێگومان ئەبێتە مایەی سەرنجراکێشانی گەلێ خەڵک و زانایان. گەلێ بیروڕا و لێکدانەوەی جیاواز دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوون و

کارکردنی نەبێ...

یەکێ لە سیما هەرە سەرسوڕمێنەکانی زمان ئەوەیە پیاو ئەتوانێ هەمیشە مانا و بیری تازەی پێشتر نەبیستراو و نەزانراو دەربڕێ و تێ بگات. ئەو شتانەی ئێستە بۆ ئێوەی باس ئەکەم (لەوانەیە) پێشتر نەتانبیستبێ، واتا مانا و چەمکەکەی بۆ ئێوە تازەیە بەڵام هەر بەو کۆمەڵە وشانە دەربڕاون کە هەموومان تیایا هاوبەشین و هەموو دەم لە قسەکردنی ڕۆژانەماندا بەکاریان ئەهێنین.

شاعیرێک دێ جوانترین ئەندێشە و مانا کە کەس هەر بەخەیاڵییا نەیێ... ئەیخاتە ناو قالبی چەند وشەیێک کە ئێمە دەیەها جار لە قسەکردنی ڕۆژانەماندا بەکاریان ئەهێنین.

سەد یا هەزار کەس بێنە هەموو زمانی کوردی و عەرەبی باش بزانن... دەقێکی کوردی و دەقێکی عەرەبییان بەرێ، کوردییەکە بکەن بەعەرەبی و عەرەبییەکە بکەن بەکوردی هەر هەزاریان بەراورد بکەیت دووانیان نادۆزیتەوە لە دوو ڕستەدا بەتەواوی وەک یەک بن.

توانینی نادەمیزاد لە دەربڕینی ژمارەییێکی بێ دوایی مانا و بیر و توانینی لە دەربڕینی هەمان مانا و بیر بەژمارەییێکی بێ دوایی قاڵب و داڕشتن هەر بەو کۆمەڵە وشانەی لە فەرهەنگی زمانی مێشکییا هەیە (کە ژمارەیان سنووردارە) لەسەر بناغەییێکی ماتماتیکی لێک ئەدرێتەوە.

ماتماتیک سیستەمێکی بریتی لە ژمارەییێکی کەم و سنووردار (نیشانە) و (یاسا)یە کە بەهۆیانەوە ژمارەییێکی بێ دوایی (نرخ) دەرئەبڕێ.

بۆ نموونە سەیری ئەم دوو لایەنە بکە.

١- نیشانە (١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩، سفر)

٢- یاسا - خانەی تاکانە و دەیانە و سەدانە و هەزارانە...

هتد.

| ∞ ......... | هەزارانە | سەدانە | دەیانە | تاکانە |
|---|---|---|---|---|

تەنیا بەم دوو لایەنە زۆر سنووردارە ژمارەییێکی بێ پایان (نرخ) دروست ئەکرێت.

هەر خانەییێکی بچووکتر کە ژمارەی بوو بە(دە) ئەم (دە)یە ئەکرێ بەیەک ئەکەوێتە

خانەی ژوورتر و بەم جۆرە... ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە دوا ژمارە نییە... ژمارەکە هەر چەند گەورەبێ ئەشێ یەکێکی تری بخرێتە سەر.

نرخی هەر (نیشانەیەک)یش لەناو چوارچێوەی ئەم یاسایەدا بەهۆی شوێنەکەی و جۆری پەیوەندیی لەگەڵ نیشانەکانی ترا دەسنیشان ئەکرێ. هەبوونی ژمارەییێکی بێ دوایی ئیحتمال بۆ ئەم جۆرە پەیوەندییە لە نێوان ئەم نیشانانە هۆیە بۆ توانینی دەربڕینی ژمارەییێکی بێ پایان (نرخ).

بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی ژمارەییێکی بێ دوایی ئیحتمال سەیرێکی ئەم نموونەیە بکە:

٣س ص + ٢ع ل = ن١

ئەم هاوکێشەیە (معادلە) نرخێکی تایبەتیی هەیە کە (ن١)ە ئەم نرخە دەسنیشان کراوە بەهۆی جۆری پەیوەندیی هەر نیشانەییێک لەگەڵ نیشانەکانی تر و شوێنی بەگوێردیان لەناو چوارچێوەی ئەم هاوکێشەدا. گەر شوێنیان بگۆڕێ و ئاڵوگۆڕ بکرێن نرخەکەش ئەگۆڕێ وەک:

٣س + ٢ع ل ص = ن٢ نرخەکە گۆڕا

٣ص + ٢ ع ل س = ن٣ نرخەکە گۆڕا

بەم جۆرە ئەبینین ژمارەییێکی یەکجار زۆر ئیحتمال هەیە بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ئەم چوار نیشانەیە (س ص ع ل). گەر شوێنی ژمارەکان بگۆڕێ ئیحتمالەکە دوو ئەوەندەی لێ دێ.

نیشانەییێکی تری وەک (م) زیاد بکرێ ئیحتمالەکە دەیەها جار زیاتر ئەبێ.

ئێستا با بەراوردێک بکەین لە نێوان ئەم شتانەی باس کران و زمان، نموونەکانیشمان لە زمانی کوردییەوە ئەبێ.

بکەر و بەرکار و فرمان سێ بەشی بنجیی ڕستەی هەر زمانێکن. پەیوەندیی نێوانیان لە زمانی کوردیدا لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

ئەو یاسایانەی بکەریان پێ دائەرێژرێت هەمانن کە بەرکاریشیان پێ دائەرێژرێ.
شوێنیان لە ڕستەدا دەورەکەیان دەسنیشان ئەکات. ژمارەی یاساکان گەلێکن لێرە تەنیا دووانیان ئەخەینە بەرچاو بۆ مەبەستی باسەکەمان. یەکەم بکەر (یا بەرکار) لەوانەیە لە ناوێ یا زیاتر پێک بێت.

بکەر ⟵ (ناو...... ∞) یاسای ژ (١)

(∞) نیشانەی (بێ دوایی)یە

لێرە کە ئەڵێین (زیاتر) مەبەست ژمارەیێکی بێ دواییە. هیچ یاسایێک نییە لە ڕێزمانی هیچ زمانێکا بڵێ ئەبێ ژمارەی ئەو ناوانەی لە بکەر یا بەرکاری ڕستەدا دەرئەکەوێ لەودندە زیاتر نەبێ بێگومان ژیانی ڕۆژانەمان پێویستی بەڕستەی وا نییە ژمارەی ناوەکانی بکەر یا بەرکار یەکجار زۆربێ ئەمە لە ڕووی عەمەلییەوە بەڵام لە ڕووی نەزەرییەوە ڕێگا هەیە بۆ ژمارەیێکی بێ دوایی ناو لە بکەر و بەرکاری ڕستەدا دەرکەون (ئەمە لەگەڵ چەمکی دوا ژمارە لە ماتماتیکا بەراورد بکە)

من (ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ...) ئەبینم.

ئازاد من ئەبینێ.

(ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ و...) من ئەبینن.

من (ئازاد) ئەبینم.

هەر ناوەش ئەشێ ناوەڵناوێ یا زیاتری لەگەڵا دەرکەوێ - یاسا ژمارە (١) بەم جۆرە فراوان ئەکرێت.

بکەر ⟵ [ ناو (ناوەڵناو...... ∞)......∞ ] یاسا ژ (٢)

ئێستا با لەناو چوارچێوەی ئەم یاسایەدا ئەم ڕستەیە دابڕێژین و لەگەڵ ئەو هاوکێشەی پێشتر باسمان کرد بەراوردی بکەین گەر:

کوڕ = ٣، کچ = ٢، کورت = س، قژن = ص لاواز = ع، چاوشین = ل

وەک هاوکێشە ماتماتیکییەکە ژمارەییێکی یەکجار زۆر ئیحتمال هەیە بۆ ڕیزبوونی ناو و ناوەڵناوەکانی ئەم ڕستەیە. وەک دەریشکەوت هەر ئیحتمالەی مانایەکی بەخشی. بەزیادکردنی ناوێ یا ناوەڵناوێ یا زیاتر ئیحتمالەکە زۆرتر ئەبێ و بەم جۆرە. ئەمە تەنیا لەناو چوارچێوەی ئەم یاسایەدا. گەر هەموو یاساکانی سینتاکسی تاقی بکرێتەوە بێگومان ژمارەی ئیحتمالەکان ئەبێ بە(بێ دوایی) واتا لە هەر زمانێکا ژمارەییێکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ ڕیزبوونی وشەکانی لەناو چوارچێوەی یاسا سینتاکسییەکانی. هەر ڕیزبوونێکیش (نرخێ) واتا (مانایێ یا چەمکێ) ئەبەخشێ، بەم جۆرە هەموو ئەو مانایانەی ئیحتمال هەیە بێنە خەیاڵی ئادەمیزاد ئەکەونە ناو چوارچێوەی ئەم ژمارە بێ دواییە.

ئەوەی تا ئێستا ڕوون کرایەوە چەمکی ماتماتیک بوو لە لێقڵی سینتاکسیدا. پەیوەندیی نێوان زمان و ماتماتیکدا لە لێقڵی فۆنۆلۆجیشدا دەسنیشان ئەکرێ.

وەک ئاشکرایە هەر زمانەی ژمارەییێکی دەسنیشانکراو فۆنیمی هەیە. بۆ نموونە زمانی کوردیی (خواروو) سی و شەش (٣٦) فۆنیمی هەیە. هەموو ئەو وشانەی لە زمانی

کوردییا هەن بەم سی و شەش (٣٦) فۆنیمە دارێژراون. بێگومان رێگە کراوەتەوە تا ژمارەییەکی بێ دوایی بۆ دارشتنی وشەی نوێ. لە هەر زمانەی کۆمەڵە یاسایێکی تایبەتی بەزمانەکەوە هەیە کە بەهۆیانەوە فۆنیمەکانی لەیەک ئەدرێن بۆ دروستکردنی برگە. لەناو چوارچێوەی قالبی ئەم برگانە ژمارەییێکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ ریزبوون و لە یەکدانی ئەم فۆنیمانە. هەبوونی ئەم ژمارە بێ دواییە ئیحتمال. دیاردەییێکی ماتماتیکییە.

سەرچاوەکان:

1- Bullock. A. and Stallybras (1977) ed.
The fontana dictionary of modern thought.

2- Bott. M. F. (1970) Computational Linguistics. in New Horizons in Linguistics ed. John Lyons.

٣- رۆزنتال. م، و. یودین. ی (١٩٨٠) الموسوعة الفلسفية.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (٩٧) ساڵی ١٩٨٣، لاپەرە ٣٤-٣٧ بلاوکراوەتەوە.

# تێنەپەڕ فرمانێکی بکەر نادیارە

بەپێی ئەو پێناسینانەی باون... فرمانی تێپەڕ ئەوەیە کە ئەتوانێ بەرکار وەرگرێ وەک لە ڕستەی (من ئەخۆم) فرمانی (ئەخۆم) تێپەڕە، چونکە ئەتوانێ بەرکارێکی وەک (سێو) وەرگرێ و ڕستەکە ببێ بە(من سێو ئەخۆم).

فرمانی تێنەپەڕیش ئەوەیە کە بەرکار وەرناگرێ، وەک لە ڕستەی (ئێمە نوستین)دا. ئەوەی ئەم پێناسینانە هەڵئەوەشێنێتەوە و کەلەبەریان تیا پەیدا ئەکات پێناسینی (بکەر) و (بەرکار)ە و سروشتی پەیوەندیی سیمانتیکییانە بەفرمانا لەناو چوارچێوەی ڕستەدا.

بکەر ئەو کەسەیە یا ئەو شتەیە کە کارەکە ئەکات و بەرکار ئەو کەسەیە یا ئەو شتەیە کە پێشوازیی کارەکە ئەکات... واتا کارەکەی دەکەوێتە سەر. بەپێی ئەم پێناسینانە لەڕستەی:

ئاهەنگ گوڵ ئەچنێ.

(ئاهەنگ) بکەرە، چونکە ئیشەکە ئەکات... (گوڵ)یش بەرکارە، چونکە ئەو ئیشەی کە ئاهەنگ ئەیکات کار لە گوڵەکە ئەکات کە (چنین)یەتی. لە ڕووی کاتەوەش بکەر دەست پێشخەری ئەکات.

ئێستە بەپێی ئەم پێناسین و مەنتیقە ڕستەی:

ئاهەنگ دەنگی ڕزگار ئەبیستێ.

شی بکەرەوە و بزانە بکەر و بەرکار کامانەن؟

گەر بکەر ئەوە بێ کە کارەکە ئەکات و بەرکار ئەوەبێ کە کارەکەی ئەکەوێتە سەر و دەست پێشخەریش لەلایەن بکەرەوە بێ... لەم ڕستەدا ئەبێ (ڕزگار بکەربێ و (ئاهەنگ) بەرکاربێ. چونکە یەکەم (ڕزگار)ە ئیشێ ئەکات کە (قسەکردن)ە ئینجا کار لە (ئاهەنگ) ئەکات کە (بیستن)ەکەیە. گەر ڕزگار قسە ئەکات ئاهەنگ نایبیستێ.

هەمان شت لەگەڵ فرمانی (بینین) لە ڕستەی (من تۆ ئەبینم)... ئەبێ (من) بەرکار و (تۆ) بکەربێ... چونکە (تۆ)ی کارت لە (من) کردووە... (تۆ) نەبی (من) نابینم.

لەژێر تیشکی لێکدانەوەی مانای ئەم دوو ڕستەیەی خوارەوە (بکەر) و (بەرکار) چۆن پێ ئەناسرێ؟

١- ئازاد کتێبێکی لە شێرکۆ وەرگرت.

٢- شێرکۆ کتێبێکی دا بەئازاد.

لە هەردووکیاندا پەیوەندیی سیمانتیکی نێوان (شێرکۆ) و (ئازاد) بەتەواوی وەک یەک وایە... کەچی لە ڕووی پەیوەندیی ڕێزمانییەوە لە ڕستەی یەکەمدا (ئازاد) بکەرە و (شێرکۆ) بەرکاری ناڕاستەوخۆیە... لە ڕستەی دووەمدا (شێرکۆ) بکەرە و (ئازاد) بەرکاری ناڕاستەوخۆیە...

گەلێ نموونەی تری لەم بابەتە ئەدۆزرێتەوە لە زمانا تیایانا چەمکی بکەر و بەرکار و پەیوەندیی سیمانتیکییان بەفرمانەوە بەپێچەوانەی ئەو پێناسینانە بێ بۆیان دانراوە.

گوایا فرمانی تێنەپەڕ ئەوەیە کە بکەر وەرئەگرێ و بەرکار وەرناگرێ... بۆ ئەمەش نموونەی لەم بابەتە ئەهێنرێتەوە:

دارەکە شکا.

دارەکە: بکەرە

شکا: فرمانە

گەر بەوردی لە ڕووی ماناوە لەم ڕستەیە بکۆڵینەوە و شیی بکەینەوە ئەبینین ئەوەی کە تیایا بەبکەر لە قەڵەم ئەدرێ لە ڕاستیدا چەمکی بەرکاری بەرئەکەوێ، چونکە دار یا هە چ شتێکی تر هەرگیز لە خۆیەوە ناشکێ. ئەبێ هێزێ کاری تێکردبێ و شکاندبێتی... ئەو هێزە ئەبێ بکەرەکە بێ.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە ئەم ڕستانەی خوارەوە لە ڕووی مانا و پەیوەندی نێوان وشەکانیانەوە بەراورد بکە.

١- دارەکە شکا.

٢- با دارەکەی شکاند.

٣- ئازاد بەتەور دارەکەی شکاند.

ئاشکرایە کە پەیوەندی مەنتیقی نێوان (دارەکە) و (شکان)دا لە هەرسێ حاڵەتدا یەکە... (دارە و شکاوە)... لە کاتێکا بەپێی شیکردنەوەی ڕێزمانی - کەباوە- دارەکە لە ڕستەی یەکەما بکەرە و لە ڕستەی دووەما بەرکاری ڕاستەوخۆیە و لە ڕستەی سێیەما بەرکاری ناڕاستەوخۆیە (چونکە ئازاد یەکەم دەستی لە تەورەکە داوە واتا تەور ئەبێ بەرکاری ڕاستەوخۆ بێ).

بەپێی ئەم لێکدانەوەیە دەرنەکەوێ، کە بکەری هەموو فرمانێکی تێنەپەڕ لە بناغەدا بەرکارە... چونکە هیچ گیانلەبەرێ یا شتێ نییە بکەوێ یا بجوولێتەوە یا بخەوێ بێ هۆ (دەری بێ یا ناوی)... ئەم هۆیە بکەرە ڕاستەقینەکەیە.

هەندێ دیاردە هەیە ڕوودانیان لە ژوور دەسەڵاتی مرۆڤ دایە... وەک (مردن، خزین، کەوتن، پژمین... هتد)... بکەری ئەم ڕووداوانە (فرمانانە) لەژێر کارتێکردنی هێزێکی نادیار هەڵسوکەوتێ ئەنوێنن... ئەم هێزە نادیارە بکەرە سیمانتیکیەکەیە و ئەوەی لە ڕێزمانا بەبکەری تێنەپەڕ ناو ئەبرێ لە ڕاستیدا چەمکی بەرکاری بەرنەکەوێ. کەی هێزەکە زانرا چییە... بەپاسایەکی ڕێزمانی تێپەڕی فرمانەکە دائەڕێژرێ و بکەرە ڕاستەوخۆکە پیشان ئەدرێ[1] وەک:

منداڵەکە نوست. (لە خۆیەوە - سروشت نواندی)

ئاواز منداڵەکەی نواند. (گەر ئاواز نەبا منداڵەکە لەو ساتە تایبەتییەدا نەئەنوست... واتا ئاواز بوو بەهۆی نوستنی).

گەر ئەم دیاردەیە بەراورد بکرێت لەگەڵ فرمانی (بکەر نادیار)دا... دەرنەکەوێ کە فرمانی بکەر نادیار تێپەڕە ئەکرێ بەتێنەپەڕ لەبەر نەزانینی یا شاردنەوەی بکەرە ڕاستەقینەکە یا ئەوەی بەسەر بەرکارا دێت لە ژوور دەسەڵاتیا نەبێ. ئەمە بەڵگەی سیمانتیکی...

بەڵگەی (ڕێزمانی)یش ئەوەیە کە فرمانی تێپەڕ ئەکرێ بەبکەر نادیار... خۆی وەک فرمانێکی تێنەپەڕ پیشان ئەدات لە ڕووی پەیوەندی بەراناوی لکاوەوە. لە ڕابردوودا کۆمەڵێ.

(م، یت، Ø، ین، ن، ن) وەرئەگرێ...

| | | |
|---|---|---|
| من: | | م |
| تۆ: | | یت |
| ئەو: | نوست | - |
| ئێمە | کوژرا: | ین |
| ئێوە: | | ن |
| ئەوان: | | ن |

بەمە دەرکەوت کە فرمانی تێنەپەڕ لە ڕووی پەیوەندی سیمانتیکییەوە بەبکەرە

ڕێزمانییەکەیەوە فرمانێکی بکەر نادیارە.

بەبەراوردکردنی یاسای کردنی ڕستەی فرمان تێنەپەڕ بەهی تێپەڕ لەگەڵ یاسای کردنی ڕستەی بکەر دیار بەهی بکەر نادیار، دەرئەکەوێ کە ئەم دوو دیاردەیە پێچەوانەی یەکترن...

أ- یاسای گۆڕینی ڕستەی فرمان تێنەپەڕ بە هی تێپەڕ.

واتا:

١- ڕاناوی لکاو لائەبرێ.

٢- بکەر شوێنی بەرکار ئەگرێ.

٣- بکەر زیاد ئەکرێ.

٤- ڕەگی داهاتووی فرمانەکە وەرئەگیرێ.

٥- گەر کاتی فرمانەکە ڕابردوو بێ (اند) و داهاتوو بێ (ین)ی دەخرێتە سەر.[٢]

٦- نیشانەی جۆری کات (ئە - بوو - ووە... هتد) شوێنی خۆی ئەگرێ.

٧- بەپێی کەس و ژمارەی بکەرە زیادکراوەکە ڕاناوێکی لکاو ئەخرێتە سەر فرمانەکە و بەپێی یاساکانی ڕاناوی لکاو شوێنی خۆی ئەگرێ.

نموونە: گەر بمانەوێ ڕستەی:

منداڵەکان نوستبوون

بکەین بەڕستەیەکی فرمانی تێپەڕ... بەپێی یاساکان ئەبێ:

١- ڕاناوی لکاو لاببرێ.

منالەکان نوستبوو

٢ و ٣ - بکەر شوێنی بەرکار بگرێ و بکەرێکی تازەی بخرێتە سەر

ئەو منالەکان نوستبوو.

٤- ڕەگی داهاتووی فرمانەکە وەربگیرێ

ئەو مندالەکان نوو

٥- فرمانەکە ڕابردووە (اند)ی بخرێتە سەر

ئەو منالەکان نوواند

٦- نیشانەی جۆری کات شوێنی خۆی بگرێ، لێرە (بوو)ە نیشانەی ڕابردووی تەواو.

ئەو منالەکان نوواندبوو

٧- بەپێی کەس و ژمارەی بکەرە زیادکراوەکە ڕاناوێکی لکاوی ئەخرێتە سەر و بەپێی یاساکانی ڕاناوی لکاو شوێنی خۆی لە ڕستەدا ئەگرێ:

بۆ کەسی سێیەمی تاک لەگەڵ فرمانی ڕابردوو (ی) دەرئەکەوێ... گەر بەرکار هەبێ پێیەوە ئەلکێ... ڕستەکە لە ئەنجاما ئەبێ بە

ئەو منالەکان - ی نوواندبوو

ب- یاسای گۆڕینی ڕستەی بکەر دیار بەهی بکەر نادیار.

واتا:

١- بکەر و ڕاناوی لکاو لائەبرێن.

٢- بەرکار شوێنی بکەر ئەگرێ... (بەڵام چەمکی بەرکاری خۆی لە ڕووی واتاوە نادۆڕێنێ).

٣- ڕەگی داهاتووی فرمانەکە وەرئەگیرێ.

٤- گەر کاتی فرمانەکە ڕابردووبێ (را) و داهاتووبێ (ڕێ)ی ئەخرێتە سەر.[٣]

٥- نیشانەی جۆری کات (ئە - بوو -...هتد) شوێنی خۆی ئەگرێ...

٦- بەپێی کەس و ژمارەی بکەرە تازەکە ڕاناوێکی لکاو ئەخرێتە سەر فرمانەکە وەک فرمانێکی تێنەپەڕ.

بەبەراوردکردنی یاسای گۆڕینی ڕستەی فرمان تێنەپەڕ بەهی تێپەڕ لەگەڵ یاسای گۆڕینی ڕستەی بکەر دیار بەهی بکەر نادیار دەرئەکەوێ کە ئەو دوو دیاردەیە پێچەوانەی یەکترین...

| کردنی بکەر دیار بەبکەر نادیار | کردنی تێنەپەڕ بەتێپەڕ |
| --- | --- |
| ١- بکەری سیمانتیکی هەیە لانەبرێ و بەیاسایەکی مۆرفۆلۆجی فرمانەکە ئەکرێ بەتێنەپەڕ. | ١- بکەری سیمانتیکی نییە. ئەخرێتە ڕستەکەوە و بەیاسایەکی مۆرفۆلۆجی فرمانەکە ئەکرێ بەتێپەڕ. |
| ٢- لە ڕووی ڕێککەوتنەوە فرمانەکە ئەو کۆمەڵە ڕاناوە وەرئەگرێ کە تایبەتە بەتێنەپەڕ. | ٢- لە ڕووی ڕێککەوتنەوە فرمانەکە ئەو کۆمەڵە ڕاناوە وەرئەگرێ کە تایبەتە بەتێپەڕ. |

**پەراوێزەکان:**

١- فرمانە تێنەپەڕەکانی کوردی لە ڕووی بوونیان بەتێپەڕ ئەکرێن بەچوار بەش.

ا- ئەوانەی ناکرێن بەتێپەڕ چونکە تێپەڕی بەرامبەریان هەیە وەک:

کەوتن - خستن

هاتن - هێنان

بوون - کردن

ب- ئەوانەی ئەشێ بکرێن بەتێپەڕ سەرەڕای هەبوونی تێپەڕی بەرامبەریان. لەم حاڵەتەدا مانای تێپەڕی بەرامبەر و بەتێپەڕکراوەکە وەک یەک نابن. وەک (مردن) تێپەڕی بەرامبەری (کوشتن)ە و ئەکرێ بە(مراندن). بەڵام لە ڕووی ماناوە (مراندن) و (کوشتن) جیان.

پیاوەکە خۆی کوشت - لێرە مردووە.

پیاوەکە خۆی مراند - لێرە نەمردووە.

هەمان شت لەگەڵ (چوون) و (چوواندن)دا

ئەو سکی چوو.

ئەو سکی چوواند.

ج- ئەوانەی کە ناکرێن بەتێپەڕ وەک (گەنین - پشکووتن -زان)... هتد) لێکدانەوەی مەنتقی بۆ ئەمە ئەوەیە ڕوودانیان لە ژوور ئارەزوو و دەسەڵاتی مرۆڤدایە. هیچ هێزێکی دیار دەستنیشان ناکرێت بکرێ بەبکەری ئەم جۆرە فرمانانە... دارێ ئەشکێ منیش ئەتوانم بیشکێنم... ماڵێ لە خۆیەوە ئەنوێ منیش ئەتوانم بینوێنم..

بەڵام هەرگیز ناتوانم و دەسەڵاتی ئەوەم نییە گوڵێ بپشکوێنم... کەسێ بزێنم.. هتد. بۆیە (پشکواندن و زاندن و گەناندن...) نییە.

د- ئەوانەی ئەکرێن بەتێپەڕ هەموو ئەوانەن کە بەر سێ بەشەکەی تر ناکەون.

٢- گەر ڕەگی داهاتووی فرمانە تێنەپەڕەکە بە(ێ) یا (وٚ) کۆتایی هاتبێ. بەخستنەسەری (اند) و

(ین)، (ێ) نەتوێتـــەوە و (ۆ) نەبێ بە(و)ی کپ. وەک (شکان و ڕۆیشتن)دا ڕەگی داهاتوویان (شکێ) و (ڕۆ)یە کە (اند) و (ین)یان ئەچێتە سەر نەبێ بە(شکاند - شکێن) و (ڕواند - ڕوێن).

٣- لە کردنی فرمانی بکەر دیار بەهی بکەر نادیار... گەر ڕەگی داهاتووی فرمانی تێپەڕ بە(د) یا (ۆ) کۆتایی هاتبێ... بەخستنەسەری (ڕا) و (ڕێ)... (د) نەتوێتەوە و (ۆ) نەبێ بە(و). وە لە:

کردن - کە نیشکە کرا/ نەکرێ

خواردن - خۆ نانەکە خورا/ نەخورێ

سەرچاوەکان:


١- وریا عومەر ئەمین -تێپەڕ و تێنەپەڕ- ڕۆژنامەی عێراق ژ (٢٥٣٤). م ١٩٨٤/٥/٣٠.

٢- وریا عومەر ئەمین -ڕستەی بکەر نادیار. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ (٩٥) - ١٩٨٢.

٣- نووسینەکانی د. ئاوڕەحمانی حاجی مارف و د. کوردستان موکریانی و مامۆستا نوری عەلی ئەمین.

٤- کۆڕی زانیاری کورد -ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ١٩٧٦.

5- Fillmore C. J (1968) "The case for case" in Bach and Harms.

6- Smith. N and D- wilson (1979) "Modem linglinuistcs" Penguin Books.



*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٧) ساڵی ١٩٨٥، لاپەڕە ١٩٦-٢٠٠ بڵاوکراوەتەوە.**

# چەند یاسایێکی مۆرفۆلۆجیی داڕشتنی فرمان

فـرمان و یاساکانی داڕشتنی گرنگترین لایەنی ڕێزمانن. زانینی زمانێ تا ڕادەیەکی زۆر بەستراوە بەزانین و جیاکردنەوەی چەمکە جیاوازەکانی کاتەکانی ئەو زمانە و پەیوەندییان بەکاتی (فیزیاوی)یەوە.

ئاڵۆزیی سیـسـتـەمی کـات و چەمکی جۆرەکانی و ژمارەیان دەگۆڕێ لە زمانێکەوە بۆ زمانێ. زمان هەیە لەم ڕووەوە ئاڵۆزییەکی زۆر پیشان دەدا، هەشە زۆر سادەبێ.

پلەی ئاڵۆزیی سیـسـتـەمی کـات پەیوەندی بەدەربڕینەوە نییە. هەچ کـاتێک بەهەچ زمانێکی سیستەمی ئاڵۆز دەربڕابێ، هەچ زمانێکی سیستەم سادەش دەتوانێ بەیارمەتی ئاوەڵکاردوە دەری بڕێ. بۆ نموونە ئەم سێ چەمکە لە زمانی ئینگلیزیدا یەک قـاڵبیـان لە زمانی کوردیدا هەیە:

دەچم

I Will go (داهاتوو)

I go (سادە)

Iam going (بەردەوامی)

بۆ جیاکردنەوەی ئەم سێ چەمکە لە حاڵەتی یەکەمدا ئاوەڵکارێکی وەک (بەیانی) و لە دووەمدا (هەموو ڕۆژ) و لە سێیەمدا (وا) ئەشێ بەکار بهێنرێن.

بەیانی دەچمە قوتابخانە. (ئایندە)

هەموو ڕۆژ دەچمە قوتابخانە. (سادە)

وا دەچمە قوتابخانە. (بەردەوامی)

کاتی (ڕێزمانی) دەبێ لەکاتی (فیزیاوی) جیابکرێتەوە، چونکە لە زۆر حاڵەتدا یەک ناگرنەوە. گەلێ جار ڕەگی فرمانی ڕستە (بەپێی شیکردنەوەی ڕێزمانی) ڕابردووە کەچی ڕووداوەکە لە داهاتوودا ڕوودەدا و بەپێچەوانەوە. بۆ نموونە لە ڕستەی:

بەیانی کە هاتم کتێبەکەت بۆ دەهێنم.

کاتی فـرمانی (هاتم) لە ڕووی داڕشتنی ڕێزمانییەوە ڕابردووە، بەڵام ڕووداوەکە واتا

(هاتنەکە) لە کاتێکی داهاتووی (فیزیاوی)دا ڕوودەدات کە بەیانییە.

حاڵەتی واش هەیە فرمانەکە بەڕەگی داهاتوو دادەڕێژرێ کەچی ڕووداوەکە لەکاتێکی ڕابردوودا ڕووی داوە. وەک لە فرمانی بکەر نادیاردا لە ڕستەی:

پیاوەکە دوێنێ کوژرا.

فرمانی (کوژرا) بەڕەگی داهاتووی فرمانی (کوشتن) کە (کوژ)ە داڕێژراوە کەچی ڕووداوەکە لە کاتێکی ڕابردوودا ڕووی داوە کە (دوێنێ)یە.

گەلێ نموونەی تری لەم بابەتە ئەشێ بخرێتە بەرچاو بۆ سەلماندنی ئەوەی کە کاتی داهاتوو و ڕابردووی ڕێزمانی جیایە لە هی فیزیاوی و پەیوەندیی نێوانیان لە ڕووە هەرە ئاڵۆزەکانی ڕێزمانە و هەر زمانەش بەپێی مەنتیقی تایبەتی خۆی ئەم پەیوەندییە پیشان دەدات.

لە ڕێزمانی کوردیدا دوو ڕەگی جیاواز بۆ فرمان دەس نیشان کراون ئەوانەن کە پێیان دەوترێ ڕەگی داهاتوو Present Stem و ڕەگی ڕابردوو Past Stem. هەموو کاتە ڕێزمانییەکان بەم دوو ڕەگە دادەڕێژرێن.

چاووگ کراوە بەسەرچاوە لێیەوە ڕەگی ڕابردوو بەلابردنی (ن)ی چاووگ وەردەگیرێ. (هەموو چاووگێک بە(ن) کۆتایی دێت).

| چاووک | ڕەگی ڕابردوو |
|---|---|
| خواردن | خوارد |
| پژمین | پژمی |
| کردن | کرد |

ڕێزمانی کوردی پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی ڕابردوو و داهاتووی دەسنیشان نەکردووە. واتا ئەو یاسایانەی نەخستۆتە ڕوو کە بەهۆیانەوە ڕەگی داهاتووی فەرمان وەردەگیرێ. بۆ ئەم مەبەستە پەنا دەباتە بەر سەلیقەی قسەکەر. فرمانەکە دەخاتە کاتی ئێستا و پێشگری (دە) و (ڕاناوە لکاوەکە) لادەبا... ئەوەی دەمێنێتەوە ڕەگە داهاتووەکەیە. بەم پەیڕەوە ناشێ پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی ڕابردوو و داهاتوو بەپێی یاسای ڕێزمانی دەستنیشان بکرێ. جارێ هەوڵ دەدەین ئەم پەیوەندییە بخەینە ڕوو ئینجا یاسای داڕشتنی کاتەکان ڕوون دەکەینەوە.

یاساکانی وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو

چاووگ له زمانی کوردیدا به(ن) کۆتایی دێت. پێش ئەم (ن)ە یەکێ لەم پێنج فۆنیمانە دەردەکەوێ (ی - ا - وو - د - ت).

ی پژمین - سڕین - دزین

ا هێنان - گەڕان - ژیان

وو بوون - چوون - درووَن

د کردن - چاندن - بردن

ت کەوتن - شوشتن - هاتن

١- گەر چاووگەکە (یائی) بوو واتا (ی)ی تێدا پێش (ن) دەرکەوت - ڕەگی داهاتووی بەلابردنی (ی) یەکە دەس دەکەوێ.

| چاووگە | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| پرسین | پرسی | پرس |
| فڕین | فڕی | فڕ |
| دزین | دزی | دز |
| ماڵین | ماڵی | ماڵ |

٢- گەر چاوگەکە ئەلفی بوو.

ا - لەگەڵ فرمانی تێپەڕا ڕەگی داهاتوو بەلابردنی (ا)ەکە دەست دەکەوێ.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| هێنان | هێنا | هێن |
| کێلان | کێلا | کێڵ |
| کێشان | کێشا | کێش |

ب- گەر تێنەپەڕ بوو بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو (ا) دەکرێ بە(ێ).

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| سووتان | سووتا | سووتێ |
| گریان | گریا | گریێ |

ئەم پێنج چاووگە یەک بڕگەییە ناوێزەن و بەر ئەم یاسایە ناکەون:

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
| --- | --- | --- |
| دان | دا | دە |
| مان | ما | مێن |
| (دا)نان | نا | نێ |
| مان | ما | مێن |
| (هەڵ)سان | سا | س |

٣- گەر چاووگەکە (واوی) بوو:

أ- لە تێپەڕا ڕەگی داهاتوو وەک هی ڕابردوو وایە.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
| --- | --- | --- |
| دروون | دروو | دروو |
| سوون | سوو | سوو |

ب- لە تێنەپەڕدا (وو) لادەبرێ.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
| --- | --- | --- |
| چوون | چوو | چ |
| بوون | بوو | ب |

٤- بۆ چاووگە (دالی)یەکان ناشێ یاسایەکی گشتی دابنرێت. ئەم چەن یاسایە دەستنیشان کران.

أ- گەر ڕەگی ڕابردوو بە(ارد) یا (اند) کۆتایی هاتبێ... (د) لادەبرێ و (أ) دەکرێ بە(ێ)[١].

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
| --- | --- | --- |
| ناردن | نارد | نێر |
| ژماردن | ژمارد | ژمێر |
| سپاردن | سپارد | سپێر |

فرمانی (خواردن) بەر ئەم یاسایە ناکەوێ. ڕەگە داهاتووەکەی (خۆ)یە.

ب- ئەو فەرمانانەی ڕەگی ڕابردوویان بە (رد) کۆتایی دێت و پێش ئەم (رد)ە ڤاوڵی کورتی (i) هەبێ... ڕەگی داهاتوویان بەلابردنی (رد) و جێگیر کردنییەتی بە (ە).

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| کردن | کرد Kird | کە |
| بردن | برد bird | بە |

بۆ چاووگە (دال)یەکانی تر ناشێ یاسای وادابنرێ بەهۆیەوە پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی ڕابردوو و داهاتوو پیشان بدرێ.

٥- گەر فرمانەکە (تائی) بوو.

أ- گەر ڕەگی ڕابردوو بە(-ەوت) کۆتایی هاتبێ. ڕەگی داهاتووی بەلابردن (ت) دەست دەکەوێ.

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| کەوتن | کەوت | کەو |
| خەوتن | خەوت | خەو |
| سرەوتن | سرەوت | سرەو |

لیستەیەکی (٢٤٩)[٢] چاووگیم لەبەر دەستدایە. گەر ئەو یاسا لابەلایانەی کە هەردوو سێ فرمانیان بەردەکەوێ پشتگوێ بخرێن و ئەمانیش بخرێنە ناو لیستەی ناوێزەکانەوە، ژمارەی ناوێزەکان دەبێتە (٣٨). بەپێی ئەم لێکۆڵینەوە و بۆچوونە ئەشێ ڕەگی داهاتووی ٨٤،٣٪ فرمانی کوردی بەیاسا وەربگیرێ.[٣]

یاساکانی وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

هەچ فرمانێک لە لیستەی ناوێزەکاندا نەبوو بەو یاسایانەی سەرەوە ڕەگی داهاتووی وەردەگیرێ.

**ناوێزەکان**

| | |
|---|---|
| دان - دە | پالاوتن - پالێو |
| مان - مێن | خستن - خە |
| نان - نێ | ڕستن - ڕێس |
| ژیان - ژی | گەستن - گەز |
| (هەڵ)سان - س | پشکووتن - پشکوێ |
| بووردن - بوور | نیشتن - نیش |
| خواردن - خۆ | گواستن - گوێز، گواز |
| سەندن - سەن - سێن | گرتن - گر |
| کردن - کە | نوستن - نوو |
| بردن - بە | بیستن - بیست |
| بزووتن - بزوو | ناشتن - نێژ |
| مردن - مر | ڕشتن - ڕێژ |
| دیتن - بین | خواستن - خواز |
| وتن - ڵێ | هاژووژتن - هاژۆ |
| ووتن، گوتن - لێ | کرۆشتن - کرۆژ |
| هێشتن - هێڵ | کوشتن - کوژ |
| هاتن - ێ | لێستن - لێس |
| هاوێشتن - هاوێ | کلۆفتن - کلۆف |
| فرۆشتن - فرۆش | گەیشتن - گە |

کاتەکانی زمانی کوردی لەم خشتەیە ڕوون کراوەتەوە:

| کات Tense | جۆر Aspect | چەمک | یاسا | نموونە |
|---|---|---|---|---|
| رابردوو Past | سادە Simple | رووی دا بێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی بەهیچ رووداوێکی ترەوە هەبێ | رەگی رابردوو + (راناوی لکاو) | نووسی - مان ← نووسیمان<br>نووست - یت ← نووستیت |
| | بەردەوامی Continuous | لە کاتێکی دەست نیشان کراو لە رابردوودا لە رووداندا بوو | دە + رەگی رابردوو + راناوی لکاو | دە - مان - نووسی ← دەماننووسی<br>دە - نووست - ین ← دەنووستین |
| | تەواو Perfect | رووی دا و برایەوە بەڵام تەئسیری مایە کاتێکی دەست نیشان کرا و لە رابردوودا | رەگی رابردوو + بوو + راناوی لکاو | نووسی - بوو - م ← نووسیبووم<br>نووست - بوو - ین ← نووستبووین |
| | مەرجی و خۆزگەیی Conditional | رووی بدایە ئەنجام جۆرێکی تر دەبوو | ب + رەگی رابردوو + (راناوی لکاو) + ایە | ب - مان - نووسی - ایە ← بماننووسیبایە<br>ب - نووست - ین - ایە ← بنووستینایە |
| داهاتوو Present | سادە Simple | لە روودانایە یا لە کاتێکی داهاتوودا روودەدا | دە + رەگی داهاتوو + (راناوی لکاو) | دە - نووس - ین ← دەنووسین<br>دە - نوو - ین ← دەنووین |
| | تەواو Perfect | رووی دا و برایەوە بەڵام تەئسیری مایە ئێستا | رەگی رابردوو+ وو + (راناوی لکاو+ـە)<br>(لەگەڵ تێپەڕدا تەنیا لەگەڵ سێیەمی تاک (ـە) دەرئەکەوێ) | نووسی - وو - مان - ە ← نووسیومانە<br>نووست - وو - ین ← نووستووین |
| | مەرجی سادە Simple Conditional | لەوانەیە روو بدات | ب + رەگی داهاتوو + (راناوی لکاو) | ب - نووس - یت ← بنووسیت<br>ب - نوو - ین ← بنووین |
| | مەرجی تەواو Perfect Conditional | لەوانەیە رووی دابێ | رەگی رابردوو + ب + (راناوی لکاو) | نووسی - ب - مان ← نووسیبمان<br>نووست - ب - ین ← نووستبین |

پەراوێزەکان:

١- هەموو ئەو فەرمانە بەتێپەڕ کراوانەی وەک مراندن - گریاندن.. هتد) و ئەوانەی لە دەنگە سروشتییەکانەوە بەپاشگری (اند)ی وەک قیژاندن - چریکاندن.. هتد) داڕێژراون بەر ئەم یاسایە دەکەون.

٢- ئەو فەرمانانەی لە پەراوێزی ژمارە (١)دا باس کرا و نەخراونەتە ئەم ڕێژەیەوە.

٣- سەیری ئەم وتارەم بکەن:

ڕێزمانی ڕاناوی لکاو - گۆڤاری کاروان ژ (٨) ئاياری ١٩٨٣ ل ٦٨ - ٧٤. یاساکانی ڕاناوی لکاو دەست نیشان نەکات.

سەرچاوەکان:


١- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاریی کوردی.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) کات و ڕەگی فەرمان. گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژ (٦٥).

٣- نووسینەکانی مامۆستایان نوری عەلی ئەمین، د. نەسرین فەخری، د. کوردستان موکریانی و د. ئاوڕەحمانی حاجی مارف.

4- Mackenzie, D. N. (1961) Kurdish dialect Studies. London.

5- Lyons, J (1968) "Introduction to theoretical Linguistics" Cambrige university Press.



* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٩) سالی ١٩٨٦، لاپەڕە ٢٥٨-٢٦٤ بڵاوکراوەتەوە.

# بناغەی سادەترین ڕستەی کوردی

ڕستە گەورەترین دانەی (ڕێزمانی)ی زمانە. ئامانجی هەرە سەرەکیی ڕێزمان پێناسینی ڕستەیە ڕستەش پێ ناناسرێت بێ پێناسین و دەستنیشانکردنی سروشت و چۆنیەتی هەموو ئەو کەرەسانەی دروستی دەکەن و جۆری پەیوەندیی نێوانیان لەناو چوارچێوەی ڕستەدا.

سادەترین کەرەسەکانی زمان ئەو تاکە دەنگانەن کە بەهۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن. گەورەترین و ئالۆزترین دانەی (ڕێزمانی)ش ڕستەیە. پەیوەندیی نێوان دەنگ و ڕستە لەسەر پەیڕەوێکی هەرەمیی ئەم جۆرە دامەزراوە.

واتا: بەهۆی ئەو نرخانەی تاکە دەنگەکانی زمان لەناو چوارچێوەی زمانێکی تایبەتیدا پیشانی دەدەن فۆنیمەکانی زمانەکە دەسنیشان دەکرێن.

لەناو قالبی برگەکاندا بەفۆنیمێ یا زیاتر مۆرفیم پێک دێت.

بەمۆرفیمێ یا زیاتر وشە پێک دێت.

بەوشەیێ یا زیاتر فرێز پێک دێت.

چەند فرێزێکیش ڕستە پێک دەهێنن.[1]

دەستنیشانکردنی سروشت و چۆنیەتی پێکهاتنی ئەم کەرەسانە (دەنگ، فۆنیم، بڕگە، مۆرفیم، وشە، فریز) و چۆنیەتی لەیەکدانیان لەناو چوارچێوەی ڕستەدا ڕێزمانی زمانەکەیە.

ئەم باسە سینتاکسییە. دانەی سەرەکیی (سینتاکس) وشەیە... بۆیە توخون دەنگ و فۆنیم و بڕگە و مۆرفیم ناکەوین.[٢] ڕستە لەهەر زمانێکدا لە چەند بەشێکی بنجی (ڕیشە) پێک دێت... هەر دانەیێکی ڕێزمانی بتوانێ دەوری بەشێکی بنجیی ڕستە بگێڕێ (فریز)ێک پێک دەهێنێ. سادەترین ڕستە لە دوو فریز پێک دێت:

١- فریزی ناوی Noun phrase (ف. ن. بۆ کورتکردنەوە).

٢- فریزی فرمانی Verb phrase (ف. ف.).

ڕیزبوونیان لە ڕستەی زمانی کوردیدا بەم جۆرەیە:

سادەترین فریزی ناوی لە ناوێک (یا ڕاناوێک) پێک دێت.

سادەترین فریزی فرمانی لە زمانی کوردیدا لە ڕەگی فرمان و ڕاناوێکی لکاو پێک دێت، ئەرکی ڕاناوی لکاو دەربڕینی ڕێکەوتنە لە نێوان بکەر و فرماندا.[٣]

ئەم وێنەیە بناغەی سادەترین ڕستەی زمانی کوردی ڕوون دەکاتەوە.

بەدەستنیشانکردنی یاساکانی دارشتنی (فریزی ناوی) و (فریزی فرمانی) ڕێزمانی سادەترین ڕستەی کوردی دەستنیشان دەکرێ.

### ١- فریزی ناوی

فریزی ناوی لە ناوێ یا زیاتر پێک دێت. (کە دەڵێین زیاتر واتا ژمارەییکی بێ کۆتایی).

ف.ن ⟵ ناو + ناو --⟵ ∞        یاسا ژمارە (١)

ئەم ناوانە بە(و) یا (ی) لەیەک دەدرێن. جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە لەیەکدانە لەوەدایە، ئەو ناوانەی بە(و) لەیەک دەدرێن هەموو بەشداری لە ڕووداوی فرمانەکە دەکەن بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێیان سپێرراوە. وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

أ- ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ... هاتن.

ب- من ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ... دەبینم.

ج- من نامە بۆ ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ دەنێرم.

ئەم چوار ناوە (ئازاد - ڕزگار - ئاواز - ئاهەنگ) بەئامرازی (و) لەیەک دراون. لە (أ)دا دەوری بکەری ڕستەکە دەبینن، هەر چواریان لە (هاتن)دا بەشدارن.

لە (ب)دا دەوری بەکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکە دەبینن. هەر چواریان بەشدارن لەوەی کە دەبینرێن.

لە (ج)دا دەوری بەکاری ناڕاستەوخۆ دەبینن، هەر چواریان بەشدارن لەوەی نامەیان بۆ دەنێررێ.

لەلایەکی ترەوە ئەو ناوانەی بە(ی) لە یەک دەدرێن پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا لەسەر بناغەی (هەیی) Possessive دایە. تەنیا ناوی یەکەم ڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێی سپێرراوە بەجێ دەهێنێ. ئەم ناوەش سەر بەناوی دووەم دەبێ و ناوی دووەم سەر بەهی سێیەم دەبێ و سێیەم سەر بەچوارەم و بەم جۆرە. وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێ.

د- برای دەزگیرانی کچی پوورم دەناسم.

هـ- من برای دەزگیرانی کچی پوورم دەناسم.

و- من نامە بۆ برای دەزگیرانی کچی پوورم دەنێرم.

لەم ڕستانەدا (برا - دەزگیران - کچ - پوور) هەموو ناون بەئامرازی بەستن (ی) لەیەک دراون لە (د)دا دەوری بکەری و لە (هـ) دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆ و لە (و)دا دەوری بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەبینن.

لە هەر سێ حاڵەتدا تەنیا (برا)یە ڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکاندا پێی سپێراوە، بەجێ دەهێنێ تەنیا (برا)یە لە (د)دا هاتووە و لە (هـ)دا ناسراوە و لە (و)دا نامەی بۆ دەنێررێ. ئەم (برا)یە هی (دەزگیران)ە و دەزگیران هی (کچ)ە و کچ هی (پوورم)ە.

لە ڕووی ئەزەرییەوە هیچ هێزێ نییە بڵێ ژمارەی ئەو ناوانەی لە بکەر و بەرکاردا دەردەکەون نابێ لەوەندە ڕەت بێ. ژمارەی ناوەکان هەرچەندێ بێ دەشێ ناوێکی تری بخرێتە سەر.

لە ڕووی عەمەلیشەوە... ژیانی ڕۆژانە هەرگیز پێویستی بەم جۆرە ڕستانە نییە ژمارەی ناوەکانی یەکجار زۆربێ.

ناو دەشێ ئەم ئامرازانەی لەگەڵدا دەرکەوێ:

(ان)ی کۆ:

(ەکە)ی پێناسین:

(ێک)ی نەناسین (یا تاکێتی singularity).

(ان) و (ێک) هەرگیز پێکەوە دەرناکەون.

گەر (ان) و (ەکە) پێکەوە دەرکەوتن ڕیزبوونیان بەم جۆرە دەبێ:

ەکە ــــ ان ــــ◄ ەکان

کوڕ ــــ ەکە ــــ ان ــــ◄ کوڕەکان

یاسای لێکدانی ناوەکان بۆ پێکهێنانی فرێز لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

یاسای ژ (٢)

هەر ناوەی دەشێ ناوەڵناوێ یا زیاتری لەگەڵدا دەرکەوێ. (دیسان ژمارەی ناوەڵناوەکان بێ سنوورە). گەر هات ناوەکە ئامرازی پێناسینی (ەکە)ی لەگەڵدا بوو. ئەوە ناوەکە بەناوەڵناوی یەکەمەوە و ناوەڵناوەکان بەیەکەوە بەهۆی ئامرازی بەستێ (ـە) لێک دەدرێن و (ەکە) دەچێتە سەر دوا ناوەڵناوەوە.

یاسا ژمارە (٣)



هەر ناوەڵناوەش دەشێ (ڕادە)یێکی intensifire لەگەڵدا دەرکەوێ... (مەبەست لە ڕادە ئەم جۆرە و شانەن: زۆر - کەمێ - هەندێ - یەکجار... هتد) ڕادە پێش ئاوەڵناو دەکەوێ.

جوان - زۆر جوان

بەرز - یەکجار بەرز

یاسا ژمارە (٤)

گەر ناو (ەکە)ی لەگەلدا نەبوو ناو و ناوەلناوەکان بەهۆی ئامرازی بەستن (ی) لێک دەدرێن، (ێک)ی لەگەلدا بێ یا نا.

کوڕی زیرەکی ئازا - کوڕێکی زیرەکی ئازا

پیاوی ژیری دلسۆز - پیاوێکی ژیری دلسۆز

یاسا ژمارە (٥)

ø نیشانەیە بۆ (هیچ) واتا دەرکەوتنی ناو بەبێ (ەکە) و (ێک). یاسا ژ (٤) و (٥) لە یەک یاسا کۆ دەکرێنەوە.

یاسا ژمارە (٦)

هەر ناودی دەشێ ناوێکی ژمارەی لەگەڵدا دەرکەوێ

ناوی ژمارە هەمیشە پێش ناو دەکەوێ.

پێنج پیاو...

دوو سەد و بیست قوتابی.

بەشێوەیێکی گشتی (ناوی ژمارە) و ئامرازی کۆ پێکەوە لەگەڵ هەمان ناودا دەرناکەون

(×) نیشانەی لەگەڵ یەک دەرنەکەوتنە.

یاسا ژمارە (٧)

دە منالی یەکجار ساوا (بێ ئامراز)

دە پیاوێکی زۆر ئازا (لەگەڵ ێک)

حەوت کتێبە زۆر کۆنەکە. (لەگەڵ ەکە).

هەر ناوەی دەشێ... ناوێکی ئیشارەی لەگەڵدا دەرکەوێ. ناوەکانی ئیشارە ئەمانەن:

| | نزیک | دوور |
|---|---|---|
| تاک | ئەمە | ئەوە |
| کۆ | ئەمانە | ئەوانە |

کە لەگەڵ ناوا دەردەکەون دەبن بەدوو لەتەوە بەم جۆرە:

ئەم ـــ ـە    ئەم ـــ انە

ئەو ـــ ـە    ئەو ـــ انە

(ناو) و هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا دەردەکەون دەکەونە نێوان ئەم دوو بەشانەوە. (ناوی ئیشارە) و (ەکە) و (ێک) هەرگیز لەگەڵ یەکتر دەرناکەون.

فرێز لە کوردیدا یەک جار ئامرازی کۆی دەچێتە سەر. لەگەڵ ناوی ئیشارەدا ناو و ناوەڵناوەکان بەهۆی ئامرازی بەستن (ـە) لێک دەدرێن (وەک لەگەڵ (ەکە)دا... چونکە ناوی ئیشارەش چەمکی پێناسین دەگەیەنێ).

یاسا ژمارە (٧) بەم جۆرە فراوان دەکرێ

یاسا ژمارە (٨)

ناو خراوەتە ناو دوو کەوانەی []. واتا ناو (ناووکی) head فرێزی ناوییە و دەبێ لە ڕستەی بناغەدا دەرکەوێ obligatory. ناوی ئیشارە و ژمارە و ناوەڵناو و ڕادە خراونەتە ناو دوو کەوانەی () واتا دەشێ دەرکەون optional. دەرکەوتن و دەرنەکەوتنیان کار لە ڕێزمانییەتی ڕستەکە ناکات.

## ٢- فرێزی فرمانی

ناوکی فرێزی فرمانی لە زمانی کوردیدا لە ڕەگی فرمان و ڕاناوێکی لکاو پێک دێت.

ڕێزمانی کوردی دووڕەگی جیاوازی بۆ فرمان دەستنیشان کردووە. ئەوانەن کە پێیان دەوترێ (ڕەگی رابردوو) و (ڕەگی داهاتوو)... هەموو کاتە ڕێزمانییەکان بەم دووڕەگە دادەڕێژرێن.

چاووگ کراوە بەسەرچاوە لێیەوە ڕەگ وەردەگیرێ. ڕەگی ڕابردوو بەلابردنی (ن)ی چاووگ دەست دەکەوێ. بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو چەند یاسایێک دەستنیشان کراوە پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی ڕابردوو و داهاتوو ڕوون دەکاتەوە[٤] نیشانەی (دە) دەبێ لەگەڵ ڕەگی داهاتوودا دەرکەوێ.

لە زمانی کوردیدا بکەر و فرمان لە کەس و ژمارەدا ڕێک دەکەون. واتا ڕەگی فرمان ڕاناوێکی لکاوی سەر بەهەمان کەس و ژمارەی بکەر وەردەگرێ.

ڕاناوە جودا و لکاوەکان بەپێی کەس و ژمارەیان لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

| | | جودا | لکاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | کەس | | ١ | ٢ | ٣ |
| | ١ | من | م | م | م |
| تاک | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | - | ات/ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

جۆر و کاتی فرمانەکە دەور دەگێڕن لە هەڵبژاردنی ڕاناوی لکاو (مەبەست لە جۆر، تێپەڕ و تێنەپەڕە - لە کاتیش - ڕابردوو و داهاتووە).

دەرکەوتنی ڕاناوە لکاوەکان لەگەڵ ڕەگی فرماندا بۆ دەربڕینی ڕێککەوتن بەم جۆرەیە:

| | تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|---|
| ڕابردوو | ١ | ٢ |
| داهاتوو | ٣ | ٣ |

یاساکانی داڕشتنی بناغەی سادەترین ڕستەی کوردی دەشێ لێک بدرێن و لەم وێنەیەدا ڕوون بکرێنەوە.

پەراوێزەکان:

١- (چەند ڕستەیەکیش ڕستەی لێکدراو پێک دەهێنن). ئەم باسە تەنیا دەربارەی سادەترین شێوەی ڕستەی سادەیە.

٢- بۆ ئەمانە سەیری ئەم وتارانە بکەن.

أ- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) وشە، گۆڤاری نووسەری کورد. ژ (٩) خولی دووەم.

ب- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) مۆرفیم - ڕۆژنامەی عیراق ژ ٢٤٩٣.

ج- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) فۆنۆلۆجی، کاروان ژ (٢٠).

٣- بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ئەم دیاردەیەی زمان سەیری ئەم وتارە بکە:

وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) ڕێکەوتن لە زماندا. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ (٩١).

٤- بۆ زیاتر زانیاری سەیری ئەم وتارە بکەن وریا عومەر ئەمین ١٩٨٤ کات و ڕەگی فرمان - گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژ ٦٥.


سەرچاوەکان:

١- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٣) زمان و ماتماتیک، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ ٩٧، ل٣٤-٣٧.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) ئامرازەکانی بەستن، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژ ٦٧، ل٢٨-٣١.

٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٥) ڕێزمان چییە، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژ ٦٩، ل٢٥.

٤- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاریی کورد.

5- Radford A, (1981) Transformationl syntax. Cambricdge.

6- Huddleston. R, (1976) An introduction to English transformational syntax Longman.



* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١) ساڵی ١٩٨٦، لاپەرە ١٨٣-١٨٩ بڵاوکراوەتەوە.

# بیرکاری له زمانا

ئامانجی هەرە سەرەکیی زانستی زمانی تازە، دەستنیشانکردنی ئەو یاسا و مەنتیقە گشتییەیە، کە هەموو زمانانی جیهان بەهۆیانەوە کار دەکەن و هەڵدەسوورێن. دەستنیشانکردنی ئەم یاسا و مەنتیقە گشتییە دەبێتە بناغە بۆ تێگەیشتنی چەمکی زمان وەک دیاردەیێکی گشتی و چۆنیەتی کارکردنی (عەقلی)ی مێشک، چونکە ئەو مەنتیقەی زمان بەهۆیەوە کار دەکات پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بەمەنتیقی کارکردنی (عەقڵی)ی مێشکەوە هەیە. بەم یاسا و مەنتیقە گشتییە دەوترێ ڕێزمانی گشتی Universal Grammar

تا ئێستا هیچ کۆمەڵێ نەدۆزراوەتەوە زمانی نەبێ. واتا لە کوێ مرۆڤ هەبێ زمانیش هەیە. ئەم زمانانە هەموو هەمان ئەرک بەهەمان پەیڕەو بەجێ دەهێنن ئەویش گواستنەوەی ئەو زانیارییانەیە کە لە مێشکا پارێزراون بۆ بەرامبەر بەهۆی ئەو ڕیزە دەنگانەی بەئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن.

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنی سەدان ساڵی هەزاران زمان، ساغ بۆتەوە کە ئەو جیاوازییانەی لە نێوان زمانەکانا بەدی دەکرێن دیوی دەرەوەیان دەگرێتەوە. ئەگینا لە بناغەدا هەموو یەکن. (دەتوانین بڵێین) جیاوازی نێوان دوو زمان وەک جیاوازی نێوان دوو کەس وایە. کە سەیریان دەکەیت سەر و سیمایان لە یەک ناکات بەڵام لە ڕووی تەشریحی و بایۆلۆجی و چۆنیەتی کارکردنی ئەندامەکانی لەشیان و جۆری پەیوەندییان و دروستبوونیان... هەرگیز هیچ جیاوازییەک بەدی ناکرێت.

بەمە زمان بوو بەبەڵگەیەکی بەهێز و یەکجار گرنگ لە ڕێیەوە دەسەلمێنرێ کە مرۆڤ هەموو سەر بەهەچ ڕەگەز و شارستانییەت و ناوچەیەکی جوگرافی بن... هەموو لە هەمان پلەی پەرەسەندندان.

یەکێ لە دیاردە هەرە سەیر و سەرسوڕهێنەرەکانی زمان هەمووی ئەوەیە پیاو دەتوانێ هەمیشە مانا و بیری تازەی پێشتر نەبیستراو و نەزانراو دەربڕێ و تێ بگات هەر بەو کۆمەڵە وشانەی فەرهەنگی مێشکی. ئەو شتانەی ئێستا من باسیان دەکەم (لەوانەیە) پێشتر نەتانبیستبێ، واتا - واتا و چەمکەکەی بۆ ئێوە تازەیە کەچی هەر بەو وشانە

دەربڕاون کە هەموومان تیایا بەشدارین و هەموو دەم لە قسەکردنی ڕۆژانەمانا بەکاریان دەهێنین. شاعیرێک دێ جوانترین و ناسکترین ئەندێشە و مانا کە کەس بەخەیاڵییا نەبێ... دەیخاتە ناو قالبی چەند وشەیێک کە هەمووان دەیەها جار لە قسەکردنی ڕۆژانەمانا بەکاریان دەهێنین. هەزار کەس بێنە هەموو دوو زمان بەباشی بزانن بابڵێین کوردی و عەرەبی - تێکستێکی کوردی و تێکستێکی عەرەبییان بەرێ کوردییەکە بکەن بەعەرەبی و عەرەبییەکە بەکوردی... هەر هەزاریان بەراورد بکەیت دوانیان نادۆزیتەوە لە یەک ڕستەدا بەتەواوی وەک یەک بن.

توانینی مرۆڤ لە دەربڕینی ژمارەیێکی بێ دوایی مانا و بیر و توانینی لە دەربڕینی هەمان مانا و بیر بەژمارەیێکی بێ دوایی قالب و داڕشتن هەر بەو کۆمەڵە وشانەی فەرهەنگی مێشکی (کە سنووردارە). لەسەر بناغەیێکی بیرکاری (ماتماتیکی) لێک دەدرێتەوە.

بیرکاری سیستەمێکی بریتی لە ژمارەیەکی کەم و سنووردار (نیشانە) و (یاسا)یە کە بەهۆیانەوە ژمارەیەکی بێ دوایی (نرخ) دەردەبڕێ. بۆ نموونە سەیری ئەم دوو لایەنە بکە.

١- نیشانە ( ١ - ٢ - ٣ - ٤ - ٥ - ٦ - ٧ - ٨ - ٩ - سفر).

٢- یاسا (خانەی یەکان - دەیان - سەدان - هەزاران... هتد).

| یەکان | دەیان | سەدان | هەزاران | ........ | & |
|---|---|---|---|---|---|

تەنیا بەم دوو لایەنە زۆر کەم و سنووردارە ژمارەیەکی بێ پایان نرخ دروست دەکرێت. هەر خانەیێکی بچووکتر کە بوو بە(دە) ئەم (دە)یە دەبێ بەیەک و دەکەوێتە خانەی ژوورتر و بەم جۆرە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە دوا ژمارە نییە. ژمارە چەن گەورە بێ دەشێ یەکێکی تری بخرێتە سەر. جگە لەمە هەر نرخێکیش دەشێ بەژمارەیەکی بێ دوایی جۆر دەردەبڕێ. بۆ نموونە نرخی (١) دەکاتە...

١ = ٩٩ - ١٠٠

١ = ٢ - ٣

١ = ٢/١ + ٢/١

١ = ٦/١ + ٦/٢ + ٦/٣

تا ......

نرخی هەر نیشانەیەک لەناو چوارچێوەی ئەم یاسایانەدا بەهۆی شوێنەکەی و جۆری پەیوەندیی بەنیشانەکانی ترەوە دەست نیشان دەکرێت. هەبوونی ژمارەیەکی بێ دوایی ئیحتمال بۆ ئەم جۆرە پەیوەندییانە لە نێوان ئەم نیشانانە هۆیە بۆ توانینی دەربڕینی ژمارەیەکی بێ پایان نرخ و دەربڕینی هەمان نرخ بەژمارەییەکی بێ پایان قاڵب و دەربڕین.

ئەم دیاردەیە لە هەموو لێقڵەکانی زمانیشا دەست نیشان دەکرێت.

**ئاستەکانی زمان :**

یەکێ لە دەسکەوتە هەرە گرنگەکانی زانستی زمانی تازە دەست نیشان کردنی لێقڵەکانی زمانە. چەن بیروباوەڕێکی جیا هەن دەربارەی ئەو لێقڵانە... هەر جۆرە شیکردنەوە و قوتابخانەیەکیش دابەشکردنی تایبەتیی خۆی هەیە.

قوتابخانەی (بنیوی) کە پەیوەندیی بەم باسەوە هەیە لێقڵەکان بەم جۆرەی خوارەوە دەست نیشان دەکات.

| دەنگ | فۆنێتیک | بێ مانا |
|---|---|---|
| فۆنیم | فۆنۆلۆجی | |
| بڕگە | | |
| مۆرفیم | مۆرفۆلۆجی | بەمانا |
| وشە | | |
| فرێز | سینتاکس | |
| ڕستە | | |

١- لە ئاستی فۆنۆلۆجیدا

هەر زمانەی ژمارەییێکی دەست نیشان کرا و فۆنیمی هەیە. زۆری لە نێوان (٢٥-٤٠) دایە. بۆ نموونە زمانی کوردی ٣٦ فۆنیمی هەیە[١]. زمانی عەرەبی ٣٣ زمانی تورکی ٢٩ زمانی ئینگلیزی ٣٣... هتد. فۆنیمەکان زمان لە ڕووی ئەرکەوە دوو جۆرن.

١- بزوێن vowel ٢- کپ Consonant. ژمارەی بزوێنەکان کەمن. بۆ نموونە لە ٣٦ فۆنیمی کوردی ٨ی بزوێن[1] لە عەرەبییا ٦ی بزوێن[2] لە ئینگلیزیا ٩ی بزوێن[3] و لە تورکیا ٨[4].

له هەموو زمانێکا بزوێن ناوکی برگە پێک دێنی. لەناو قاڵبی برگەی فۆنەتیکێدا لەگەڵ ئەم بزوێنە فۆنیمێکی کپ یا زیاتر دەردەکەوێ بۆ پێکهێنانی برگەی فۆنۆلۆجی[5]. وەک لەم نموونانەی خوارەوە دەردەکەوێ.

| بزوێن | برگە |
| --- | --- |
| i | kird, kic, zin |
| î | zîn, pîr, tîz... |
| ê | zêr, lêz, sêr... |
| a | kas, dast, gast... |
| â | sâl, gâz, dâw... |
| u | kurd, kurt, qul... |
| û | dûr, pûŝ, tûk... |
| o | do, bro, xoŝ... |

بەم جۆرە ژمارەیەکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ دەرکەوتنی فۆنیمە کپەکان لەگەڵ بزوێنەکانا بۆ داڕشتنی برگە. واتا دەرگا کراوەتەوە بۆ داڕشتنی ژمارەییکی بێ دوایی برگە هەر بەو چەند فۆنیمە سنووردارە.

٢- لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا

مۆرفیم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە لە فۆنیمێ یا زیاتر پێک دێت[6].

وەک بینرا لەناو قاڵبی برگەکانا ژمارەیەکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ ڕیزبوون و لێکدانی فۆنیمەکان. واتا ژمارەیەکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ داڕشتنی مۆرفیم لەناو قاڵبی برگەکانا.

ژمارەی مۆرفیمەکانی هەر زمانێ هەر چەند زۆربێ سنووردارە. بەڵام بەپێی چەمکی شیان (احتمالات) دەرگا کراوەتەوە تا ژمارەییکی بێ دوایی لێ داڕێژرێ.

بەمۆرفیمێ یا زیاتر وشە[7] پێک دێت. (گرتن - هەڵگرتن - هەڵگرتنەوە- نەگرتن هەڵنەگرتبی هەڵنەگرتنەوە- تێ گرتن- تێ نەگرتن- تێ گرتنەوە- ڕاگرتن - ڕاگرتنەوە - ڕانەگرتنەوە - داگرتن- دانەگرتن- دانەگرتنەوە... هتد).

ژمارەی وشەکانی هەر زمانێ هەر چەند زۆربێ سنووردارە... بەڵام ڕێگا کراوەتەوە بەپێی چەمکی شیان (احتمالات) تا ژمارەییکی بێ دوایی لێ داڕێژرێ.

٢- له لێڤڵی سینتاکسیدا

بەهەمان جۆر ژمارەیەکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ دەرکەوتن و ڕیزبوونی وشەکان لەناو چوارچێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستەدا.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە با ئەم هەشت وشەیە بەدەستەوە بگرین (چواریان ناو و چواریان ئاوەڵناو) و بزانین لەناو قاڵبی ڕستەیێ لە بکەر و بەرکار و فرمان پێک هاتبێ چەند ئیحتمال بۆ ڕیزبوونیان هەیە.

| ناو | ئاوەڵناو |
|---|---|
| کوڕ | قژن |
| کچ | جوان |
| مناڵ | پاک |
| ژن | قەڵەو |

یەکەم: گەر کوڕ بکەربێ.

| بکەر | بەرکار | فرمان |
|---|---|---|
| | کچێک | |
| | ژنێک | |
| | مناڵێک | |
| | کچێک و ژنێک | |
| | کچێک و مناڵێک | |
| | کچێک و مناڵێک و ژنێک | |
| | مناڵێک و ژنێک | |
| | کچێکی جوان | |
| | کچێکی قژن | |
| کوڕێک | کچێکی پاک | دەبینی |
| | کچێکی قەڵەو | |
| | کچێکی جوانی قژن | |
| | کچێکی جوانی قەڵەو | |
| | کچێکی جوانی قەڵەوی قژن | |
| | کچێکی پاکی قەڵەو | |

کچێکی پاکی قژن
کچێک و منداڵێکی جوان
کچێکی جوان و منداڵێک
کچێکی جوان و منداڵێکی قەڵەو
تا سەدەها دەڕوا

گەر (کچ) بکرێ بەبکەر هەمان ژمارە ئیحتمال بۆ ڕیزبوونیان هەیە... گەر (کوڕ و کچ) بکرێن بەبکەر گەر (ژن) بکرێ بەبکەر گەر (منداڵ) بکرێ بەبکەر... هتد ئیحتمالەکە دەگاتە هەزاران... ئەمە تەنیا بە هەشت وشە...

بەزیادکردنی ناوێ یا ئاوەڵناوێ ئیحتمالەکە سەدان جار زیاتر دەبێ...

هەر زمانێ هەزاران و دەیان هەزار وشەی تیایا...

واتا ژمارەیەکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ دەرکەوتن و ڕیزبوونی وشەکان لەناو چوارچێوەی یاسا سینتاکسییانی هەر زمانێ... هەر ڕیزبوونێکیش (نرخێ) واتا (مانایێ) دەبەخشێ. بەم جۆرە هەموو ئەو مانایانەی ئیحتمال هەیە بێنە خەیاڵی مرۆڤ دەکەونە ناو چوارچێوەی ئەم ژمارە بێ دواییەدا.

بەکورتی: لە هەر زمانێکا لە کاتێکی تایبەتیدا ژمارەیێکی سنووردار فۆنیم هەیە. بەپێی چەند یاسایێکی فۆنۆلۆجیی تایبەت بەزمانەکەوە، ئەم فۆنیمانە لەناو قاڵبی برگەکانا لێک دەدرێن بۆ داڕشتنی مۆرفیمەکانی زمانەکە. ژمارەیێکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ لێکدان و ڕیزبوونی ئەم فۆنیمانە لەناو قاڵبی برگەکانا بۆ داڕشتنی مۆرفیمەکان.

مۆرفیمانە بەپێی یاسا مۆرفۆلۆجییەکانی تایبەت بەزمانەکەوە لێک دەدرێن. وشەکانی زمانەکە پێک دەهێنن ژمارەیەکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ لێکدان و ڕیزبوونی ئەم مۆرفیمانە بۆ داڕشتنی وشەکان.

لەهەر زمانێکا لە کاتێکی تایبەتیدا ژمارەیەکی سنووردار وشە هەیە. لەناو چوارچێوەی قاڵبە سینتاکسییەکاندا ژمارەیێکی بێ دوایی ئیحتمال هەیە بۆ ڕیزبوونی وشەکان بۆ داڕشتنی ڕستە واتا ژمارەی ڕستەکانی هەر زمانێ بێ دواییە هەر چەمک و مانایێکیش بێتە خەیاڵی مرۆڤ دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەم ژمارە بێ دواییە.

پەراوێزەکان:

١- بۆ فۆنیمەکانی زمانی کوردی سەیری ئەم وتارانە بکە.

أ- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) ئیملای کوردی و چەند تێبینییەک. گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، ژ (٩).

ب- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) فۆنیمەکانی زمانی کوردی، گۆڤاری نووسەری کورد، ژ (٨)، خولی دووەم.

2- Tritton, A. S. (1978) "Arabic" teach yourself books. Hodder and Stoughton.

3- Gleason H. A. (1965) "An Introduction to discriptive Linguistics".

4- Lewis G. L. (1978) "Turkish" Teach yorself books. Hodder and Stoughton.

٥- بۆ چەمکی بڕگە سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) فۆنۆلۆجی - گۆڤاری کاروان ژ (٢٠).

٦ و ٧- بۆ مۆرفیم و وشە سەیری ئەم وتارە بکەن. وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) (وشە) گۆڤاری نووسەری کورد ژ (٩) خولی دووەم.

٨- وتمان (لە کاتێکی تایبەتیدا) چونکە ژمارەی فۆنیم و مۆرفیم و وشەکانی هەر زمانێ لە گۆڕیندایە.


سەرچاوەکان:

١- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٣) ماتماتیک و زمان گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژ (٩٧) ل٣٤-٣٧.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٣) لایەنێکی جیاوازی گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق، دەستەی کورد ژ (١٠)، ل٢٥٤ - ٢٧٦

زانستی زمان گۆڤاری نووسەری کورد خولی سێیەم ل ٤٢ - ٤٣.

4- Lyons J. (1977) Chomsky - Fontana / Collins. Glasgow.

5- Fromkin V. and Rodman R. (1978) "An Introduction to Language". Newyork.



* ئەم وتارە لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٣) ساڵی ١٩٨٧، لاپەرە ٢٢٦-٢٢٩ بڵاوکراوەتەوە.

# ڕێزمانی ڕاناو

## هەندێ شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجی

شیکردنەوەی تەواوی مۆرفۆلۆجی هەر زمانێ دەبێ ئەم سێ ئەرکە بەجێ بهێنێ:

١- دەستنیشانکردنی کەرەسە خاوەکانی (دانە سەرەکییەکان) مۆرفۆلۆجی کە مۆرفیمەکانە.[١]

٢- دەستنیشانکردنی چۆنیەتی ڕیزبوون و لێکدانی ئەم مۆرفیمانە لە دارشتنی گەورەتردا (وشە... هتد).

٣- دەستنیشانکردنی مۆرفەکانی[٢] هەر مۆرفیمێ واتا بەستنی مۆرفۆلۆجی بەفۆنۆلۆجییەوە[٣].

ئەم وتارە هەوڵدانە بۆ شیکردنەوەی هەندێ لایەنی مۆرفۆلۆجیی ڕاناوەکانی (شێوەی خواروی) زمانی کوردی.[٤]

لە زمانی کوردیدا سێتێک ڕاناوی جودا و (بەڕواڵەت)[٥] دوو سێت ڕاناوی لکاو هەیە. وەک لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.[٦]

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو A | لکاو B |
|---|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | ات/ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن |

ڕاناوی جودای کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی تاک یەک مۆرفیمین. کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی کۆ هەریەکە لە دوو مۆرفیم پێکهاتووە.[٧] یەکەم و دووەم لەو جۆرەن کە

بە supplative ناودەبرێ مۆرفیمی کەس و کۆیان تێدا لێک جیا ناکرێتەوە. کەسی سێیەمی کۆ لە مۆرفیمی کەسی سێیەمی تاک (ئەو) و نیشانەی کۆ (ان) پێکهاتووە (ئەو - ان).

## ڕاناوە لکاوەکان

هەر ڕاناوێکی لکاو چەند مۆرفێکی هەیە بەپێی ئەو بینە فۆنۆلۆجییانەی تێیاندا دەردەکەوێ.

بۆ ڕوونکردنەوە و پێشکەشکردنی شێوە جیاوازەکانی هەمان مۆرفیم (واتا مۆرفەکان) دەبێ پەنا بەرینە و بەر ئەلف و بێی فـۆنەتیکی phonetic transcription، چونکە (ی)ی کپ consonant (Y) لە هی بزوێن vowel (i) جیادەکاتەوە و نیشانەی بۆ بزوێنی (i)ی هەیە.

**کۆمەڵی (A)**

١- مۆرفیمی کەسی یەکەمی تاک (م)، دوو مۆرفی هەیە.

أ- گەر ئەو دانە ڕێزمانییەی ئەم ڕاناوەی پێوە لکا بەبزوێن کۆتایی هاتبێ ڕاناوەکە قاڵبی (m) دەگرێتەخۆ.

هێنام henâ-m

ناسیم nasî-m

دەمخوارد da-m-xwârd

ب- گەر ئەو دانە ڕێزمانییەی ئەم ڕاناوەی پێوە لکا بەکپ کۆتایی هاتبێ و ڕاناوەکە بوو بەتەواوکەری برگە قاڵبی (im) دەگرێتە خۆ.

کردم kird -im

هەڵم گرت haĺ -im -girt

نانم خوارد nân-im xârd

٢- کەسی دووەمی تاک (ت) بەر هەمان یاساکانی کەسی یەکەمی تاک دەکەوێ... ئەمیش دوو مۆرفی هەیە.

أ- گەر ئەو دانە ڕێزمانییەی لکا بەبزوێن کۆتایی هاتبێ قاڵبی (t) دەگرێتە خۆ.

هێنات henâ-t

دەت خوارد da-t xwârd

ب- گەر بەکپ کۆتایی هاتبێ بە (it) دەردەکەوێ

خواردت xwârd-it

هەڵت گرت hâl-it - girt

٣- کەسی سێیەمی تاک (ی)

أ- گەر ئەو دانە ڕێزمانییەی پێوەی لکا بەکپ کۆتایی هاتبێ. ئەم ڕاناوە شێوەی بزوێن دەگرێتە خۆ (î)

خواردی xwârd-î

هەڵی گرت hal-î-girt

ب- گەر بەبزوێن کۆتایی هاتبێ شێوەی کپ دەگرێتە خۆ (y)

هێنای henâ-y

دەی خوارد da-y-xwârd

٤- کەسی یەکەمی کۆ (مان).

لە دوو مۆرفیم (م - ان) پێکهاتووە. لە ڕووی فۆرمەوە یەک شێوە و لە ڕووی دارشتنی برگەییەوە دوو شێوەی هەیە.

أ- گەر وەک برگەیێکی سەربەخۆ دەرکەوت

هێنامان henâ-mân

هەڵمان گرت hal-mân-girt

ب- لە هەندێ بینەدا (ma) دەبێتە برگەیێک و (n) دەبێتە بەشی یەکەمی برگەی داهاتوو

هێنامانیت henâ-mâ-nît

٥- کەسی دووەم و سێیەمی کۆش هەمان شت هەریەکە لە دوو مۆرفیم پێکهاتووە و لە ڕووی فۆرمەوە یەک شێوە و لە ڕووی دارشتنی برگەییەوە دوو شێوە پێشان دەدەن.

tân (t-ân)

yân (y-ân)

هێناتان henâ-tân

هێناتانین henâ-tâ-nîn

هێنایان henâ-yân

هێنایانین henâ-yânîn

**کۆمەڵی (B)**

١- کەسی یەکەمی تاک (م)

وەک کەسی یەکەمی تاکی کۆمەڵی (A) دوو مۆرفی هەیە. (m و im) بەپێی ئەو بینە فۆنۆلۆجییانەی تێیاندا دەردەکەوێ

nûsî-m

nust-im

٢- کەسی دووەمی تاک (یت)

چوار مۆرفی هەیە (y) (i) (yt) (it)

گەر ئەودانە ڕێزمانییەی ئەم ڕاناوەی پێوە لکا بەبزوێن کۆتایی هاتبێ شێوەی (yt) دەگرێتە خۆ.

سووتایت sûtâ-yt

دێ یت de-yt

گەر بەکپ کۆتایی هاتبێ شێوەی (ît) دەگرێتە خۆ.

دەنووسیت danûs-ît

دەچیت daç-ît

دەرکەوتنی (ت)ی ئەم ڕاناوە لەو جۆرەیە کە لە زانستی زماندا پێی دەوترێ optional واتا (اختیاری) لابردنی لە هەندێ حاڵەتدا کار لە ڕێزمانییەتی و ماناکەی ناکات. بۆیە ئەم ڕاناوە دوو مۆرفی تری هەیە (y) و (î)

سووتای sutâ-y

دێی de-y

دەنووسی danus-î

دەپرسی dapirs-î

٣- کەسی سێیەمی تاک (ات / ێت). چوار مۆرفی هەیە (ât) و (et) و بەلابردنی (ت) (â) و (e).

ئەم ڕاناوە بەڕەگی کاتی ڕانەبردووی فرمانەوە دەلکێ ئەگەر ڕەگەکە بە(ۆ) یا (ـە) کۆتایی هاتبێ ڕاناوەکە قالبی (ât) یا (â) دەگرێتە خۆ لەم حالەتەدا (ۆ) دەبێتە (و)ی کپ (w) و (ـە)ی دەتوێتەوە. لە هەموو حالەتێکی تردا ڕاناوەکە قالبی (et) یا (e) دەگرێتە خۆ.

daxw-ât   da-xo-ât دەخوات

daxw-â دەخوا

da-ka-ât   dak-ât دەکات

dak-â دەکا

dapirs-et دەپرسێت

dapirs-e دەپرسێ

٤- کەسی یەکەمی کۆ (ین). سێ مۆرفی هەیە.

أ- گەر ئەو دانە ڕێزمانییەی پێوەی لکا بەکپ کۆتایی هاتبێ قالبی (în) دەگرێتە خۆ.

hât-în هاتین

daç-în دەچین

ب- گەر بەبزوێن کۆتایی هاتبێ قالبی (yn) دەگرێتە خۆ.

sûtâ-yn سووتاین

daxo-yn دەخۆین

ج- گەر ئەو دانە ڕێزمانییەی ئەم ڕاناوەی پێوە لکا بە(ی) کۆتایی هاتبێ ڕاناوەکە قالبی (n) دەگرێتە خۆ.

(ema) Firî-în (firîn) فڕین

لە ڕووی داڕشتنی بڕگەییەوە، بەشی یەکەم لە هەندێ حالەتدا دەبێتە تەواوکەری بڕگە و دووەم دەبێتە سەرەتای بڕگەی داهاتوو.

nâsî-nî ناسینی

daçî-na (awe) دەچینە (ئەوێ)

dey - na (awe) دێینە (ئەوێ)

٥- کەسی دووەمی کۆ (ن) دوو مۆرفی هەیە

أ- گەر ئەو دانە ڕێزمانییەی ئەم ڕاناوەی پێوە لکا بەبزوێن کۆتایی هاتبێ ڕاناوەکە قالبی

(n) دەگرێتە خۆ.

ترسان tirsâ-n

دێن de-n

ب- گەر بەکپ کۆتایی هاتبێ و بوو بەتەواوکەری بڕگە قاڵبی (in) دەگرێتە خۆ.

هاتن hât-in

دەچن daç-in

٦- کەسی سێیەمی کۆ (ن). ئەمیش وەک هی دووەمی کۆ ئەم دوو مۆرفەی هەیە (n) و (in).

هەموو مۆرفەکانی ڕاناوەکان و داڕشتنی بڕگەییان لەم وێنانەدا ڕوون کراوەتەوە.

| نموونە | مۆرف | نموونە | مۆرف | A |
|---|---|---|---|---|
| xwârd - im | im | henâ - m | m | م |
| xwârd - it | it | henâ - t | t | ت |
| xwârd - i | i | henâ - y | y | ی |
| bînî-mâ-nît | mâ-n | henâ -mân | mân | مان |
| bînî-tâ-nin | tâ-n | henâ -tân | tân | تان |
| bînî-yâ-nîn | yâ-n | henâ -yân | yân | یان |

| ژمارەی مۆرفەکان | نموونە | | نموونە | مۆرف | نموونە | مۆرف | نموونە | مۆرف | B |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 2 | - | - | - | - | hât-im | im | sutâ-m | m | م |
| 4 | sûtâ-y | y | hât-î | î | hât-ît | ît | sutâ-yt | yt | یت |
| 4 | daç-e | e | daxw-â | â | hat-et | et | suta-at | ât | ات/یت |
| 3 | - | - | firî-n | n | hât-în | în | sûtâ-yn | yn | ین |
| 2 | - | - | - | - | hât-in | in | sûtâ-n | n | ن |
| 2 | - | - | - | - | hât-in | in | sûtâ-n | n | ن |

پەراوێزەکان:

١- مۆرفیم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە لە فۆنیمێ یا زیاتر پێک دێت و دەورێکی لە ڕێزماندا هەیە. بەگۆڕین و لابردنی هەر فۆنیمێکی یا بەلەت لەتکردنی ماناوە دەورە ئەسڵییەکەی تێدا دەچێ.

بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی مۆرفیم و جۆرەکانی سەیری ئەم سەرچاوەیە بکەن. وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) مردنی وشە - گۆڤاری کاروان کاروان ژ٤٥، ل٨-١٤.

٢- مۆرف: مۆرفیم، لە ئەنجامی کارتێکردنی ئەو بینە جیاوازانەی تێیدا دەردەکەوێ شێوە و قاڵبی جیاواز دەگرێتە خۆ بۆ نموونە مۆرفیمی (ەکە) کە ئامرازی پێناسینە لە زمانی کوردیدا خۆی بەم چوار قاڵبە پیشان دەدا.

| | | |
|---|---|---|
| ەکە | کوڕ - ەکە | کوڕەکە |
| کە | مامۆستا-کە | مامۆستاکە |
| ەک | کوڕ - ەک - ان | کوڕەکان |
| ک | مامۆستا - ک - ان | مامۆستاکان |

(ەکە - کە - ەک - ک) هەموو شێوەی جیاوازی هەمان مۆرفیمن. بینەی جیاواز ئەم شێوە جیاوازانەی دانێ. هەر شێوەیێک (مۆرف)ێکە شێوەکان ئەلەمۆرفی یەکترن و سەر بەهەمان مۆرفیمن.

٣- زارلوە ناوێکە لە چەمکێ دەنرێ.. ئەم تاکە وشەیە پێناسین نییە تا مانای چەمکەکە بەتەواوی بگەیەنێ و هەموو لایەنێکی ڕوون کاتەوە. گرنگترین شت لە زاراوەدا پێکهاتنە لەسەر بەکارهێنانی. خۆی لەناو قاڵبە فۆنۆلۆجییەکانی زمانەکە دەتوێتەوە و دەسوێ و سروشتی زمانەکەی لێ دەنیشێ. ڤۆلت، ئەمپێر، فەرەدای و هەزاران زاراوەی تری مەیدانی زانست هەموو ناوی خەڵک و زانای ئەو مەیدانەن.. دەبێ چ پەیوەندییێک لەنێوان ئەم ناوانە و ئەو چەمکانە هەبێ کە ئەم ناوانە دەیگەیەنن. کردنی مەسەلەی گونجانی زاراوە لەگەڵ ئەو چەمکەی دەیگەیەنێ بەمەسەلەی مەرکەزی لە ڕێزمان و لێکۆڵینەوەی زمانەوانیدا خۆ بەتوێکڵ خەریککردنە.

ڕاناو ناوە بۆ ئەو کۆمەڵە وشانەی لە کەرەسەی سیمانتێکی (کەس و ژمارە)دا هاوبەشن. جا (ڕاناو) بێ (جێناو) بێ... گرنگ پێکهاتنە لەسەری.

٤- گرنگترین مەرجی لێکۆڵینەوەی زانستی خۆ بەپەیڕەو بەستنەوە و دانانی سنوورە بۆ باس. خاوەن باس دەبێ لە سەرەتای باسەکەیدا ئەم نەخشەیە دابنێ و لێی لانەدا.

لێرە کە دەڵێم ئەم وتارە هەوڵدانە بۆ شیکردنەوەی ڕاناوەکانی زمانی کوردی (خواروو - زمانی نووسین) لە لێڤڵی مۆرفۆلۆجیدا دەبێ ڕاناوەکانی ئەم شێوەیە بەڕووتی بەدەستەوە بگرم و هەر لەم لیڤڵەدا شییان بکەمەوە. گەر باسی ئەرک و بەراوردی شێوەیی و مێژوویی و پێداچوونەوەم کرد ئەوە لە گرنگترین مەرجی لێکۆڵینەوەی زانستیم لادا.

بەم دواییە کتێبێکی د. ناورەحمان حاجی مارف بەناوی (ڕێزمانی کوردی - مۆرفۆلۆجیا - جێناو)ەوە کەوتە بەردەست ئەم کتێبە کەرەسەیێکی زۆری تێدایە و مۆرکی خۆ پێوە هیلاک کردنێکی زۆری پێوە دیارە. بەڵام ناوەکەی لەگەڵ ناوەڕۆکەکەی ناگونجێ. خۆی بەناوی مۆرفۆلۆجیایە کەچی ناوەڕۆکەکەی باسی ڕاناو دەکا لە هەموو ڕوویێکەوە. پێداچوونەوە، سینتاکسی، بەراوردی شێوەیی

مێژوویی... هتد)... بەدەگمەن نەبێ تخون مۆرفۆلۆجیا ناکەوێ. ئەم کتێبە ناوی مۆرفۆلۆجیای لەسەر نەبا لە ڕووی پەیرەوی زانستییەوە گونجاوتر دەبوو. هەرچۆنێکی بێ ئەمە لە نرخی ناوەڕۆکەکەی کەم ناکاتەوە و شوێنی تایبەتی خۆی لە نووسینی ڕێزمانی کوردیدا داگیر دەکا.

شایانی باسە ئەوەش ڕوون بکرێتەوە کە لە ل٢٥ی ئەم کتێبە د. ئاوڕەحمان ڕاکەی خۆی لە بارەی وتارێکمەوە کە بەناوی (لایەنێکی جیاوازی)یەوەیە و لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ژ (١٠) ساڵی ١٩٨٣ بڵاوکراوەتەوە دووبارەی کردۆتەوە، وا بوو ڕوونکردنەوەیێکم دەربارەی لە گۆڤاری نووسەری کورد ژ (٢) خولی (٣) ساڵی ١٩٨٥ بڵاوکردەوە تێیدا دەرم خست کە ئەو بۆچوونەی د. ئاوڕەحمان لە بارەی دابەشکردنی ڕاناوە جوداکانی کرمانجی ژووروو بەپێی دۆخ هەڵەیە و دووبارەکردنەوەی هەڵەکانی کوردۆئیف و بەکاییفە... هتد.

د. ئاوڕەحمان لەم کتێبەیدا ناوی ئەم وتارە ناهێنێ و هیچ هەڵوێستێک بەرامبەر بەڕوونکردنەوەکەم پێشان نادا.

٥- وتمان بەڕواڵەت، چونکە ئەم باسە پەیوەندیی بەئەرکەوە نییە. کەی لە لێڤلی سینتاکسیدا ڕاناوەکان شیکرانەوە ئەوسا دابەشکردنی تایبەتیی خۆی دەبێ بەپێی سروشتی لێکۆڵینەوەکە ئەو پەیرەوی کە زمانەکەی پێ شی دەکرێتەوە.

بۆ ئەرکەکانی ڕاناوە لکاوەکان سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە.

وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو

٦- وا باوە کە (ئێمە) کۆی (من)ە و (ئێوە) کۆی (تۆ)یە... هتد. وردبوونەوە و شیکردنەوە وای دەرنەخا کە ناشێ (ئێمە) بەکۆی (من) و (ئێوە) بەکۆی (تۆ) لە قەڵەم بدرێ. چونکە (من) هەر ئەوم و هەرگیز نابم بەدوو و سێ تا کۆ بکرێمەوە لە (ئێمە)دا (من) ئەبە نوێنەری کۆمەڵە خەڵکێ (من) یەکێکم لەوان. (تۆ) دەبیتە نوێنەری کۆمەڵە خەڵکێ (تۆ)یێکیکی لەوان... هتد.

٧- زۆر دانەی زمانی تری وەک (چەند، کەی، ئەمە... هتد) بەڕاناو یا جێناو لە قەڵەم دراون. ئەم باسە تەنیا ئەو کۆمەڵە کەرسە زمانییانە دەگرێتە خۆ کە بەر پێناسینی وردی ڕاناو دەکەون، ئەویش بەشدارییانە لە دوو کەرەسەی سیمانتیکی (کەس و ژمارە)

سەرچاوەکان:


١- د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف (١٩٨٧) ڕێزمانی کوردی، وشەسازیی جێناو. بەغا.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) مردنی وشە، گۆڤاری کاروان ژ (٤٥).

٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو. بەغا.

4- Mathews (1970) "Morphology" in new Horizons in Linguistics ed. J. Lyons. Penguin

5- Mathews P. H. (1974) "Morphology" Cambridge university Press.



*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٥) ساڵی ١٩٨٧، لاپەڕە ١٩٣-١٩٨ بڵاوکراوەتەوە.**

# لێکدانی وشەکان

سادەترین کەرەسەی زمان ئەو تاکە دەنگانەن کە بەهۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن... ئاڵۆزترین دانەش لە زماندا ڕستەیە. پەیوەندیی نێوان ئەم دوو دانەیە لەسەر پەیڕەوێکی هەرەمیی ئەم جۆرە دامەزراوە.

واتا لە هەر زمانێکدا کۆمەڵە دەنگێ هەیە کە بەهۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن. ئەم دەنگانە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانەکە پێک دەهێنن.[1] بەهۆی دەستەیێک یاسای تری دیسان فۆنۆلۆجییەوە ئەم فۆنیمانە لەناو قاڵبی برگەی فۆنەتیکی یەک دەگرن برگەی فۆنۆلۆجی پێک دەهێنن.[2] لەناو قاڵبی برگەی فۆنۆلۆجیدا... بەفۆنیمێک یا زیاتر مۆرفیم[3] پێک دێت. بەمۆرفیمێ، یا زیاتر وشە پێک دێت... بەوشەیێک یا زیاتر فرێز[4] پێک دێت. چەند فرێزێکیش ڕستە پێک دەهێنن.

دەستنیشانکردنی سروشتی پێکهاتنی ئەم کەرەسە خاوانە و زانینی یاساکانی لێکدانیان لەناو ئەم پێکهاتنە هەرەمییە بۆ داڕشتنی دانەی گەورەتر... ئینجا گەورەتر، تا

دەگاتە لووتکەی هەرەمەکە (کە ڕستەیە) ڕێزمانی زمانەکەیە.

لەهەر (ئاست)ێکدا[٥] یاسای تایبەتی هەیە بۆ لێکدانی دانەکان. ئەم باسە هەوڵدانە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو ئامرازانەی وشەکان لەناو قاڵبی فرێز و ڕستەکاندا لێک - دەدەن.[٦]

یەکێ لە ئامانجەکانی ڕێزمان دەستنیشانکردنی پەیوەندیی نێوان بەشەکانی ڕستەیە. ڕوویێکی ئەم پەیوەندییە لە چۆنیەتی لە یەکدانی وشەکاندایە. لە زمانی کوردیدا... سێ ئامرازی بەستن Conujnction هەیە. (ناو و ناو) و(ناو و ناوەڵناو) لەناو چوارچێوەی ڕستەدا لە یەک دەدەن کە ئەمانەن: (و - ی - ە). هەریەکە ئەرکی تایبەتیی خۆی هەیە و لە حاڵەتێکی تایبەتیدا دەردەکەوێ.

یەکێ لە یاساکانی ڕێزمانی کوردی ئەوەیە بکەر، یا بەرکار (ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ)... هتد لە ناوێک، یا زیاتر، پێک دێت. ئامرازی لە یەکدانی ئەم ناوانە (و) یا (ی)یە. واتا هەموو ناوە لێکدراوەکان بەهۆی ئەم دوو ئامرازە دەتوانن دەوری بەشێکی بنچیی ڕستەی وەک بکەر و بەرکار... هتد ببینن. جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە لێکدانە لەوەدایە، ئەو ناوانەی بە(و) لە یەک دەدرێن هەموو بەشداری لە ڕووداوی فرمانەکەدا دەکەن بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێیان سپێرراوە. وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

أ- ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ... هاتن

ب- من ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ دەبینم.

ج- من نامە بۆ ئازاد و ڕزگار و ئاواز و ئاهەنگ دەنێرم.

ئەم چوار ناوە (ئازاد ، ڕزگار، ئاواز، ئاهەنگ) بەئامرازی بەستن (و) لێکدراون. لە ڕستەی (أ) دەوری بکەریی ڕستەکە دەبینن هەرچواریان لە (هاتن)دا بەشدارن. لە ڕستەی (ب) دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکە دەبینن هەر چواریان بەشدارن لەوەی کە دەبینرێن. لە ڕستەی (ج) دەوری بەرکاری ناڕاستەوخۆی ڕستەکە ددبینن... هەر چواریان بەشدارن لەوەی نامەیان بۆ دەنێررێ.

لەلایێکی تردوە ئەو ناوانەی بە(ی) لێک دەدرێن پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا لەسەر بناغەی هەیی دایە (possessive) تەنیا ناوی یەکەم ڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێی سپێرراوە بەجێ دەهێنێ. ئەم ناوەش سەر بەناوی

دووەم دەبێ، ناوی دووەم سەر بەناوی سێیەم دەبێ و بەم جۆرە... وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

د- برای مامۆستای کوڕی خوشکم هات.

هـ- من برای مامۆستای کوڕی خوشکم دەبینم.

و- من نامە بۆ برای مامۆستای کوڕی خوشکم دەنێرم.

لەم ڕستانەدا... (برا- مامۆستا- کوڕ- خوشک) هەموو ناون و بەئامرازی بەستن (ی) لەیەک دراون. لە ڕستەی (د)دا هەموو بەیەکەوە دەوری بکەری دەبینن لە ڕستەی (هـ) دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆ و لە ڕستەی (و) دەوری بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەبینن. لە هەموویاندا تەنیا (برا) بەڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێی سپێرراوە بەجێ دەهێنێ. تەنیا (برا)یە لە ڕستەی (د)دا هاتووە و لە (هـ)دا دەبینرێ و لە (و)دا نامەی بۆ دەنێررێ. ئەم (برا)یە هی (مامۆستا)یە (مامۆستا) هی (کوڕ)ە و (کوڕ) هی (خوشکم)ە. یاسای لەیەکدانی ناوەکانی ناوەکان لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

لەناو چوارچێوەی بەشە بنچییەکانی ڕستە هەر ناوەی دەشێ ئاوەڵناوێ یا زیاتری لەگەڵدا دەرکەوێ. گەر هات و ناوەکە ئامرازی پێناسین (ەکە)ی لەگەڵ دابوو. ناوەکە بەئاوەڵناوی یەکەم و ئاوەڵناوەکان بەیەکەوە بەئامرازی بەستن (ـە) لە یەک دەدرێن. ئامرازی پێناسین (ەکە) لەم حاڵەتەدا دەچێتە سەر دوا ئاوەڵناوەوە.

درەختە سەوزە بەرزەکە

ئامرازی کۆ (ان) گەر دەرکەوت هەمیشە بە(ەکە)ی پێناسینەوە دەلکێ.

درەختەکان

درەختە بەرزەکان

درەختە بەرزە سەوزەکان

ڕاناوی نیشاندانیش (ئەمە - ئەوە - ئەمانە - ئەوانە) چەمکی پێناسینی هەیە، چونکە کە ئامـاژە بۆ شتێ دەکرێ... پێ دەناسرێ بەپێی لۆجیک کە پەنجە بۆ شتێ ڕادەکێشێ پێی دەناسێنێ... بۆیە گەر لەگەڵ ناودا دەرکەوێ ناو و ناوەڵناوەکان بەئامرازی (ـە) لە یەک دەدرێن. کە ناو، یا ناو و ناوەڵناو دەچنە سەر ڕاناوی نیشاندان. دەبنە دوو بەش بەم جۆرەی خوارەوە

ئەم ـــ ـە

ئەو ـــ ـە

ئەم ـــ انە

ئەو ـــ انە

ناو و ناوەڵناوەکان ئەچنە نێوانیانەوە.

تێبینی: ئامرازی (ەکە) و (ێک) و (ڕاناوی نیشاندان)... هەرگیز هیچ کامێکیان لەگەڵ ئەوانی ترا دەرناکەوێ.

لە هەموو حاڵەتێکی تردا ناو و ئاوەڵناو بە(ی) لەیەک نەدرێن

× نیشانەی لەگەڵ یەکتر دەرنەکەوتنە (Ø) نیشانەیە بۆ ئەوەی کە ناو هیچ ئامرازێکی لەگەڵ دەرناکەوێ. یاساکانی لەیەکدانی ناو و ئاوەڵناو لەناو چوارچێوەی (فرێزی ناوی) noun phrase هەموو لەم وێنەیەدا کۆکراونەتەوە.

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە، ئامرازی لەیەکدانی (ناو و ناو) و (ڕستە و ڕستە) هەر (و)یە. هۆی ئەمە ئەوەیە ئەم دوو جۆرە لەیەکدانە یەک بنجیان هەیە، لە یەکدانی ناو و ناو ئەنجامی لابردنی بەشە هاو ئەرکە لە یەکچووەکانە Equi لە چەند ڕستەیەکی لەیەکدراو بەیاسایێکی ئابووری. بەپێی ئەم بۆچوونە ڕستەی:

من و ئازاد و ڕزگار هاتین.

لە بناغەدا ئەم سێ ڕستەیەیە.

من هاتم و ئازاد هات و ڕزگار هات.

ئەم سێ ڕستەیە بە(و) لەیەکدراون.

فرمانی (هاتن) لەهەرسێکیاندا دووبارە بۆتەوە. بۆ خۆلادان لەم دووبارە بوونەوەیە تەنیا یێکێکیان بەجێ دەهێڵرێ و ئەوانی تر لادەبرێن. لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا هەمیشە فرمان لە کۆتایی ڕستەدا دێ، فرمانی دوا ڕستە بەجێ دەهێڵرێ و ئەوانی تر لادەبرێن، تا لە ڕستە تازەکە فرمان لە شوێنی سروشتی خۆی بمێنێ ڕاناوی لکاوی دوا فرمانیش لادەبرێ، سێ بکەرەکە یەک دەگرن هەموو بەیەکەوە دەبن بە(من و ئازاد و ڕزگار). ئەمانە هەموو بەیەکەوە شوێنی (ئێمە) دەگرن، بۆ ڕێککەوتن ڕاناوێکی لکاو بەفرمانەکەوە دەلکێنرێ بگونجێ لەگەڵ کەس و ژمارەی بکەرە تازەکە.

من و ئازاد و ڕزگار هاتین.

گەر بەرکار لە چەند ناوێک پێک هاتبێ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە (بکەر) و (فرمان)ی چەند ڕستەیێ هەمان شتێ و بەهەمان پەیڕەو لابراون، وەک لە ڕستەی، من و تۆ و ڕزگار و ئازاد دەبینم.

بناغەکەی ئەم ڕستەیەیە، (من تۆ ئەبینم و من ڕزگار دەبینم و من ئازاد دەبینم)، چونکە بکەر لە زمانی کوردیدا لە سەرەتای ڕستەدا دەردەکەوێ... بۆیە بکەری ڕستەی یەکەم بەجێ دەهێڵرێ و ئەوانی تر هەموو لادەبرێن تا لە ڕستە تازەکەدا شوێنی سروشتیی خۆی بگرێ. چونکە فرمان لە کۆتایی ڕستەی کوردیدا دەردەکەوێ... بۆیە فرمانی دوا ڕستە بەجێ دەهێڵرێ... تا لە ڕستە تازەکەدا شوێنی سروشتی خۆی بگرێ.

(من تۆ دەبینم و من ڕزگار دەبینم و من ئازاد دەبینم)، دەبێتە (من تۆ و ڕزگار و ئازاد دەبینم). ئاوەڵناوەکانی (خەبەر)ی[٧] ڕستەی (کاری بوون)یش[٨] هەر بە(و) لێک دەدرێن. بۆ نموونە ڕستەی:

(ئەم درەختە چەند گەش و سەوز و بەرزە) بەپێی ئەم بۆچوونە لە بنجدا ڕستەیێکی

لێکدراوە و لەم سێ ڕستە سادەیە پێکهاتووە:

١- ئەم درەختە چەند گەشە.

٢- ئەم درەختە چەند سەوزە.

٣- ئەم درەختە چەند بەرزە.

لەهەر لێکچووەی Equi... یەکێک دەمینێتەوە و شوێنی سروشتی خۆی لە شاڕستەکەدا main sentence داگیر دەکات.

ئەم درەختە (مبتداء)ی هەر سێ ڕستەکەیە. لە هی دووەم و سێیەمدا لادەچن و لە هی یەکەم دەمینێ، چونکە (مبتداء) لە ڕستەی کوردیدا لە سەرەتادا دەردەکەوێ. چەند (ڕادە)ی[٩] ناوەڵناوەکانە... ڕادە هەمیشە پێش ناوەڵناو دەکەوێت، بۆیە هی یەکەم دەمینێتەوە و هی دووەم و سێیەم لادەچن.

(ـە)ی یەکەم و دووەم لادەچن. هی سێیەم دەمینێتەوە، چونکە فرمان لە ڕستەی کوردیدا دەکەوێتە دواوەی ڕستەکە.

١- ئەم درەختە چەند گەشە. (ـە) لادەچێ.

٢- ئەم درەختە چەند سەوزە. (ئەم درەختە) و (چەند) و (ـە) لادەچن.

٣- ئەم درەختە چەند بەرزە.

لە ئەنجاما ڕستەکە دەبێتە

ئەم درەختە چەند گەش و سەوز و بەرزە.

ئامرازەکانی بەستن هەموو لەم وێنەیەدا ڕوون کراونەتەوە.

**پەراوێزەکان:**

١- فۆنیم.. دانەیێکی مرجەردە abstract چەند دەنگێک دەنوێنێ کە هەموو پێکەوە ترخێک پێشان دەدەن لە زمانێکی تایبەتیدا. بیینەی جیاواز ئەم شێوە جیاوازانەیان پێ دەبەخشن. بۆ نموونە دوو دەنگی (س) و (ص) لە زمانی کوردیدا سەر بەهەمان فۆنیمن چونکە لەم زمانەدا هیچ وشەیێک نادۆزرێتەوە بەئاڵوگۆڕکردنی ئەم دوو دەنگە مانا بگۆڕێ. کەچی لە زمانی عەرەبیدا دوو فۆنیمی جیان، چونکە ئەم زمانە گەلێ وشەیێکی هەیە گەر ئەم دوو دەنگەیان تێدا ئاڵوگۆڕ بکرێ مانا دەگۆڕێ وەک (سلب - صلب/ عسیر - عصیر/ سار - صار... هتد) بەپێچەوانەوە دوو دەنگی (ر - ڕ) لە زمانی کوردیدا دوو فۆنیمی جیان (برین - بڕین/ کەر - کەڕ/ وەرین - وەڕین... هتد). لە زمانی عەرەبیدا سەر بەهەمان فۆنیمن، چونکە هیچ وشەی عەرەبی نییە بەئاڵوگۆڕکردنی ئەم دوو دەنگەی تیا مانا بگۆڕێ.

بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی فۆنیمەوە سەیری سەرچاوە ژ (٥) بکە.

٢- برگە: تا ئێستا هیچ قوتابخانەیێکی زانستی زمان و فۆنۆلۆجی نەیتوانیوە پێناسینێکی ڕێکی بۆ کەلەبەری برگە پێشکەش بکات. بەشێوەیێکی گشتی دوو جۆری لێ دەستنیشان کراوە.:

أ- برگەی فۆنەتیکی ئەم جۆرەیان گشتییە و هەموو زمانانی جیهان تێیدا بەشدارن. پەیوەندیی بەفسیۆلۆجییەتی هەناسە وەرگرتن و سروشتی کارکردنی ئەندامانی ئاخاوتنەوە هەیە. لەناو چوارچێوەی ئەم قاڵبە گشتییەدا زمانەکان جیاوازی پێشان دەدەن لە چۆنیەتی لێکدانی فۆنیمەکان. ئەم لێکدانە تایبەتییە برگەی فۆنۆلۆجی پێک دەهێنێ.

ب- برگەی فۆنۆلۆجی: لە هەموو زمانێکدا بزوێن vowel ناووکی برگە پێک دەهێنێ. لەگەڵ ئەم بزوێنەدا دەشێ چەند فۆنیمێکی کپ consonant دەرکەوێ. ژمارەی فۆنیمە کپەکان و جۆری ڕیزبوون و دەرکەوتنیان بەیەکەوە لە زمانەکاندا جیاوازن. بۆ نموونە لە برگەی زمانی کوردی لە یەک تا چوار کپ لەگەڵ بزوێندا لە برگەیەکدا دەردەکەوێ و هەرگیز لە دوو زیاتر ناکەوێتە لایەکی بزوێنەکەوە.

لە زمانی ئینگلیزیدا تا پێنج کپ لە برگەیەکدا دەردەکەوێ... لە زمانی عەرەبیدا تا دوو کپ دەتوانێ لە برگەیەکدا دەرکەون... ئەم جیاوازییە برگەی فۆنۆلۆجی پێک دەهێنێ. ئەو یاسایانەی فۆنیمەکان لەناو قاڵبی برگەکاندا لێک دەدا بەیاساکانی فۆنۆلۆجی ناو دەبرێن.

٣- مۆرفیم: بچووکترین دانەی واتاداری زمانە لە فۆنیمێک یا زیاتر پێک دێ و دەورێ لە ڕێزماندا دەبینێ، بۆ نموونە (دەیانبینم) لەم مۆرفیمانە پێکهاتووە.

١- /دە/ دوو فۆنیمە - چەمکی بەردەوامی دەگەیێنێ.

٢- /یان/ سێ فۆنیمە - ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی کۆیە.

٣- /بین/ سێ فۆنیمە - ڕەگی کاتی ئێستای (بینین)ە.

٤- /م/ یەک فۆنیمە - ڕاناوی لکاوە... کەسی یەکەم تاک دەگەیێنێ.

وشەی (گەلاوێژ) مۆرفیمێکی حەوت فۆنیمییە.

بۆ چەمکی وشە و پەیوەندیی بەمۆرفیم و فۆنیمەوە سەیری سەرچاوە ژمارە (٦) بکەن.

٤- وشەیێک یان زیاتر بتوانن دەوری بەشێکی بنجی لە ڕستەدا (بکەر... بەرکار... هتد) ببینن فرێزێک پێک دەهێنن. بۆ نموونە لە ڕستەی:

[ئازاد لە ساڵی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و سێدا ئەم خانووە جوانەی دروست کرد].

(ئازاد): فرێزێکە لە یەک وشە پێک هاتووە، چونکە بەتەنیا دەوری بکەری ڕستەکە دەبینێ.

(لە ساڵی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و سێدا) فرێزێکە لە حەوت وشە و سێ ئامرازی بەستن پێکهاتووە هەموو پێکەوە دەوری ئاوەڵکاری کاتی لە ڕستەکەدا دەبینن.

(ئەم خانووە:) فرێزێکی ناوییە لە دوو وشە پێکهاتووە دەوری بەرکاری لەم ڕستەدا دەبینێ.

(دروست کرد): فرێزێکی فرمانییە لە دوو وشە پێکهاتووە... فرمانی ڕستەکەیە.

٥- ئاستەکانی شیکردنەوە Levels of analysis. زمان دیاردەیێکی لە ڕادەبەدەر فراوان و ئاڵۆز و چووە ناویەکە... هەرگیز ناشێ هەر لە سووچێکەوە سەیری بکرێ و شی بکرێتەوە. بۆیە زانایان (لە بواری وەسفیدا) چەند ئاستێک بۆ شیکردنەوەی دەستنیشان دەکەن. دۆزینەوەی ئاستەکانی زمان لە دەسکەوتە هەرە گرنگەکانی مەیدانی زمانەوانییە. هەر ئاستەی سروشت و پەیڕەو و ڕێگە و تەکنیکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ شیکردنەوە. هەر قوتابخانەش بۆچوونی خۆی هەیە لە دەستنیشانکردنی ئاستەکان و سروشتی پەیوەندیی نێوانیان و شیکردنەوەیان...

هەر کارێکی زمانەوانی وەسفی بێ... بەراوردی بێ... مێژوویی بێ... ئەگەر ئاستەکان لە شیکردنەوەدا ڕەچاو نەکات تێکەڵ و پێکەڵ دەردەچێ... فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی و مۆرفۆلۆجی و سینتاکسی و بەراوردی و مێژوویی و وەسفی هەموو تێکەڵ بەیەکتر دەبن و کارەکە هیچ ئەنجامێکی ڕێکوپێک بەدەستەوە نادات و ناکەوێتە بەر پەیڕەوی زانستی.

٦- ئەم باسە تایبەتە بەکرمانجی خواروو (زمانی نووسین).

٧- مەبەست لە خەبەری ڕستە (predicate)ە.

٨- ڕستەی کاری بوون بەرامبەر (الجملة الاسمية)ی عەرەبی و (verb to be)ی ئینگلیزییە. هەندێ زمانەوان (م، یت، ە، ین، ن، ن) بەکاری بوونی کاتی ئێستا لە قەڵەم دەدەن.

| | | |
|---|---|---|
| من | م | Iam |
| تۆ | یت | you are |
| ئەو | ە | he is |
| | هیلاک | tird |
| ئێمە | ین | we are |
| ئێوە | ن | You are |
| ئەوان | ن | They are |

٩- (زۆر، تەختێ، تۆزێ، لەرادەبەدەر، یەکجار تۆزێ... هتد) ئەم وشانە سەر بەو کۆمەڵەن کە لە زانستی زمانا بە intensifire ناو دەبرێ. واتا (رادە) و (پلە)... چونکە رادە و پلەی ناوەڵناو پیشان دەدەن... (زۆر جوان... تەختێ تاڵ... یەکجار قورس... تۆزێ تاڵ... هتد)... من (پلە)م وەک زاراوە بۆ بەکارهێنا.

**سەرچاوەکان:**


١- عبدالرحمن معروف (١٩٧٩) رێزمانی کوردی - بەرگی یەکەم - بەشی یەکەم. کۆڕی زانیاریی عێراق - بەغداد.

٢- رێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاریی کورد - بەغداد.

٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٣) لایەنێکی جیاوازی... گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق - ژ (١٠) بەغداد.

٤- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) ئامرازەکانی بەستن - گۆڤاری رۆژی کوردستان ژ (٦٧) بەغداد.

٥- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) فۆنۆلۆجی - گۆڤاری کاروان ژ (٢٠).

٦- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) مردنی وشە - گۆڤاری کاروان ژ (٤٥).

٧- نوری عەلی ئەمین (١٩٦٠) رێزمانی کوردی

8- Hudleston R. (1977) An Introduction to English transformation syntax. Longman.

9- Lyons. J. (1968) Introduction to theotical Linguistics.



*** ئەم وتارە لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٨) ساڵی ١٩٨٨، لاپەرە ١٣٢-١٣٧ بڵاوکراوەتەوە.**

# بنج و سیما و یاساکانی گوێزانەوە

زماناس و فەیلەسووفان دەمێکە هەوڵ دەدەن یاسا و کەرەسەی گشتیی هاوبەش لە نێوان زمانەکانی جیهاندا بدۆزنەوە. زۆربەی زۆری زماناسانی ئەم سەردەمە لایەنگیریی ڕێبازی گشتێتی universality لە زماندا دەکەن.

لە سەرەتای سەدەی حەڤدەمدا. فەیلەسووفی ئەڵەمانی (ئەلیستید)، بۆ یەکەم جار لە مێژووی زانستی زماندا زاراوەی (ڕێزمانی گشتی) بەرامبەر بە(ڕێزمانی تایبەتی) بەکارهێنا و ڕوونی کردەوە کە ئەرکی ڕێزمانی گشتی دەستنیشانکردنی ئەو یاسا و کەرەسانەیە کە هەموو زمانانی جیهان تێیاندا هاوبەشن.

ئەگەر بەپێی مەنتیق سەیر بکەین دەبێ زمانانی جیهان هەموو، لە گەڵێ یاسا و کەرەسە هاوبەش بن چونکە هەموو هەمان دیاردەن و هەمان ئەرک بەهەمان پەیڕەو جێبەجێ دەکەن، ئەویش دەرهێنانی ئەو زانیارییانەیە، کە لە مێشکدا پارێزراون، بەهۆی ئەو دەنگانەی کە بەئەندامانی ئاخاوتن دروست دەکرێن.

لە ئەنجامی پشکنینەوە و شیکردنەوە و بەراوردکردنی هەزاران زمانی ئەمبەر و ئەوبەری جیهان دەرکەوت کە:

١- لە کوێ مرۆڤ هەبێ... زمانیش هەیە. هیچ کۆمەڵێ نییە و نەدۆزراوەتەوە زمانی نەبێ. هەج منداڵێک لە هەج کۆمەڵ و ڕەگەز و شارستانییەت و ناوچەیەکی جوغرافی ئەم جیهانە لەدایک بێ، زمانی ئەو کۆمەڵە بەتەواوی وەردەگرێ کە تێیدا پەروەردە دەبێ. ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کە هەر مێشکێک ئامادەیە بۆ وەرگرتنی هەر زمانێکی سروشتی ئەم جیهانە و ئەوەش دەسەلمێنێ کە ئەو جیاوازییانەی لە نێوان زمانەکاندا هەیە هۆی بایۆلۆجی نییە.

٢- ئەو زمانانەی بەڕەمەکی primitve ناو دەبرێن بوونیان نییە. هەموو زمانانی جیهان بەقەد یەک ئاڵۆزن و وەک یەک دەتوانن هەج ئەندێشەییەک و بیرێکی ئەم سروشتە دەربڕن.

هەموو زمانێک دەرگای بۆ کراوەتەوە تا بێ دوایی وشەی بچێتە ناو. کەی شتێکی تازە لە کۆمەڵدا پەیابوو (مادی) بێ یا (مەعنەوی)، ئەوە ناوێکی لێ دەنرێ چ بەوەرگرتن چ

بەدارشتن. وشەکە خۆی لەناو یاساکانی ئەو زمانەدا دەتوێتەوە و دەسوێ و سیمای زمانەکەی لێ دەنیشێ.

دەوڵەمەندی و هەژاری زمان لە ڕووی فەرهەنگەوە پەیوەندیی بەباری مێژوویی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەوە هەیە نەک بەپەرەسەندنەوە.

٣- هیچ زمانێک لە هیچ زمانێکی تر قورستر یا ئاسانتر نییە. قورسی و ئاسانی شتێکی نسبییە. بۆ کوردێک (بۆ نموونە) فێربوونی زمانی بلووچی لە فێربوونی زمانی چینی ئاسانترە، کەچی بۆ کابرایەکی چینی فێربوونی زمانی بۆرمی لە فێربوونی زمانی بلووچی ئاسانترە.

٤- قسەکەری هەر زمانێک دەتوانێت تا ژمارەیێکی بێ دوایی ڕستە دارێژێت و تێ بگات هەر بەو کۆمەڵە وشانەی کە لە فەرهەنگی مێشکیدا هەیە.

٥- دانەی ڕێزمانیی وەک:

(ناو - ئاوەڵناو - فرمان - ئاوەڵکار - نەفی - پرسیار... هتد) لە هەموو زمانێکدا هەیە.

٦- ئەو پەیوەندییە هەرەمییەی لە نێوان سادەترین کەرەسەکانی زمان (کە تاکە دەنگەکانییەتی) و ئاڵۆزترین دانەی زمان کە ڕستەیە لە هەموو زمانانی جیهان وەک یەک وایە. ئەمە گرنگترین بەڵگەیە دەیسەلمێنێ کە یاساکانی ڕێزمانیی هەموو زمانەکانی جیهان لێک دەکەن و هەمان شتن.

لە هەموو زمانێکدا ژمارەیێکی دەستنیشانکراو (شێوە) دەنگ هەیە. بەپێی ئەو نرخانەی ئەم تاکە دەنگانە لەناو چوارچێوەی زمانێکی تایبەتیدا پیشانی دەدەن، فۆنیمەکانی ئەو زمانە پێک دەهێنن.

لەناو قالبی برگەی فۆنەتیکی فۆنیمەکان یەک دەگرن برگەی فۆنۆلۆجی پێک دەهێنن.

لە هەموو زمانێکدا بەفۆنیمێک یا زیاتر مۆرفیم پێک دێت. بەمۆرفیمێ یا زیاتر وشە پێک دێت، بەوشەیێک یا زیاتر دەستەواژە phrase پێک دێت، چەند دەستەواژەیەکیش ڕستە پێک دەهێنن وەک لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

زۆر بەڵگەی تری (مەنتیقی و تەجریبی)ی لەم بابەتانە دەشێ ڕیز بکرێن... هەموو دەیسەلمێنن کە زمانی مرۆڤی هەموو بەپێی هەمان پەیڕەو کاردەکەن و هەڵدەسووڕێن ئەم جیاوازییەی لە نێوانیاندا بەدی دەکرێت هەر لە (سیما)دایە Surface Structure ئەگینا لە (بنج)دا Deep Structure هەموو یەکن و یەک دەگرنەوە.

بەچەند نموونەیێک چەمکی (بنج) و (سیما) ڕوون دەکرێتەوە.

ڕستەی هەموو زمانێک ئەم سێ بەشە بنجییەی هەیە:

بکەر Subject (S)

بەرکار Object (O)

فرمان Verb (V)

بۆ ڕێزبوونی ئەم سێ دانەیە ئەم شەش ئیحتیماله هەیە:

١- SOV

٢- SVO

٣- VSO

OSV -٤

OVS -٥

VOS -٦

بەپێی بۆچوونی گرینبرگ Greenberg لە ڕستەی ئاسایی هەموو زمانانی جیهاندا بکەر هەمیشە پێش بەرکار دێ. واتا لەم شەش ئیحتیمالەی سەرەوە تەنیا سێی یەکەم لە زماندا دەردەکەوێ.. بەم جۆرە زمانانی جیهان لەم ڕووەوە بوونەتە سێ جۆر:

١- جۆری VSO ئەوانەن کە فرمانیان پێش بکەر دەکەوێ وەک زمان عەرەبی.

| اشترى | الولدُ | كتاباً |
|---|---|---|
| کڕی | کوڕەکە | کتێبێک |
| فرمان | بکەر | بەرکار VSO |

٢- جۆری SVO ئەوانەن کە فرمانیان دەکەوێتە نێوان بکەر و بەرکارەوە وەک زمانی ئینگلیزی.

The boy bougth a book

کوڕەکە -کڕی- کتێبێک SVO

٣- جۆری SOV ئەوانەن کە فرمانیان دەکەوێتە دوای بەرکار وەک زمانی کوردی.

کوڕەکە کتێبێکی کڕی SOV

پەیوەندیی سیمانتیکی نێوان (کوڕ) و (کتێب) و (کڕین) لە هەر سێ زماندا بەتەواوی هەمان شتە. ئەوە بنجەکەیە کەچی لە سیمادا هەر زمانەی بەجۆرێک ئەم سێ دانەیەی ڕیز کرد.

٢- ناو لەوانەیە ئامرازی پێناسین وەرگرێ. (هەر ئەو سێ زمانە بەدەستەوە دەگرین). لە زمانی عەرەبیدا ئامرازی پێناسین (ال) وەک پێشگر خۆی دەردەخا... لە زمانی ئینگلیزیدا وەک وشەیێکی سەربەخۆ (the) و لە زمانی کوردیدا وەک پاشگر (ەکە).

ال - وَلَدُ الولدُ

the boy

کوڕ - ەکە کوڕەکە

پەیوەندیی سیمانتیکیی نێوان ئامرازی پێناسین و ناو لە هەر سێ زماندا بەتەواوی وەک یەک وان. کەچی لە سیمادا هەریەکە بەجۆرێکی پێشان دا.

ئەگەر بۆ هەر کەرەسە و دانەیێکی زمانی و بۆ هەر جۆرە پەیوەندییەکی سینتاکسی و سیمانتیکی نیشانەیێک دابنرێ... زمانەکانی جیهان هەموو بخرێنە سەر ئەو زمانە رەمزییە هەموو یەک دەگرنەوە. ئەو ئاستە موجەرەدەی ئەم پەیوەندییە سینتاکسی و سیمانتیکییانە دەستنیشان دەکات بە(بنج) لە قەڵەم دەدرێ. ئەمە بەشێوەیەکی گشتی.

لەناو چوارچێوەی زمانێکدا ئەگەر یەک دەربڕین (ڕستە) دوو مانای جیای بەخشی ئەوە ئەم ڕستەیە یەک سیمای و دوو بنجی هەیە. بۆ نموونە ڕستەی:

ئازاد ئازار لە دڵ دەڕوێنێ.

ئەم دوو واتایە دەگەیەنێ:

١- ئازاد ئازار لە دڵدا دەچێنێ. (دەخاتە دڵ)

٢- ئازاد ئازار لە دڵ دەچوێنێ. (ناهێڵێ)

هۆی ئەم جیاوازییە ئەوەیە وشەی (دەڕوێنێ) کە ڕانەبردووی (ڕواندن)ە دوو واتای هەیە. ١- چاندن ٢- ڕواندن (تێپەڕی ڕۆیشتن).

نموونەی تری لەم بابەتە:

هەر دە کەسم بینی.

ئەم ڕستەیەش دوو مانای هەیە:

١- کەسەکان (دە) بوون و هەمووم بینین.

٢- کەسەکان لە (دە) زیاتربوون و تەنیا (دەم) لێ بینین.

هۆی جیاوازی ئەوەیە وشەی (هەر)دوو مانای هەیە. ١- (کل - all) ٢- (فقط - only)

ڕستەی (پێم دەخورێ) ئەم دوو واتایەی هەیە:

١- پێی من دەخورێ.

٢- بەمن دەخورێ.

ڕستەی یەکەم سیمایەکی تری هەیە. لە ئەنجامی گۆڕینی ڕاناوی جودا (من)ە بەلکاو (پێی من) دەبێتە (پێم)

ڕستەی دووەمیش سیمایەکی تری هەیە ئەویش لە ئەنجامی جێگیرکردنی ڕاناوی (من)ە

بەلکاو. لەم حاڵەتەدا (بە) دەبێتە (پێ) بەپێی ئەم یاسا ڕێزمانییە:

(ئەگەر ئەو دانە ڕێزمانییەی دوای پێشبەندی (بە) بەراناوێکی لکاو دەربڕا (بە) دەبێتە (پێ).

ئەنجام ڕستەی (بەمن دەخورێ) دەبێتە (پێم دەخورێ).[1]

دوو یاسای جیاواز دوو ڕستەی جیاوازیان لە بنجەوە گوێزایە سیما و ڕێککەوت کردنی بەهاوسیما...

هۆیەکی تر بۆ ئەوەی ڕستەیێک زیاتر لە مانایێک ببەخشێ لە سروشتی پەیوەندیی نێوان بەشەکانییەتی لە بنجدا وەک لەم نموونەدا دەردەکەوێ:

ئازاد و ڕزگاری برام هاتن.

ئەم ڕستەیە دوو واتای هەیە:

١- ئازاد و ڕزگار هەردوو برامن... هاتن.

٢- هەر ڕزگار برامە و ئازادی لەگەڵدا... هات.

پەیوەندییە جیاوازەکانی نێوان بەشەکانی ئەم ڕستەیە لە (بنج)دا دەشێ بەم جۆرە ڕوون بکرێتەوە.

١- (ئازاد و ڕزگاری) برام هاتن.

٢- ئازاد و(ڕزگاری برام) هاتن.

ئەو ڕستانەی زیاتر لە مانایەکیان هەبێ بەڕستەی لێڵ ambiguous ناو دەبرێن.

لەلایەکی تر ئەگەر زیاتر لە ڕستەیێک هەمان واتایان بوو ئەوە ئەم ڕستانە هەموو هەمان (بنج)یان هەیە. وەک لە:

١- أ- من ئەوان دناسم. ب- ئەوان دەناسم. ج- دەیانناسم.

٢- أ- ئازاد کتێبێکی دا بەڕزگار. ب- ڕزگار کتێبێکی لە ئازاد وەرگرت.

٣- أ- حەمە بەدەستی قالە کوژرا. ب- قالە حەمەی کوشت.

٤- أ- ئاوەکە ساردبوو. ب- ئاوەکە گەرم نەبوو.

ئەم جووتە ڕستانەی سەرەوە هەموو هاو واتان واتا - لە بنجدا هاوبەشن و لە هەمان بنجەوە وەرگیراون. کەچی لە سیمادا زۆر جیاوازن. بەو نموونانەی سەرەوە دەرکەوت کە بنج ئەو ئاستەیە level کە هەموو کەرەسەیێکی سیمانتیکی و پەیوەندییەکی سینتاکسی نێوان بەشەکانی ڕستەی تێدا دەستنیشان کراوە. هەر زمانەی دەستەیەک یاسای تایبەتی بەخۆوەی هەیە ڕستەکانی لە بنجەوە دەگوێزێتە سیما، پێیان دەوترێ یاساکانی گوێزانەوە Transfomational rules لەم گوێزانەوەیەدا شت هەیە دەقرتێنرێ... هەیە زیاد دەکرێ... هەیە ئاڵوگۆڕ دەکرێ... هەیە دەگۆڕێ... هتد. بۆ نموونە:

(ئازاد تۆ دەناسێت) بنجەکەی شتێکە لەم بابەتە:

لە ئەنجامی سەپاندنی یاسایەکی بەخورتی obligatory لەم بنجە ئەم سیمایە سەر هەڵدەدا

ئازاد تۆ دەناسێت

چەند یاسایەکی تری ئارەزوویی optional سیمای تری جگە لەوەی سەرەوە بەدەردەخەن وەک:

١- یاسایێک لە زمانی کوردیدا هەیە دەڵێ... دەشێ لە سیمادا بکەر لاببرێ دوای وەرگرتنی راناوی لکاوی بکەری. بەسەپاندنی ئەم یاسایە:

ئازاد تۆ دەناسێت. ⟵ تۆ دەناسێت.

٢- یاسایێکی تر لە زمانی کوردیدا هەیە بەهۆیەوە دەشێ راناوی جودای بەرکاری بەراناوێکی لکاو جێگیر بگرێ. بەسەپاندنی ئەم یاسایە:

ئازاد تۆ دەناسێت. ⟵ ئازاد دەتناسێت.

بەسەپاندنی هەردوو یاساکەی سەرەوە رستەکە دەبێتە (دەتناسێت)[٢]. ئەم رێبازە لە شیکردنەوەدا کە بەرێزمانی گوێزانەوە ناو دەبرێ لە سالی ١٩٥٧دا لە ئەنجامی بلاوبوونەوەی کتێبەکەی چۆمسکی syntactic strucre سەری هەڵدا.

دەرچوونی ئەم کتێبە بەگرنگترین و مەزنترین رووداوی مێژووی زانستی زمان دەژمێررێت... ئەم رێبازە تازەیە هەموو قوتابخانەکانی پێش خۆی راماڵی و لەو ساکەوە هەموو زمانەوان و زانایانی زمان لە هەموو جیهانا هەوڵ ئەدەن هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر ئەم قوتابخانەیە دەرخەن و زمانی خۆیان بەپێی ئەم پەیرەوە شی بکەنەوە.[٣]

لە سالی ١٩٥٧ەوە ئەم رێبازە لە پەرەسەندندایە. بەچەند قۆناغێکا تێپەریوە و گەلێ گۆرینی بەسەرا هاتووە و پەلوپۆی لێ بۆتەوە. (لە دەرفەتێکی تردا هەوڵ ئەدەم لە مێژوو و لایەنەکانی ئەم رێبازە بدوێم).

پەراوێزەکان:

١ و ٢- بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی یاساکانی راناو سەیری ئەم سەرچاوەیە بکەن:
وریا عومەر ئەمین ١٩٨٦ رێزمانی راناوی لکاو، چاپخانەی دار الجماهیر، بەغداد.
کە لەسەر رێبازی گوێزانەوە یاساکانی رێزمانی راناو دەستنیشان دەکات.

٣- سەرچاوەی ژمارە (١) و (٢) هەوڵ دەدەن زمانی کوردی بەپێی رێبازی گوێزانەوە شی بکەنەوە.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١) سالی ١٩٨٩، لاپەرە ٧٢-٧٥ بلاوکراوەتەوە.

# ئەلەمۆرفی ڕێزمانی

ئەوەی لە بارەی پێناسینی مۆرف morph و ئەلەمۆرفەوە allomoph باوە ئەوەیە، ئەلەمۆرفەکان شێوە جیاوازەکانی هەمان مۆرفیمن[1]. دەرکەوتنی لە (بینە)ی جیاوازدا ئەو شێوە جیاوازانەی پێ دەبەخشێ. هەریەکە لەم شێوە جیاوازانە (مۆرف)ێکە. چەند نموونەیێک ئەم دوو لایەنەی زمان و پەیوەندییان بەمۆرفیمەوە ڕوون دەکاتەوە.

١- مۆرفیمی کەسی سێیەمی تاک کە لەگەڵ فرماندا دەردەکەوێت بۆ دەربڕینی ڕێککەوتن لەگەڵ بکەردا لە کاتی داهاتوودا بەم چوار شێوەیە دەردەکەوێت {ات}، {ێت}، {ا} و {ێ}[2] بەپێی ئەو (بینە)یەی تیایاندا دەردەکەوێت و بەم جۆرە:

١- ئەگەر ڕەگی فرمان بە(ۆ) یا (ە) کۆتایی هاتبێ، ڕاناوە لکاوەکە شێوەی {ات} دەگرێتە خۆ. وەک

شوشتن - شۆ/ دە - شو - ات/ - (دەشوات)

ڕۆیشتن - ڕۆ -/ دە - ڕو - ات/ - (دەڕوات)

کردن - کە/ دە - کە - ات/ - (دەکات)

بردن - بە -/ دە - بە - ات/ - (دەبات)

٢- ڕەگی فرمان بەهەر فۆنیمێکی تر جگە لە (ۆ) و (ە) کۆتایی بێ، ڕاناوە لکاوەکە شێوەی {ێت} دەگرێتە خۆ.

ماڵین - ماڵ -/ دە - ماڵ - ێت) - (دەماڵێت)

شکاندن - شکێن -/ دە - شکێن - ێت) - (دەشکێنێت)

چوون - چ -/ دە - چ - ێت/ - (دەچێت)

هێنان - هێن -/ دە - هێن - ێت/ - (دەهێنێت)

٣- بەهۆی یاسایێکی بەئارەزوو optional دەشێ {ت}ی {ات} و {ێت} - لە هەندێ حاڵەتدا نەبێ - لابیرێ، وەک لە:

ئەو کتێبەکە دەدات بەتۆ.

ئەو کتێبەکە دەدا بەتۆ. (ت) لابرا

ئەو کتێبەکە دەداتە تۆ. ناشێ (ت) لابرێ.

ئەو دەچێت بۆ دهۆک.

ئەو دەچێ بۆ دهۆک (ت) لابرا

ئەو دەچێتە دهۆک. ناشێ (ت) لابرێ.

{ات} و {ێت} و {ا} و {ێ} کە چوار شێوەی جیای هەمان دانەی ڕێزمانین. (بینە)ی جیا ئەو شێوە جیاوازانەی پێ بەخشێ. هەریەکە لەمانە مۆرفێکە و ئەلەمۆرفی ئەوانی ترە.

{ات} ئەلۆمۆرفی {ێت} و {ا} و {ێ}یە.

{ێت} ئەلۆمۆرفی {ات} و {ا} و {ێ}یە.

{ا} ئەلۆمۆرفی {ات} و {ێت} و {ێ}یە.

{ێ} ئەلۆمۆرفی {ات} و {ێت} و {ا}یە.

ب- مۆرفیمی پێناسێن/ ەکە/ ئەم چوار شێوەیەی هەیە:

١- {ەکە} وەک لە -ژوور - ەکە - م/ - (ژوورەکەم)

٢- {ەک} وەک لە -/ منداڵ - ەک - ان (منداڵەکان)

٣- {کە} وەک لە - پیاڵە - کە / - (پیاڵەکە)

٤- {ک} وەک لە -/پەنجەرە -ک - ان/ - (پەنجەرەکان).

لە (١)دا ئامرازی پێناسێن قاڵبی تەواوی خۆی وەرگرتووە، چونکە ئەم بەر و ئەوبەری فۆنیمی (کپ)ن consonant.

لە (٢)دا قاڵبی {ەک}ی گرتۆتە خۆ. چونکە لای ڕاستی فۆنیمێکی کپە (ڵ). لای چەپی (ا)یە. (ـە)ی دووەم لەناو ئەم (ا)یەدا تواوەتەوە.

لە (٣)دا قاڵبی {کە}ی گرتۆتە خۆ، چونکە (ـە)ی یەکەمی لەناو (ـە)ی (پیاڵە)دا تواوەتەوە.

لە (٤)دا قاڵبی {ک}ی گرتۆتە خۆ، چونکە (ـە)ی یەکەم لەناو (ـە)ی (پەنجەرە) و (ـە)ی دوودم لەناو (ا)ی (ان)دا تواونەتەوە.

بەم جۆرە، {ەکە} و {ەک} و {کە} و {ک} چوار شێوەی جیاوازی هەمان دانەی ڕێزمانین. وەک دەرکەوت (بینە)ی جیاواز ئەم شێوە جیاوازانەی پێ بەخشی. ئەم چوار شێوەیە سەر بەهەمان مۆرفیمن. هەر یەکە (مۆرف)ێکە. هەموو ئەلۆمۆرفی یەکترن.

ح- مۆرفیمی کەسی یەکەمی کۆ /ین/[3] بەسێ شێوە دەردەکەوێ، بەپێی پێکهاتنی فۆنەتیکیی ئەو فۆنیمەی ڕەگی فرمانەکەی پێ کۆتایی دێ.

١- {yn} وەک لە (سووتاین / sûtâ-yn)دا، چونکە ڕەگی ئەو فرمانەی پێوەی لکاوە بەبزوێن vowel کۆتایی هاتووە. (ی)ی /ین/ شێوەی کپی گرتە خۆ.

٢- {în} وەک لە (هاتین / hât-în)، چونکە ڕەگی ئەو فرمانەی پێوەی لکاوە بەکپ کۆتایی هاتووە، بۆیە (ی)ی (ین) شێوەی بزوێنی گرتەخۆ.

٣- {n} وەک لە (ئێمە فڕین / fiṙî-în - fiṙîn)دا، چونکە ڕەگی فرمان بە (î) کۆتایی هاتووە.

بەم جۆرە {yn} و {în} و {n} سێ شێوەی جیاوازی هەمان دانەی ڕێزمانین. واتا سێ مۆرفی هەمان مۆرفیمن.

دەرکەوتنی لە (بیئە)ی جیاوازدا ئەم شێوە جیاوازانەیان پێ بەخشی. هەریەکە لەمانە ئەلۆمۆرفی ئەوانی ترە.

وەک لەم شیکردنەوەیەی سەرەوە دەردەکەوێ. هۆی بوونی ئەو شێوە جیاوازانەی هەمان مۆرفیم ئەو (بیئە) جیاوازانە بوون کە تیایاندا دەردەکەوێ.

ئێستا سەیری ئەم ڕستانە بکە و (أ) و (ب) بەراورد بکە:

١- أ- ئەو لە ئێمە دەترسێت.

ب- ئەو لێمان دەترسێت.

٢- أ- من شتەکەم لە ئەوان وەرگرت.

ب- من شتەکەم لێ وەرگرتن.

٣- أ- ئاگری لە ئێمە بەردا.

ب- ئاگری تێ بەردایین.

٤- أ- ئەوان قسەکەیان بەئێمە وت.

ب- ئەوان قسەکەیان پێ وتین.

٥- أ- ئەو کتێبەکەی دا بەئازاد.

ب- ئەو کتێبەکەی دایە ئازاد.

٦- أ- تۆ کتێبەکەت دا بەئێمە.

ب- تۆ کتێبەکەت داینێ.

٧- أ- من ئازادم نارد بۆ هەولێر. (ناردم بۆ هەولێر)

ب- من ئازادم نارد-ە هەولێر. (ناردم ...... ە هەولێر)

٨-أ- ئەوم ناردووە بۆ هەولێر.

ب- ئەوم ناردۆتە هەولێر.

ئەم جووتە ڕستانەی سەرەوە هەموو هاوتان. (أ) و (ب) بریتین لە هەمان کەرەسەی ڕێزمانی، ئەوەندەیە ئەو دانە ڕێزمانییەی دوای پێشبەند دەردەکەوێ لە (أ)دا بەرِاناوی جودا و لە (ب)دا بەرِاناوی لکاو دەربڕاوە[٤].

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیەکەرِاناوە جودایەکە دەکرێتە لکاو شێوەی پێشبەندەکە preposition دەگۆڕێ.

لە (١) و (٢)دا (لە) بۆتە (لێ)

لە (٣)دا (لە) بۆتە (تێ)

لە (٤)دا (بە) بۆتە (پێ)

لە (٥)دا (بە) بۆتە /ـە/...... (ی) لەنێوان دوو بزوێندا دەرکەوتووە

لە (٦)دا (بە) بۆتە (ێ)

لە (٧)دا (بۆ) بۆتە (ـە)

لە (٨)دا (بۆ) بۆتە (تە).

گۆڕینی شێوەی ئەم مۆرفیمانە لەم نموونانەی سەرەوە بەهیچ جۆر ناشێ بخرێتە پاڵ هۆی (بینی)، چونکە:

١- بەجۆرەی ڕستەی (١)ەوە، دەشێ قاڵبی /مان/ (با بەمانایێکی تریش بێ) لە دوای پێشبەندی (لە) دەرکەوێ و هیچ کار لە شێوەی نەکات وەک لە:

ئەوان لە مانگرتن ناترسن.

٢- بەجۆرەی ڕستەی (٢)شەوە هەمان شت دەشێ /لە/ لە نێوان (م - گرتن)دا دەرکەوێ:

من ئەمەم لە وەرگرتنی پاداشتدا پێ باشترە.

٣- بەجۆرەی ڕستەی (٣)... دەشێ /لە/ لەنێوان (ئاگری - بەرد)دا دەرکەوێ و شێوەی

ناگۆڕێ.

ناگری لە بەرد بەردا.

٤- بەجۆرەی ڕستەی چوارەمەوە... دەشێ /بە/ لەنێوان (یان - وت)دا دەرکەوێ.

پیاوەکەیان بە وتەی خۆش هەڵخەڵەتاند.

٥- بەجۆرەی ڕستەی (٥ و ٦ و ٧ و ٨)هود... هیچ نەگۆڕاوە. (بینە)کان هەروەک خۆیان ماونەتەوە.

لەم نموونانەی سەرەوە دەردەکەوێ کە هۆی هەبوونی شێوەی جیاوازی هەمان مۆرفیم مەرج نییە (بیشی)بێ. بەڵگەش ئەوەبوو هەمان (بینە)یان بۆ ڕەخسێنراو کاری تێ نەکردن و شێوەی نەگۆڕین. واتا جگە لە هۆی فۆنۆلۆجی هۆی تر هەیە کار لە هەندێ لە مۆرفیمەکانی زمان دەکات و شێوەیان دەگۆڕێ. بەهۆی ڕێزمانی ناو دەبرێن -grammat ically conditioned. هەر حاڵەتێکی ئەم بابەتەش لێکدانەوەی تایبەتیی خۆی هەیە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم لایەنە زمانی کوردی من وای بۆ دەچم کە زمانی کوردی لە بواری (پێشبەند)[٥]یدا لە گۆڕین دایە.[٦]

**پەراوێزەکان:**

١- مۆرفیم بچووکترین دانەی زمانە کە مانایێک یا دەورێکی ڕێزمانی دەدرێتە پاڵ. لە فۆنیمێک یا زیاتر پێک دێت.

بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی چەمکی مۆرفیم و جۆرەکانی سەیری ئەم باسەم بکەن (مردنی وشە - گۆڤاری کاروان - ژمارە (٤٥)

٢- { } نیشانەی فۆنە لە فۆنۆلۆجیدا و نیشانەی مۆرفە لە مۆرفۆلۆجیدا.

// نیشانەی فۆنیمە لە فۆنۆلۆجیدا و نیشانەی مۆرفیمە لە مۆرفۆلۆجیدا.

٣- بۆ چۆنیەتی شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجی و دەستنیشانکردنی مۆرفەکانی ڕاناوە لکاوەکانی زمانی کوردی سەیری سەرچاوە ژمارە (١٠) بکەن.

٤- بۆ یاساکانی گۆڕینی ڕاناوی جودا بەلکاو سەیری سەرچاوە ژمارە (٧) بکەن.

٥- بۆ پێشبەندەکان و پاشبەندی بەرامبەریان و یاساکانیان سەیری سەرچاوە ژمارە (٩) بکەن.

٦- لە زانستی زماندا، لە بواری بەرلوردیدا لقێک هەیە بە Typological classification (التصنيف النمطي) ناودەبرێ. ئەرکی ئەم لقەی زانستی زمان ئەوەیە زمانەکانی جیهان پۆلێن دەکات بەپێی لێکچوونیان لە ئاستە جیاوازەکاندا levels of analysis (سینتاکسی- مۆرفۆلۆجی- فۆنۆلۆجی- فۆنەتیکی). بۆ نموونە لە ئاستی سینتاکسیدا زمانەکانی جیهان لە ڕووی ڕیزبوونی بەشە بنچینەکانی ڕستە (بکەر- بەرکار- فرمان) کراونەتە سێ جۆر:

١- بکەر - بەرکار - فرمان SOV
٢- بکەر - فرمان - بەرکار SVO
٣- فرمان - بکەر - بەرکار VSO

زمانەکانی جیهان لە ڕووی پێشبەند و پاشبەندەوە سێ جۆرن.

١- زمانە پێشبەندییەکان prepositional languages. لەم زمانانەدا دانەیەکی ڕێزمانی لەپێش ناو (یا فرێزی ناوی)دا دەرکەوێ بۆ دەستنیشانکردنی ئەرکی ڕێزمانیی. وەک (الی/ فی/ من) لە عەرەبیدا و (from / in / to) لە ئینگلیزیدا.

| عەرەبی | ئینگلیزی | ئەرک |
| --- | --- | --- |
| الی البیت | to the house | Dative |
| فی البیت | in the house | locative |
| من البیت | from the house | ablative |

لە هەندێ زماندا بەرامبەر ئەم پێشبەندانە دانەی ڕێزمانیی هاو ئەرک هەن وەک پاشگر دوای ناو (یا ناوی فرێزی)دا دەردەکەون. بەم جۆرە زمانانە دەوترێ پاشبەندی postpositional languages وەک زمانی تورکی. بەرامبەر ئەو نموونانەی سەرەوە لە زمانی تورکیدا بەم شێوەیە دەردەکەوێ..

| | | |
| --- | --- | --- |
| ev - a | Dative | بۆ ماڵەوە |
| ev - da | locative | لە ماڵدا |
| ev - dan | ablative | لە ماڵەوە (هاتووم) |

(dan - da - a) سێ پاشبەندن بەرامبەر (الی - فی- من)ی عەرەبی و (from - in - to)ی ئینگلیزی.

زمانی کوردی لەم لایەنەدا نەختێ ئاڵۆز و تێکەڵە لە هەردوو جۆری تێدا دەردەکەوێ. پاشبەندەکانی بەفرمانەوە دەلکێن نەک بەناوەوە. وەک لە:

دوێنێ چووم بۆ هەولێر.

دوێنێ چووم-ـە هەولێر

لەلایەکی تردا هەندێ پێشبەند بەپاشبەندەوە ئەرکەکەی دەستنیشان دەکرێ. بۆ نموونە پێشبەندی (لە) ئەرکی Locative دەبینێ گەر پاشبەندی (دا) لەدوای ناوەوە دەرکەوێ (لە ئاسماندا). ئەرکی abla-tive دەبینێ لەگەڵ پاشبەندی (ەوە)دا... (لە ئاسمانەوە).

ئەم تێکەڵییە ئەوە دەردەخا کە زمانی کوردی لە قۆناغێکی تیژی گۆڕیندایە. دەستنیشانکردنی بەرەوەی ئەم گۆڕینە پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی مێژوویییە. من وای بۆ چووم کە لە زمانێکی پێشبەندییەوە بەرەو پاشبەندی دەڕوا.

دەشێ ئەو زمانە تێکەڵانە بەجۆری سێیەم لە قەڵەم بدرێن.

سەرچاوەکان:

1- Bazell, C. E. (1958) "Linguistics Typology" - London.

2- Elson, B. and V. Pickett (1962) An Introduction to morphology and syntax. santa Ana.

3- Lyons, J. (1968) Introdaction to theoretical Linguistics. London and New york Cambridge University Press.

4- Matthews, P. H. (1970) "Recent developments in morphology" in New Horizon in Linguirtics (ed.) J. Lyons.

5- Matthews, P. H. (1974) "Morphology" - Cambridge university Press.

6- Robins, R. H. (1971) General Linguistcs. Longman.

٧- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٣) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو، گۆڤاری کاروان. ژمارە (٨).

٨- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) مردنی وشە، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٤٥).

٩- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) پێشبەندەکان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، ژمارە (١٥).

١٠- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٧) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو، هەندێ شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجی، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٥).

١١- کۆڕی زانیاری کورد (١٩٧٦) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی.

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٢) ساڵی ١٩٨٩، لاپەڕە ١٦٦-١٦٩ بڵاوکراوەتەوە.**

# شەپۆلەکانی شیعری کوردی

تا ئێستا گەلێ باس و لێکۆڵینەوەی باش و ڕەسەن لە بارەی کێش لە شیعری کوردیدا بلاوبۆتەوە. هەریەکە لە سووچێکەوە هەوڵ ئەدات ئەم لایەنەی شیعری کوردی ڕوون بکاتەوە و گیروگرفتەکانی دەستنیشان بکات. ئەم باسە هەوڵدانە بۆ پێناسین و دەرخستنی سروشتی کێش وەک دیاردەیێکی گشتی و ڕوونکردنەوەی تایبەتییەتەکانی لە شیعری کوردیدا بەڕێبازێکی سووک و ئاسان دوور لە ئاڵۆزی و، پێشنیارێکە بۆ بەکارهێنانی هەندێ زاراوە کە تا ئێستا کێشەیان لەسەرە.

لە مێژووی شیعری کوردیدا سێ جۆر کێشی جیاواز دەستنیشان دەکرێ:

١- کێشی عەرووزی.

٢- کێشی خۆماڵی.

٣- کێشی شیعری ئازاد.

هەریەکە لەمانە بەپێی بارودۆخی مێژوویی تایبەتیی خۆی سەری هەڵداوە و جیاوازی لە نێوانیاندا ئاشکرایە. سەرەڕای ئەو جیاوازییەی لە نێوانیاندا بەدی دەکرێ و سەرەڕای جیاوازیی نێوان ئەمانە و کێشی شیعری ئەدەبی میللەت و زمانانی تر... شیکردنەوە دەری دەخا کە هەموو شیعری جیهان یەک بناغەی گشتی لە سروشتی پێکهاتن و داڕشتنی کێشی شیعریدا هەیە.

ئەم باسە هەوڵدانێکە بۆ دەستنیشانکردنی ئەم بناغە گشتییە و خستنەڕووی تایبەتییەتەکانی کێشی شیعری خۆماڵی کوردی.

کەرەسە و دانەی unite سەرەکیی کێش لە شیعری ئەدەبی هەموو میللەتانی جیهان برگەیە syllable. بەپێی چەند یاسایێکی فۆنۆلۆجی ئەم برگانە یەک دەگرن و دانەی گەورەتر پێک دەهێنن، بە(گرێ)یان ناودەبەین. گرێیەکانیش یەک دەگرن دانەی گەورەتر پێک دەهێنن. بە(باڵ)ی ناودەبەین. بەدووباڵ دێڕ پێک دێت.

واتا پێوەندیی نێوان (برگە) و (دێڕ) لەسەر بناغەیێکی هەرەمی دامەزراوە وەک لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

واتا (دێڕ) لە دوو (باڵ) پێک دێت. هەر باڵەی لە چەند (گرێ) یێک و هەر گرێیەی لە چەند (بڕگە)یێک پێک دێت.

**مەرجە گشتییەکان:**

١- ژمارەی گرێیەکانی باڵی چەپ دەبێ بەقەد هی باڵی ڕاست بێ. واتا گەر لە باڵی ڕاستدا سێ گرێ هەبوو دەبێ لە باڵی چەپیشدا سێ گرێ هەبێ. چوار بوو ئەبێ ئەمیش چواربێ...

٢- ژمارەی بڕگەکانی هەر گرێیەکی باڵی چەپ دەبێ بەقەد ژمارەی بڕگەکانی گرێی بەرامبەری باڵی ڕاست بێ. واتا گەر گرێی یەکەمی باڵی ڕاست سێ بڕگەیی بوو دەبێ گرێی یەکەمی باڵی چەپیش سێ بڕگەیی بێ. گرێی دووەمی باڵی ڕاست چوار بڕگەیی بوو دەبێ گرێی دووەمی باڵی چەپیش چوار بڕگەیی بێ... و بەم جۆرە.

٣- سروشتی بڕگەی هەر گرێیەکی باڵی چەپ ئەبێ وەک هی بڕگەی بەرامبەری گرێی بەرامبەری باڵی ڕاست بێ. واتا ئەگەر بڕگەی یەکەمی گرێی یەکەمی باڵی ڕاست کورت بوو، ئەبێ بڕگەی یەکەمی گرێی یەکەمی باڵی چەپیش کورت بێ. بڕگەی سێیەمی گرێی چوارەمی باڵی ڕاست درێژ بوو... ئەبێ بڕگەی سێیەمی گرێی چوارەمی باڵی چەپیش درێژ بێ و بەم جۆرە.

٤- شوێنی هێزی stress سەرەکی و لاوەکیی secondary هەر گرێیەکی باڵی چەپ ئەبێ وەک هی گرێی بەرامبەری باڵی ڕاست بێ.

لەناو ئەم یاسا موجەڕەدە گشتییە سەختە هەر زمانەی تایبەتییەتیی خۆی هەیە و لە

لایەنێکدا و بەرادەیێکی سنووردار نەرمی پیشان دەدا. بۆ نموونە لە کێشی شیعری کوردیی خۆماڵیدا کورتی و درێژی برگە ڕەچاو ناکرێت کەچی لە عەرووزی عەرەبیدا ئەم لایەنە ڕەچاو دەکرێ، بەڵام بەرادەیێکی زۆر لە ڕێی (زحاف و علل)ەوە ڕێ دراوە نەرمی پێشان بدرێ.

لەوەی ڕابورد دەردەکەوێ کە بۆ تێگەیشتنی کێش دەبێ بزانرێ:

١- برگە چییە و جۆرەکانی چین.

٢- چۆن ئەم برگانە لێک دەدرێن و گرێیەکان پێک دەهێنن.

٣- چۆن ئەم گرێیانەی باڵ پێک دەهێنن.

## برگە:

تا ئێستا زانستی زمان نەیتوانیوە پێناسینێکی بێ کەلەبەری برگە پێشکەش بکات. بەشێوەیێکی گشتی دوو جۆری لێ جیادەکاتەوە:

١- برگەی فۆنەتیکی: ئەم جۆرەیان گشتییە. ئەو قاڵبەیە کە هەموو زمانانی جیهانی تیا بەشدارن، پێوەندیی بەفسیۆلۆجییەتی هەناسە وەرگرتن و میکانیزمیەتی کارکردنی ئەندامانی ئاخاوتنەوە هەیە. لەناو چوارچێوەی ئەم قاڵبە گشتییەدا زمانەکان جیاوازی لە چۆنیەتی لێکدانی فۆنیمەکانیان پێشان دەدەن. واتا هەر زمانەی یاسای تایبەتی بەخۆوەی هەیە بۆ لێکدانی فۆنیمەکانی لەناو قاڵبی برگەی گشتی (فۆنەتیکی). ئەم لێکدان و داڕشتنە تایبەتیە برگەی فۆنۆلۆجی پێک دەهێنێ (کە جۆری دووەمە).

بچووکترین برگە لە بزوێنێک vowel پێک دێت. ئەم بزوێنە ناوکی uncleus برگە پێک دەهێنێ. لەگەڵیا دەشێ چەند دەنگێکی کپ consonant دەرکەوێ. ژمارە و چۆنەتی ڕیزبوون و هاودەرکەوتنیان cooccurrence لەهەر زمانەی جۆرێکە. بۆ نموونە لە برگەی زمانی کوردیدا لە یەک تا چوار کپ دەردەکەوێ و هەرگیز لە دوو زیاتر ناکەوێتە لایەکی بزوێنەکە. یاسای داڕشتنی برگەی زمانی کوردی لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

(C) (C) {V} (C) (C)

V ............ Vowel - بزوێن

C ............ Consonant - کپ

{ } ـــــ ئەوەی نێوانیان دەبێ دەرکەوێ obligatory بەخورتییە.

( ) ـــــ ئەوەی نێوانیان دەشێ دەرکەوێ optional بەئارەزووە.

واتا - بزوێن ناوکی بڕگەیە و بڕگە بێ بزوێن نابێ و بچووکترین بڕگە لە بزوێنێک پێک دێت. لەگەڵیا یەک تا چوار کپ دەشێ دەرکەوێ. بەم جۆرە نۆ ئیحتمال بۆ دارشتنی بڕگەی کوردی هەیە.

| | | |
|---|---|---|
| Xwârd | CCVCC | خوارد |
| ˇZwân | CCVC | ژوان |
| Brâ | CCV | برا |
| to | CV | تۆ |
| şaw | CVC | شەو |
| a-xom | V | ئە - خۆم |
| âş | VC | ئاش |
| ark | VCC | ئەرک |
| dast | CVCC | دەست |

لە هەندێ زماندا دەشێ سنوور لەنێوان بڕگەی کورت و درێژدا دابنرێ و بڕگەی کورت لە درێژ جیابکرێتەوە وەک لە زمانی عەرەبیدا. چونکە بزوێنەکانی دوو جۆرن (کورت) و (درێژ) و ژمارەی بزوێنە کورتەکان (الفتحة - الضمة - الکسرة) بەقەد بزوێنە درێژەکانە (الألف - الواو - الیاء) و لە دوو کپ زیاتر لە بڕگەدا دەرناکەوێ و لە دوو ئیحتیمال زیاتری نییە بۆ دارشتنی بڕگە.
هەر کپێک بزوێنێکی کورتی لەگەڵا دەرکەوێ ئەوە بڕگەیێکی کورت پێک دەهێنێ. لَ - سُ - کِ... هتد. لە هەموو حاڵەتێکی تردا بڕگە درێژ دەردەچێ.

کە ئەم جۆرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- کپ + بزوێنێکی درێژ / وەک (لا - فی).

٢- کپ + بزوێنێکی درێژ + کپ / وەک (ناس - ریم).

٣- کپ + بزوینێکی کورت + کپ/ وەک (قُلّ - لنْ).

لە کێشی عەرووزیدا جیاکردنەوەی بڕگەی کورت و درێژ زۆر گرنگە و بناغەی دارشتنی یاساکانن. نیشانەی (ب) بۆ بڕگەی کورت و (-) بۆ بڕگەی درێژ بەکاردەهێنرێ. بۆ نموونە:

أ- قالَ/ قا + لَ/ درێژ + کورت ( - ب)

ب- سَمَكَةُ/ سَ + مَ + كَ + تُن/ کورت + کورت + کورت + درێژ (ب ب ب -)

ج- السماوات (اس + سَ + ما + وات/ درێژ + کورت + درێژ + درێژ (- ب - -)

له زمانی کوردیدا بڕگەی کورت له درێژ بەیاسا جیا ناکرێتەوه و ناشێ سنوور له نێوانیاندا بکێشرێ چونکه:

١- کوردی هەشت بزوێنی هەیه (â- a - û - u - o - e - i - î) له ڕووی کورتی و درێژییەوه ناکرێته دوو بەش.

٢- له یەک تا چوار کپ لەگەڵ بزوێنێکا له بڕگەدا دەردەکەون.

له شیعری کلاسیکی کوردی بڕگەی کورت و درێژ لێک جیا دەکرێتەوه، چونکه پێڕەوی عەرەووزیی عەرەبی کردووه له کێشدا. بەڵام زۆر جار دەبێ بزوێنی کورت بەدرێژ و درێژ بەکورت بخوێنرێتەوه تا لەگەڵ قاڵبەکانی عەرووزی عەرەبی بگونجێ و ڕێککەوێ. بۆ نموونه لەم دێڕەدا.

بەسەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم

شەریتی عەمری ڕابردووم وەکو خەو دێته بەر چاوم

ئەبێ (ی) له (سەرسامی)دا بەدرێژ و له (گەنجی)دا بەکورت بخوێنرێتەوه.

## گرێ:

لەبەر ئەوەی شیعری کلاسیکی کوردی له کێش و قافیەدا پێڕەوی عەرووزی عەرەبی کردووه، بەکورتی و بەدرشتی تیشکێ دەخەینه سەر سروشتی پێکهاتنی کێشی عەرەبی و لەڕێیەوه چەمکی گرێ ڕوون دەکەینەوه.

بەپێی عەرووزی عەرەبی (دێڕ - بیت) له دوو (باڵ - مصراع) پێک دێت. باڵی ڕاست (صدر) و باڵی چەپ (عجز). هەر باڵەی له چەند گرێیەک (تفعیلة) پێک دێت. دوا (تفعیله)ی باڵی ڕاست (صدر) بە(عروض) و دوا (تفعیله)ی باڵی چەپ (عجز) بە(ضرب) ناو دەبرێن. بەشەکانی تری دێڕ (حشو)ن.

کێشی عەرووزی عەرەبی (سێ) گرێی هەیە:

١- گرێی سێیی: لە سێ برگە پێک دێت.

٢- گرێی چواری: لە چوار برگە پێک دێت.

٣- گرێی پێنجی: لە پێنج برگە پێک دێت.

| گرێ | ژمارە | پێکهاتنی برگەیی | نیشانەی برگەکان | تفعیلة |
|---|---|---|---|---|
| سێ برگەیی | ١ | کورت - درێژ - درێژ | ب - - | فعولن |
| | ٢ | درێژ - کورت - درێژ | - ب - | فاعلن |
| چوار برگەیی | ٣ | کورت - درێژ - درێژ - درێژ | ب - - - | مفاعیلن |
| | ٤ | درێژ - کورت - درێژ - درێژ | - ب - - | فاعلاتن |
| | ٥ | درێژ - درێژ - کورت - درێژ | - - ب - | مستفعلن |
| | ٦ | درێژ - درێژ - درێژ - کورت | - - - ب | مفعولات |
| پێنج برگەیی | ٧ | کورت - درێژ - کورت - کورت - درێژ | ب - ب ب - | مفاعلتن |
| | ٨ | کورت - کورت - درێژ - کورت - درێژ | ب ب - ب - | متفاعلن |

لەبەر ڕەچاوکردنی کورتی و درێژیی بڕگە لە کێشی عەرووزیدا. هەر یەکێ لەو گرتیانەی سەرەوە چەند جۆرێکی هەیە.

هەشت تفعیلەکان دەبنە سبب و وتد و فاصلە بەم جۆرەی خوارەوە:

| | | |
|---|---|---|
| فعولن | ب - - | ب -/ - وتد مجموع + سبب خفیف |
| مفاعیلن | ب - - - | ب -/ -/ - وتد مجموع + سبب خفیف + سبب خفیف |
| مفاعلتن | ب - ب ب - | ب -/ ب ب- وتد مجموع + فاصلە صغری |
| | | ب -/ب ب/ - وتدمجموع + سبب ثقیل + سبب خفیف |
| فاعلاتن | - ب - - | -/ ب -/ - سبب خفیف - وتد مجموع + سبب خفیف |
| | | - ب/ -/ - وتد مفروق + سبب خفیف + سبب خفیف |
| فاعلن | - ب - | -/ ب - سبب خفیف - وتدمجموع |
| | | - ب/ - وتد مفروق + سبب خفیف |
| مستفعلن | - - ب - | -/ - ب/ - سبب خفیف + وتدمفروق + سبب خفیف |
| | | - /- / ب - سبب خفیف + سبب خفیف + وتد مجموع |
| متفاعلن | ب ب - ب - | ب ب - / ب - فاصلە صغری - وتد مجموع |
| | | ب ب / -/ ب - سبب ثقیل + سبب خفیف + وتد مجموع |
| | | ب ب / - ب / - سبب ثقیل + وتد مفروق + سبب خفیف |
| مفعولات | - - - ب | -/ -/ - ب سبب خفیف + سبب خفیف + وتد مفروق |

(تفعیلە)کان بە(١٦) شانزە جۆر (تشکیلە) پێکەوە دەردەکەون (بحر)ەکان پێک دەهێنن کە ئەمانەن:

| ژمارە | پێکهاتنی برگەیی | ناوی بحر | ژمارەی برگەی باڵ |
|---|---|---|---|
| ١ | فعولن - مفاعیلن - فعولن - مفاعیلن | طویل | ١٤ |
| ٢ | مستفعلن- فاعلن - مستفعلن - فاعلن | بسیط | ١٤ |
| ٣ | فاعلاتن - فاعلن - فاعلاتن | مدید | ١١ |
| ٤ | مفاعلتن - مفاعلتن - فعولن | وافر | ١٣ |
| ٥ | متفاعلن - متفاعلن - متفاعلن | کامل | ١٥ |
| ٦ | فاعلاتن - فاعلاتن - فاعلن | رمل | ١١ |
| ٧ | مستفعلن - مستفعلن - مستفعلن | رجز | ١٢ |
| ٨ | مفاعیلن - مفاعیلن | هزج | ٨ |
| ٩ | مستفعلن - مستفعلن - فاعلن | سریع | ١١ |
| ١٠ | مستفعلن - مفعولات - متفعلن | منسرح | ١٢ |
| ١١ | فاعلاتن - مستفعلن - فاعلاتن | خفیف | ١٢ |
| ١٢ | مستفعلن - فاعلاتن | مجتث | ٨ |
| ١٣ | مفعولات - مستفعلن | مقتضب | ٨ |
| ١٤ | مفاعیلن - فاعلاتن | مضارع | ٨ |
| ١٥ | فعولن - فعولن - فعولن - فعولن | متقارب | ١٢ |
| ١٦ | فعلن - فعلن - فعلن - فعلن | متدارك | ٨ |

ئەم قالبانە بەم شێوەیەی پێشکەش کران زۆر سەخت و وشکن هەرگیز ناشێ بەتەواوی پێڕەوییان بکرێ، بۆیە بەڕادەیەکی فراوان ڕێ دراوە لێیان لابدرێ. ئەم لادانانە بە(زحاف) و (علە) ناو دەبرێن بەهۆیانەوە دەشێ هەندێ برگــە کــورت بکرێتــەوە، درێژ بکرێ، بقرتێنرێ، زیاد بکرێ.. هتد.

دامەزرێنەری زانستی عەرووز خلیل بن احمد الفراهیدی[1] (٩٤-١٧٥ک) ٢٣ زحافی دەستنیشان کردووە. دوای خۆی زۆری تری خراوەتە سەر جگە لە (علل)ەکان کە ژمارەیان لەوان کەمتر نابێ. بەشێکی ئەم (زحاف و علل)انە لەم نەخشەیەدا ڕوون کراوەتەوە. ئەم نەخشە دەتوانرێ فراوانتر بکرێ و هەموو (زحاف و علل)ێکی بخرێتە ناو.[2]

| الزحاف المفرد | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | اضمار | خبن | طي | وقص | عصب | قبض | عقل | كف |
| فَعولُنْ<br>ب-- | | | | | | فَعولُ<br>ب-ب | | |
| مفاعيلُنْ<br>ب--- | | | | | | مفاعِلُنْ<br>ب-ب- | | مفاعيلُ<br>ب--ب |
| مفاعلتن<br>ب-ب ب- | | | | | مُفاعلْتُنْ<br>ب--- | | مَفاعلُنْ<br>ب-ب- | |
| فاعلاتُنْ<br>-ب-- | | فَعِلاتُنْ<br>ب ب-- | | | | | | فاعلاتُ<br>-ب- |
| فاعِلُنْ<br>-ب- | | فَعِلُنْ<br>ب ب- | | | | | | |
| مُسْتَفعِلُنْ<br>--ب- | | مُتَفْعِلُنْ<br>ب-ب- | مستعِلُنْ<br>-ب ب- | | | | | مستَفْعِل<br>--- |
| مُتَفاعِلُنْ<br>ب ب-ب- | مُتْفاعِلُنْ<br>--ب- | | مُتَفعِلُنْ<br>ب-ب- | مفاعِلُنْ<br>ب-ب- | | | | |
| مَفْعولاتُ<br>---ب | | فعولاتُ<br>ب--ب | مَفْعُلاتُ<br>-ب- | | | | | |

| | الزحاف المركب | | | | علل الزيادة | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | خبل<br>خبن+طن | خزل<br>اضمار+طن | شكل<br>خبن+كف | نقص<br>عصب+كف | ترفيل | تذليل | تسبيغ |
| فَعولُنْ<br>ب-- | | | | | | | |
| مفاعيلُنْ<br>ب--- | | | | | | | |
| مفاعلتن<br>ب-ب ب- | | | | مُفاعلْتُ<br>ب--ب | | | |
| فاعلاتُنْ<br>-ب-- | | | فَعِلاتُ<br>ب ب-ب | | | | فاعلاتانْ<br>-ب--٥١ |
| فاعِلُنْ<br>-ب- | | | | | فاعِلاتُن<br>-ب-- | | |
| مُسْتَفعِلُنْ-<br>--ب- | مُتعِلُنْ<br>ب ب ب- | | مُتفعِلُ<br>ب-ب ب | | | مُسْتَفْعِلانْ<br>--ب-٥١ | |
| مُتَفاعِلُنْ<br>ب ب-ب- | | مُتْفعِلُنْ<br>- ب ب- | | | مُتفاعِلاتُنْ<br>ب ب-ب-- | متفاعلان<br>ب ب-ب-/٥ | |
| مَفْعولاتُ<br>---ب | | | | | | | |

| | علل النقص | | | | | | | | | علة جارية مجرى الزحاف |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | حذف | القطف | قطع | قصر | بتر | الحذذ | الصلم | الوقف | الكتف | التشعيث |
| فعولنْ<br>ب-- | فعُو<br>ب- | | | فعولْ<br>ب- | | | | | | |
| مفاعيلنْ<br>ب--- | مفاعي<br>ب-- | | | مفاعيلْ<br>ب--٥١ | | | | | | |
| مفاعلتن<br>ب-ب ب- | | مَفاعلُ<br>ب-- | | | | | | | | |
| فاعلاتنْ<br>-ب-- | فاعلا<br>-ب- | | | فاعلاتْ<br>-ب-٥١ | فاعلْ<br>-- | | | | | فالاتنْ<br>--- |
| فاعلنْ<br>-ب- | | | فاعل<br>-- | | | | | | | فا...لن<br>-.- |
| مُستفعلنْ<br>--ب- | | | | | | | | | | |
| مُتفاعلنْ<br>ب ب-ب- | | | مُتفاعلْ<br>ب ب-- | | | متفا<br>ب ب- | | | | |
| مَفْعولاتُ<br>---ب | | | | | | | مَفْعو<br>-- | مَفْعولاتْ<br>--- | مفعولا<br>--- | |

بۆ کێشانی هەر دێڕێک بەهۆی عەرووزی عەرەبی دەبێ:

١- دێڕەکە بخرێتە سەر ئیملای عەرووزی بەلابردنی (شدَّە) و (تنوین) و (الف مقصورة)... هتد. واتا چۆن دەخوێنرێتەوە ئاوا بنووسرێتەوە.

٢- برگەکانی هەموو لێک جیابکرێتەوە.

٣- بەرامبەر هەر برگەیێکی کورت نیشانەی (ب) دابنرێ و بەرامبەر هەر برگەیێکی درێژ نیشانەی (-).

٤- ئەنجامەکە دابەش دەکرێ بەپێی ژمارەی برگەکان. ئەگەر لەهەر باڵەی (٨) برگە هەبوو ئەوە دەکرێتە (٤ + ٤) وەک لەم دێڕەدا:

صفحنا عن بنی ذُهْلٍ     وقلنا القوم اخوان

ب--- مفاعیلن/ ب--- مفاعیلن     ب--- مفاعیلن / ب--- مفاعیلن

سەیری لیستەی بەحرەکان بکەین دەردەکەوێ کە کێشی ئەم دێڕە سەر بە(بەحر)ی (هزج)ە. (مفاعیلن - مفاعیلن).

ئەگەر هەر باڵەی (١٤) برگە بوو. ئەوە دەکرێتە (٧ + ٧). گرێی حەوتی نییە. هەر حەوتەی ددکرێتە دوو بەش (٤ + ٣) یا (٣ + ٤) بەپێی سەرەتای دێردکە ئەگەر بەبرگەیێکی کورتی ڕەسەن (واتا زحاف بەکار نەهێنرابێ) دەستی پێ کردبێ ئەوە دەکرێتە (٣ + ٤). ئەگەر بەبرگەیێکی درێژی ڕەسەن دەستی پێ کردبێ ئەوە دەکرێتە (٤ + ٣) وەک لەم نموونانەدا:

اطالت بلایانا سلیمی فدیتها

ب--/ب---/ب--/ب-ب-

فغدنا بمغناها وطالت معاذیری

ب--/ب---/ب--/ب---

ئەم دێرە هەر باڵەی بریتییە لە (١٤) برگە. کرایە (٧ + ٧)، هەر بەشەی کرایە (٣ + ٤) چونکە دێرەکە بەبرگەیێکی کورت دەستی پێ کردووە. سەیری لیستەی بەحرەکان بکەین دەردەکەوێ کە کێشی ئەم دێرە سەر بە(بحر)ی (طویل).

ابسط لنا یا فتی اعذارکم فاذا

--ب-/-ب-/--ب-/ب ب-

لاقت لنا لم ندع في قومكم عوجا

--ب-/ -ب-/ --ب-/ ب ب-

مستفعلن - فاعلن - مستفعلن - فعلن

هەر باڵەی بڕیتییە لە (١٤) بڕگە. دەکرێتە (٤ + ٣)، چونکە بەبڕگەی درێژ دەست پێ دەکا. لە ڕێی لیستەی (بحر)ەکانەوە دەردەکەوێ کە کێشی ئەم دێرە سەر بە(بحر)ی (بسیط)ە.

ئەگەر بڕگە کورت و درێژەکان بەتەواوی بەرامبەر دەرچوو لەگەڵ ئەوەی لە (بحر)ەکاندایە، ئەوە ئەم دێرە زۆر سوارە و هیچ (زحاف و علل)ێکی تێ نەکەوتووە. ئەگەر جیاواز بوو سەیری ئەخشەی (زحاف و علل) دەکەین، بەرکەوت ئەوە سوارە: ئەگینا لەنگە. بۆ نموونە لە دێری (اطالت بلايانا سليمى فديتها...) تفعيلەی چوارەمی باڵی ڕاست لەجیاتی (مفاعيلن) بۆتە (مفاعِلن). سەیری لیستەی زحافەکان بکەین دەبینین ئەو لادانە ڕەوایە - و بەر زەحافی (قبض) دەکەوێ کە بەهۆیەوە (مفاعيلن / ب---) دەبێتە (مفاعِلُنْ/ ب-ب-).

ئێستا سەیری ئەم دێرە بکە:

| | |
|---|---|
| كيف ذاك الحب امسى خبراً | وحديثاً من احاديث الهوى |
| -ب--/ -ب--/ب ب- | ب ب--/ -ب--/ -ب- |
| فاعلاتن فاعلاتن فعلن | فعِلاتن فاعلاتن فاعلن |

کێشی ئەم دێرە سەر بە(بحر)ی (رمل)ە. تفعيلەی سێیەمی باڵی ڕاست بۆتە (فعلن). تفعیلەی یەکەمی باڵی چەپ بۆتە (فعلاتن). لە ڕێی ئەخشەی (زحاف و علل)ەوە دەردەکەوێ کە ئەم دوو گۆڕانە ڕەوان بەهۆی زحافی (خبن)ەوە.

كـملت لكم خطرات ذي وصـفت

ب ب-ب-/ ب ب-ب-/ ب ب -

وافـادني خطران ذا وصـفـا

ب ب-ب-/ ب ب -ب-/ ب ب-

کێشی ئەم دێرە سەر بە(بحر)ی (متكامل)ە. تفعیلەی سێیەمی باڵی ڕاست و چەپ بوونەتە (متفا / ب ب-) بوونی (متفا) بە(متفاعلن) ئەنجامی تێکەوتنی (علە)ی (حذذ) وەک لە ئەخشەی (زحاف وعلل)دا دەردەکەوێ.

ئەم هەمـوو (زحـاف وعلل)انە کـێـشی عـەرووزییـان وەک لاسـتـیـک لێ کـردووە هەر دێڕێکی عەرەبیی پێ دەکێشرێ. ئەمە بەڵگەیە، ئەوە دەسەلمێنێ کە کێشی (عەرووزی) ئەوەندە لە کێشی (بڕگە)یی جیاواز نییە.[3]

## کێشەکانی شیعری کوردی

### ١- کێشی عەرووزی:

کوردیش وەک میللەتەکانی تری ئیسلامی کەوتە ژێر کاریگەریی زمان و ڕۆشنبیری عـەرەب و مـیللەتەکـانی دەوروبەری کـە ئەمـانیش هەر ئیسـلامـن. خـوێندەوار و شـاعـیـر بەزۆری مـەلا بوون، مـەلاش خـوێندنی بەعـەرەبی بوو و سـەرچاوەی ڕۆشنبیریی زمان و ئەدەبی عەرەبی و میللەتە دراوسێیەکانی بوو. بۆیە شتێکی سروشتییە لە شیعر دانانا پێڕەوی قـاڵبەکـانی عـەرەبی بکەن. بەڵام شـان بەشـان ئەم پێڕەوکردنە لەسەر پێڕەوی خۆماڵیش شیعر هەر دانراوە و نەپچڕاوە، لە فۆلکلۆر و گۆرانی و ئەدەبی هەورامانذا.

شـاعـیـرانی کـلاسیکی کـورد بەزۆری لەسەر (بحر)ی رمل و هزج و مـضـارع و سریع شیعریان هۆنیوەتەوە. دیارە ئەم بحرانە زیاتر لەوانی تر لەگەڵ سروشتی زمانی کوردی ئەگونجێ.[4] لە هەر یەکەیانا نموونەیێک ئەهێنینەوە:

أ- بحری رمل:

با بەکـوڵ بگریم لەگـەڵ تۆ هەوری سـووری بەهمـەنی
من بەوەی گـوڵ کـەوتە ژێر گڵ، تۆ بەوەی گـوڵ پێکەنی

-ب-- -ب-- -ب-- -ب-
-ب-- -ب-- -ب-- -ب-
فاع لاتن فاع لاتن فاع لاتن فاع لن

ب- بحری هزج

لە دونیـادا نییـە وەک من بەعـەشقی ئەو گرفـتـارێ
سەر و مـاڵم لە ڕێی دانا کـەچی لوتفی نەبوو جـارێ

فعلاتن

ب--- ب ب -- ب--- ب---
ب--- ب--- ب--- ب---
مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

گرێی دووەم بۆتە (فعلاتن) لێرە زحافی (خبن)ی تێکەوتووە.

ج- بحری سریع

قــوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خــۆش مــرروور
وەی پەیکی شــارەزا بەهەمــور شــاری شــارەزوور

--ب- --ب- --ب- ب-

قور-با-ن تۆ زی ڕێ گەتم ئەی-با-د خۆش مُروور

مستفعلن مستفعلن مستفعلن فعول

## ٢- کێشی خۆماڵی

کێشی خۆماڵی کوردی (وەک عەرەبی) سێ گرێی هەیە

١- گرێی سێیی: لە سێ برگە پێک دێت

٢- گرێی چواری: لە چوار برگە پێک دێت

٣- گرێی پێنجی: لە پێنج گرێ پێک دێت

کورتی و درێژی برگە ڕەچاو ناکرێت، بۆیە هەر ئەم سێ گرێیە پارسەنگی کێشی شیعری کوردیی خۆماڵی پێک دەهێنن.

ئەم گرێیانە یەک دەگرن (باڵ) پێک دەهێنن هەر جۆرە دەرکەوتنێک (شەپۆل)ێک پێک دەهێنێ کە ئەمانەن.

١- شەپۆلی [ ٥ ]

ئەی بەرخۆڵەکە
نەرم و نۆڵەکە
سپی و خرپنی
وەک کولووی لۆکە

------

(٥)

٢- شەپۆلی [ ٣ + ٣ ]

کە سنگی کردەوە
گەلی لە پشتەوە

گردوی      بردەوە

---      ---

(٣)      (٣)

٣- شەپۆلی [ ٤ + ٣]

ئەی فریشتەی      شیعری جوان

کۆستی کەوتووی   هەردووکمان

-----      گۆران

(٤)      (٣)

٤- شەپۆلی [ ٤ + ٤]

دونیا هەمووی      چاو و ڕاوە

فڕوفێڵ و      بەند و داوە

ڕاستە ڕاستی      هەڵگێراوە

درۆ خۆشە      بەلێشاوە

----      ----

(٤)      (٤)

٥- شەپۆلی [٣ + ٣ + ٣]

بنووسە      بپرسە      مەترسە

چەند دێرێ      شیعری جوا      نت بەسە

---      ---      ---

(٣)      (٣)      (٣)

٦- شەپۆلی [ ٥ + ٥ ]

بەئاسمانەوە      ئەستێرەم دیوە

لە باغچەی بەهار      گوڵم چنیوە

-----      -----

(٥)      (٥)

٧- شەپۆلی [٤ + ٤ + ٣]

لە پرشنگیا   هەیە شێوەی   چاوی کاڵ

لە لەرزینیا   زەردەخەنەی   لێوی ئاڵ

----   ----   ---

(٤)   (٤)   (٣)

٨- شەپۆلی [٣ + ٣ + ٥]

کوردستان   جێگامی   جێی هەزار ساڵەم

پەروەردەی   ئەم دۆڵ و   سەرلوتکە و یاڵەم

---   ----   -----

(٣)   (٣)   (٥)

٩- شەپۆلی [٣ + ٣ + ٣ + ٣]

ئەی ئەندام   وردیلەی   ئەرمۆڵەی   ئێسک سووک

ئەی بەرگی   ساکارت   دڵگیرتر   لە هی بووک

---   ---   ---   ---

(٣)   (٣)   (٣)   (٣)

١٠- شەپۆلی [٤ + ٤ + ٤]

تاڵە تیشکی   شەوی ژینی   پڕ زارم بووی

خۆری ئاسۆی   گوڵزاری بێ   بەهارم بووی

----   ----   ----

(٤)   (٤)   (٤)

١١- شەپۆلی [٤ + ٤ + ٥]

سەردەمێک بوو   دونیای گیانم   تاریک و چۆڵ بوو

کام بەرۆچکەی   گەرمە دڵم   چەشنی سەهۆڵ بوو

(٤)   (٤)   (٥)

١٢- شەپۆلی (٥ + ٥ + ٥)

ئەم لا یەک پەڵە ئەولا یەک پەڵە هەوری ڕەنگاوڕەنگ
لە ناوەڕاستا بەدەم ئاسۆوە ڕۆژی شۆخ و شەنگ
----- ----- -----
(٥) (٥) (٥)

شەپۆلی [٥] و [٣+٣] زۆر کەم بەرچاو دەکەوێ و بەزۆری لەو شیعرانە بەرچاو ئەکەون کە سروودی منداڵانن. بەگوێرەی شەپۆلی [٣ + ٣ + ٣] هەر ئەم دێرەم بەرچاو کەوت کە وەک نموونە هێناومەتەوە. بەناوی (گۆران)ەوەیە و لە دیوانەکەیدا نییە.

هەموو شەپۆڵەکانی شیعری کوردی بەپێی ژمارەی بڕگەکان و دابەشبوونیان بەسەر گرتیەکان لەم نەخشەیەدا ڕوون کراوەتەوە:(٤)

| | ژمارەی بڕگەکان | دابەشبوونیان بەسەر گرتیەکان |
|---|---|---|
| ١ | ٥ | ٥ |
| ٢ | ٦ | ٣ + ٣ |
| ٣ | ٧ | ٤ + ٣ یا ٣ + ٤ |
| ٤ | ٨ | ٤ + ٤ |
| ٥ | ٩ | ٣ + ٣ + ٣ |
| ٦ | ١٠ | ٥ + ٥ |
| ٧ | ١١ | ٤ + ٤ + ٣ |
| ٨ | ١١ | ٣ + ٣ + ٥ |
| ٩ | ١٢ | ٣ + ٣ + ٣ + ٣ |
| ١٠ | ١٢ | ٤ + ٤ + ٤ |
| ١١ | ١٣(٥) | ٤ + ٤ + ٥ |
| ١٢ | ١٥ | ٥ + ٥ + ٥ |

سنووری گرێ و وشە لە باڵا:

لە هەندێ شەپۆلدا بەتایبەتی [ ٥ + ٥ ] سنووری گرێ هەرگیز وشە ناسمێ.

ئەمانە هەمــوو جـــــوانــن شیرینن
ڕۆشنکەرەوەی شــەقـــامی ژینن

لە شەپۆلەکانی تردا دەشێ سنووری گرێ وشە بسمێ وەک لە [ ٤ + ٤ ]

لە ئاسمانی ژێـ نا بـــەیـان
ئەســتـێـرەی گـە شم نەپروان

وا دەردەکەوێ ئەو شیعرانەی سنووری گرێ وشەکان ناسمێ سوارتر و ڕەوانترن. ئەمەی خوارەوە دێری دوای ئەوەی سەرەوەیە، تیایا سنووری گرێ وشەکانی ناسمێ بۆیە (وەک من بۆی بچم) ڕەوانتر و سوارتر دێتە گوێ.

ئەستێرەی سوور وەکوو پشـــکۆ
ئەمرشـتـە ناو گـەرووی ئاســۆ

ئەگەر باڵ لە دوو گرێ زیاتربێ... هەرگیــز ناشێ سنووری گرێ لە جارێ زیاتر وشە بسمێ[٦].

## ٣- کێشی شیعری ئازاد

کەرەسەی سەرەکی کێش لە شیعری (ئازاد)یشدا هەر بڕگە و گرێیە، جیاوازی نێوان ئەم جۆرە شیعرە نەوزادە و شیعری خۆماڵی و عەرووزی ئەوەیە لە شیعری (ئازاد)دا چەمکی باڵ و دێر نەمـاوە و تێک شکاوە. هیچ پەیڕەو و یاسـاییێکی نیسیـە بەهۆیەوە ژمـارەی گرێیەکانی هەر دێرە دەستنیشان بکرێ. دێر هەیە لە یەک گرێ... هەیە لە دوو هەیە لە سێ گرێ... هتد پێک دێت، لەوانەیە دێری یەکەم یەک گرێیی بێ دووەم ببێتە سێ یا دوو یا یەک ... دووەم ببێتە سێ یا یەک یا دوو... وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێ.

چیای ڕەنگین (١)...
داوێنی کەژ نێرگس و گوڵ (٢) ----/----
گرنگ لەناو کۆشی چەما ئارامی گرت (٣) ----/----
ئاسمانی شین (١)
ئەستێرەی زیوی ڕووی سری (٢)

شەبوویەکی خنجیلانە (٢)
لە سێبەرا (١)
پێکەنی سەری هەڵبڕی (٢)
بۆ تیشکی خۆری گەرم و گوڕ (٢)
دڵۆپی قەڵبەزەی وەک چۆڕ (٢)
چاوی هوزار (١)
شنەی شەماڵ.. سروەی نازدار (٢)
چەمی بزێو (١) کامەران ١٠٤

## پەراوێزەکان:

١- (خلیل بن احمد الفراهیدی) یاساکانی عەرووزی عەرەبیی دۆزییەوە. (١٥) (بحر)ی لێ دەستنیشان کرد. هەر لە سەردەمی خۆیدا (ابو الحسن سعید بن مسعدە الاخفش) بحرێکی تری خستە سەر بەناوی (متدارک) و بوون بە(١٦). جگە لەم شانزەیە سێ بحری تر لەلایەن غەیری عەرەبەوە داهێنراون (جدید - قریب - متشاکل) بۆ ئەمە سەیری سەرچاوە ژمارە٧، لاپەڕە ١٢٩ بکە.

٢- زاراوەکان هەروەک خۆیان بەکارهێنراون بۆ پێناسینیان سەیری سەرچاوە ژ (٣) بکەن.

٣- مامۆستا علاءالدین سجادی هەستی بەمە کردووە. لەلاپەڕە (١٣٢)ی کتێبەکەی (ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی)دا دەڵێ:

«کە کەوتە ئەو سەردەمی دواییە و بەتایبەتی کە بازاڕی فۆلکلۆر زیندوو کرایەوە و گۆرانییە نەتەوەییەکان کەوتنە برەو. لەسەر ڕووناکی ئەوانە جۆری هۆنراوە گۆڕا و ئەو قسەیە داهات کە گوایە هۆنراوە دوور کەوتۆتەوە لە عەرووز.

بەڵێ دوور کەوتۆتەوە؛ بەڵام ناتوانرێ بوترێ بەتەواوی لێی بێ بەشە وەکو ناشتوانرێ بوترێ ئەم هۆنراوانە کە لەسەر عەرووز دەڕۆن بێ بەشن لە ژمارەی پەنجە».

٤- مامۆستایان عەزیز گەردی و عەبدولڕەزاق بیمار کتێبیان لە بارەی ئەم لایەنەی شیعری کوردی داناوە و بەوردی و فراوانی زۆر شتیان ساغ کردۆتەوە. بەداخەوە. ئەم کتێبە بەنرخانە تا ئێستا چاپ نەکراون.

٥- کاکەی فەلاح لەلاپەڕە (٢٢١)ی (کاروانی شیعری نوێی کوردی)دا ئەم شیعرەی دیلان.

دیسانەوە نەورۆزە بەهارە گوڵی ئاڵە
شەونم بەقەتیسی لەسەر ئەو کە کاڵە
وەک چاوە چ چاوێ کە بەفرمێسک و کەژاڵە

بە(١٤) برگەیی لە قەڵەم داوە. ڕاستەکەی ئەوەیە هەر دێڕی یەکەم (١٤) برگەییە: ئەوانی تر (١٣)ین. زۆر گەڕام هیچ شیعرێکی (١٤) برگەییم نەدۆزییەوە.

٦- بەبەراوردکردنی شیعرەکانی کامەران موکری لەگەڵ هی شاعیرانی تری هاوچەرخی دەردەکەوێ کە لە شیعرەکانی کامەران زۆر باوە سنووری گرێ وشە بسمێ... لەوانەیە ئەمە یەکێ بێ لەو هۆیانەی وایان کردووە شیعرەکانی کامەران لە ڕووی ئیقاعەوە ئەختێ وشک بێتە گوێ.

**سەرچاوەکان:**


١- د. ئیحسان فوئاد (١٩٧١) گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ژ (١٥).

٢- ئەحمەد هەردی (١٩٧١) کێش لە شیعری کوردیدا. گۆڤاری برایەتی ژ (١٠).

٣- د. رشيد عبدالرحمن العبيدي (١٩٨٦) معجم مصطلحات العروض والقوافي. مطبعة جامعة بغداد.

٤- د. صفاء خلوصي (١٩٧٤) فن التقطيع الشعري والقافية، بيروت.

٥- عەبدولڕەزاق بیمار (١٩٨٧) عەرووز لە هەڵبەستی کوردیدا گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ژ (١١٣).

٦- د. عزالدين مصطفى رسول (١٩٦٦) الواقعية في الادب الكردي، بيروت.

٧- عەلائەدین سەجادی (١٩٦٧) ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی، بەغدا.

٨- کاکەی فەلاح (١٩٧٨) کاروانی شیعری نوێی کوردی - کۆڕی زانیاریی کورد، بەغدا.

٩- د. مارف خەزنەدار (١٩٦٢) کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، بەغدا.

١٠- دیوانی گۆران (١٩٨٠) کۆکردنەوە و ئامادەکردنی محەممەدی مەلا کەریم.

١١- دیوانی کامەران (١٩٨٧) ئامادەکردنی عەبدوڵڵا عەزیز خالد ئاگرین.



* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٦) ساڵی ١٩٩٠، لاپەڕە ٤٧-٥٨ بڵاوکراوەتەوە.

## لە پەیوەندییەکانی بکەر نادیار

بکەرنادیار لە زمانی کوردیدا بەزۆری هەر لە ڕوانگەی مۆرفۆلۆجییەوە سەیری کراوە و لێی کۆڵراوەتەوە. گەلێ لایەنی سینتاکسی و تەنانەت مۆرفۆلۆجیش هەن لە بارەی ئەم لایەنەی زمانی کوردییەوە هێشتا باس نەکراون. لەم باسەدا هەندێ لایەنی تری ئەم بوارەی ڕێزمانی کوردی دەخرێتە ڕوو.

چەمکی بکەر نادیار لە هەموو زمانێکدا هەمان شت دەگەیێنێ مەبەست لێی ئەو ڕستەیەیە کە (بکەر)ەکەی واتا ئەو کەسە یا ئەو شتەی ئیشی فرمانەکە بەجێ دەهێنێ لە سیمادا دەرناکەوێ، لەبەر هەر چ هۆیێک بێ.

بۆیە هەنگاوی یەکەم لە هەموو زمانێکدا لە گواستنەوەی ڕستەیێکی بکەر دیار بۆ بکەر نادیار دەبێ بکەر لابیرێ و بەرکار جێی بگرێ... ئینجا هەر زمانەی تایبەتییەتی خۆی هەیە چ بەگۆڕینی قالبی فرمانەکەی بەپێی یاسا مۆرفۆلۆجییەکانی چ بەو ئامراز و وشانەی دەردەکەون یا بەهەردوو پێرەو.

لە زمانی کوردیدا[1] شان بەشان ئەو گۆڕینانەی بەسەر پەیوەندیی نێوان بەشە بنجییەکانی ڕستە (بکەر - بەرکار - فرمان) دێن... قاڵبی فرمانەکەش دەگۆڕێ...

هەنگاوەکانی گواستنەوەی ڕستەییکی بکەر دیار بۆ بکەر نادیار لە کوردیدا ئەمانەن:

١- بکەری ڕستە و ڕاناوی ڕێککەوتن لادەبرێن.

٢- بەرکار جێی بکەر دەگرێ، بەڵام چەمکی بەرکاریی خۆی نادۆڕێنێ.

٣- ڕەگی داهاتووی فرمانی ڕستەکە وەردەگیرێ[2].

٤- ئامرازی بکەر نادیاری {ر} دەخرێتە سەر ڕەگی فرمانەکە.

٥- نیشانەی کاتی دەچێتە سەر (ا) بۆ ڕابردوو و (ێ) بۆ داهاتوو.

٦- ڕاناوێکی لکاو بەپێی کەس و ژمارەی بەرکار کە جێی بکەری گرتووە دەچێتە سەر فرمانەکە. وەک تێنەپەڕ خۆی دەنوێنێ[3]. بۆ نموونە ڕستەی:

ئێمە تۆمان بینی

ئێمە: بکەرە

تۆ: بەرکاری ڕاستەوخۆیە.

مان: ڕاناوی ڕێککەوتنە.

بینی: ڕەگی ڕابردووی (بینین)ە.

بەپێی هەنگاوی یەکەم و دووەم (ئێمە) و (مان) لادەبرێن. (تۆ) کە بەرکارە جێی بکەر دەگرێ.

تۆ بینی

لەو زمانانەی کە فرمان دەکەوێتە نێوان بکەر و بەرکار SVO[4] بەرکار دەچێتە دیودەی تری فرمان وەک زمانی ئینگلیزی.

لەو زمانانەی کە بکەر و بەرکار دەکەونە تەک یەک (VSO)، (SOV) کە بکەر لادەچێ بەبێ جێگۆڕکێ بەرکار جێی دەگرێ.

بەپێی هەنگاوی سێیەم ڕەگی داهاتووی فرمانەکە وەردەگیرێ (بین).

تۆ بین

بەپێی هەنگاوی چوارەم ئامرازی بکەری نادیار (ر) دەچێتە سەر ڕەگی فرمانەکە و دەبێتە

تۆ بین + ر

بەپێی هەنگاوی پێنجەم نیشانەی کاتی دەچێتە سەر. کاتی فرمانەکە (بینی) لە ڕابردوو دایە (ا)ی دەچێتە سەر.

تۆ بین + ر + ا

بەپێی هەنگاوی شەشەم فرمانەکە ڕاناوێکی لکاو بەپێی کەس و ژمارەی بەرکار کە جێی بکەری گرتووە وەردەگرێ. لێرە (تۆ)یە لە کەسی دووەمی تاکدایە، ڕاناوی لکاوی بەرامبەر (یت)ە. ڕستەکە لە ئەنجامدا دەبێتە:

تۆ بین + ر + ا + یت ⟵ تۆ بینرایت

یاسای گوێزانەوەی ڕستەیەکی بکەری دیار بۆ بکەری نادیارە لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

بەگوێرەی خاڵی سێیەم هەندێ ناوێزە بەرچاو دەکەوێ. فرمانی بکەر نادیار بەرەگی ڕابردوو دادەڕێژرێ نەک داهاتوو.

وەک:

| چاوگ | ڕەگی داهاتوو | ڕەگی ڕابردوو | فرمانی بکەری نادیار |
|---|---|---|---|
| ویستن | هوێ | ویست | ویسترا |
| وتن | لێ | وت | وترا |
| گوتن | لێ | گوت | گوترا |
| لێستن | لێس | لێست | لێسترا |

بەگوێرەی خاڵی چوارەم لە ئەنجامی ڕووبەڕووکردنی مۆرفۆلۆجی morphologial identification زۆر ئاشکرا دەردەکەوێ کە (ر) ئامراز بکەری نادیارییە نەک (ڕا - ڕێ) وەک لە بەبەراوردکردنی ئەم دوو فرمانەدا دەردەکەوێ:

دە - کوژ - ر - ێ - ن

دە - کوژ - ر - ا - ن

لەم فرمانانەدا (ێ) و (ا) کاتەکانیان دەستنیشان کرد. بەشەکانی تر هەر یەکە ئەرکی خۆی هەیە ئەگەر (دە) ئامرازی هەمیشەیی بێ و (کوژ) ڕەگی فرمان بێ و (ن) ڕاناوی ڕێککەوتن بێ... دەمێنێتەوە (ر) کە دەبێ ئامرازی بکەر نادیاری بێ[٥].

بەگوێرەی خاڵی پێنجەم (ا) و (ێ) لە زۆر شوێنی تر وەک نیشانەی کاتی ڕابردوو و داهاتوو لە زمانی کوردیدا خۆ دەردەخەن. وەک لە (هێن - پیو - کێش - کێل)دا کە ڕەگی داهاتووی (هێنان - پیوان - کێشان - کێلان)ن. ئەگەر (ا) ئەلفیان خرایە سەر دەبنە ڕەگی ڕابردوو (هێنا - پیوا - کێشا - کێلا).

لە فرمانە تێنەپەرە ئەلفییەکاندا ڕەگی ڕابردوو بە(ا) و داهاتوو بە(ێ) کۆتایی دێ.

| چاوگ | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| گریان | گریا | گرێ |
| سووتان | سووتا | سووتێ |
| برژان | برژا | برژێ |
| ترسان | ترسا | ترسێ |

ئەو فرمانانەی ڕەگی ڕابردوویان بە(اند) کۆتایی دێ. کردنیان بەداهاتوو (اند) دەبێتە (ێن) واتا لەگەڵ لابردنی (د) (ا) دەبێتە (ێ).

چریکاندن چریکاند چریکێن

نواندن نواند نوێن

**هەندێ تێبینی:**

أ- ئەو فرمانانەی کە ڕەگی داهاتوویان بە(ە) یا (ێ) کۆتایی دێ کە دەکرێنە بکەر نادیار (ە) و (ێ) دەتوێنەوە:

کردن کە کرا

بردن بە برا

(دا)نان (دا)نێ (دا)نرا

ب- ئەگەر ڕەگەکە بە(ۆ) کۆتایی هاتبێ (ۆ) دەبێتە (و)

خواردن    خۆ    خورا

شوشتن    شۆ    شورا

ج- (i)ی گرتن girtin دەبێتە (ی)

گرتن    گر    گیرا

د- ئەگەر ڕەگی فرمان بە(ر) کۆتایی هاتبێ بەشێوەیەکی گشتی (ر)ی بکەر نادیاریی تیا دەتوێتەوە:

گۆڕین    گۆڕ    گۆڕ - را - گۆڕا

دڕین    دڕ    دڕ - ڕا - دڕا

لێرە تێنەپەڕی ئەم فرمانانە (گۆڕان - دڕان) لەگەڵ ئەم تێنەپەڕە بەبکەر نادیارە کراوانە تێکەڵ دەبن و دەبنە یەک لە ڕووی مانا و داڕشتنەوە. ئەمە بەڵگەیێکە ئەوە دەسەلمێنێ کە بکەر نادیار فرمانێکی تێپەڕە کراوەتە تێنەپەڕ.

## گۆڕانی ڕاناو لە بکەر نادیاردا

ڕستەیێکی بکەر نادیار ئەگەر کاتی فرمانەکەی لە داهاتوودا بێ و بەرکارەکەی بەڕاناوێکی لکاو دەربڕابێ، ڕاناوە لکاوەکە سەر بەکۆمەڵی (م - ت - ی - مان - تان - یان) دەبێ وەک لە:

أ- دەمانبینێت    دە - مان - بین - ێت

ب- دەتاندۆزمەوە    دە - تان - دۆز - م - ەوە

لە (أ)دا (مان) و لە (ب)دا (تان) بەرکارن.

بەگواستنەوەی ڕستەی وا بۆ بکەر نادیار، ئەو ڕاناوە لکاوەی تیایا دەوری بەرکار دەبینێت و جێی بکەر دەگرێ، دەگۆڕێ بەڕاناوی بەرامبەری سەر بەکۆمەڵەکەی تر (م - یت - یت - ین - ن - ن) و جێی خۆی دەگۆڕێ و دەچێتە سەر ڕەگی فرمانەکە:

م ⟵ م

ت ⟵ یت (ی)

ی ⟵ یت[٦١] (ێ)

مان ⟵ ین

تان ⟵ ن

یان ⟵ ن

له ڕستەی (دەیانبینم)دا

دە ـ یان ـ بین ـ م

دە: ئامرازی بەردەوامییە

یان: بەرکارە. کەسی سێیەمی کۆیە

بین: ڕەگی داهاتووی (بینین)ە

م: بکەرە

کە ئەم ڕستەیە دەگوێزرێتە بکەر نادیار:

١- بکەر (م) لادەبرێ

٢- (ر)ی ئامرازی نادیاری و (ێ)ی نیشانەی کاتی داهاتوو دەچنە سەر ڕەگی فرمانەکە.

٣- بەرکار (یان) دەگۆڕێ بەڕاناوی بەرامبەری سەر بەکۆمەڵەکەی تر کە (ن)ە و دەچێتە سەر ڕەگی فرمان (وەک پاشگر).

ئەگەر A کۆمەڵی یەکەم و B کۆمەڵی دووەم بێ یاسای گۆڕینی ئەم جۆرە ڕستانە بۆ بکەر نادیار بەم جۆرە دەبێ.

**فرمانی تێنەپەڕ و چەمکی بکەر نادیاری**

ڕێزمانی ئێستامان ڕستەیێکی وەک (شووشەکە شکا) بەم جۆرە شی دەکاتەوە.

شووشەکە: بکەرە.

شکا: فرمانێکی تێنەپەڕە... کاتەکەی ڕابردووە.

ئەگەر بەوردی و قووڵی بیر لە واتا و پەیوەندیی نێوان بەشەکانی ئەم ڕستەیە بکرێتەوە دەردەکەوێ کە ئەوەی لەم ڕستەیەدا بە(بکەر) لە قەڵەم دراوە بەر چەمکی (بەرکاری) دەکەوێ، چونکە هیچ لە خۆیەوە ناشکێ. ئەبێ کەسێ یا هێزێ شکاندبێتی. ئەو کەسە یا ئەو شتە یا ئەو هێزە شاراوەیە کە بۆتە هۆی شکاندنی شووشەکە بکەری ڕاستەقینەی ڕووداوەکەیە ئەگەر دەرکەوت و زانرا کێیە یا چییە ئەوسا دەشێ بەیاسایێکی ڕێزمانی فرمانی ڕستەکە بکرێ بەتێپەڕ و بکەرەکەی بخرێتە ڕوو.

ئازاد شووشەکەی شکاند

واتا (شووشەکە شکا) لە بنەڕەتدا ڕستەیەکی بکەر نادیارە کرا بەڕستەیێکی بکەر دیار. (بکەرەکەی ئازادە) بەرامبەر بەمە ئەو ڕستەیەی کە ڕووداوەکەی بەفرمانی تێپەڕ دەردەبڕێ، ئەگەر نەزانرا بکەرەکەی کێیە یا چییە دەشێ ڕووداوەکە بەڕستەیێکی بێ بکەر دەربڕێ. وەک لە

ئازاد سێوەکەی خوارد

ئەگەر نەزانرا کێ سێوەکەی خوارد ئەوسا بەیاسایێکی ڕێزمانی ڕستەکە دەکرێتە بکەر نادیار.

سێوەکە خورا

لە یەکەما (بکەر) دەدۆزرێتەوە و ڕستەکە دەکرێ بەبکەر دیار.

لە دووەما (بکەر) ون دەبێ و ڕستەکە دەکرێ بەبکەر نادیار

واتا ئەم دوو لایەنە پێچەوانەی یەکترن ئەگەر لەیەکەما فرمان تێنەپەڕ بێ دەکرێتە تێپەڕ دەبێ لە دووەما فرمان تێپەڕ بێ و دەکرێ بەتێنەپەڕ.

بەڵگەی ڕێزمانی لە زمانی کوردیدا کە ئەمە دەسەلمێنی ڕاناوی لکاوە.

کە ڕستەی بکەر نادیار (فرمان تێنەپەڕ) دەکرێتە بکەر دیار (فرمان تێپەڕ) فرمانەکە لە ڕابردوودا ئەو دەستە ڕاناوە وەردەگرێ کە لەگەڵ تێپەڕی ڕسەندا دەردەکەوێ:

| | | |
|---|---|---|
| م | | م |
| یت | | ت |
| شکا Ø کردن بەتێپەڕ ← | شکاند | ی |
| ین | (خوارد) | مان |
| ن | | تان |
| ن | | یان |

کە ڕستەیێکی بکەر دیار (فرمان تێپەڕ) دەکرێتە ڕستەیێکی بکەر نادیار (فرمان تێنەپەڕ) دەکرێتە ڕستەیێکی بکەر نادیار (فرمان تێنەپەڕ) فرمانەکە ئەو کۆمەڵە ڕاناوە وەردەگرێ کە لەگەڵ تێنەپەڕی ڕسەندا دەردەکەوێ:

## بکەر نادیار و دارشتنی وشە

فرمان یا چاوگە سادەکانی وەک (کردن - هاتن - خستن - بوون - کەوتن - دان - چوون..هتد). بەشێوەیێکی گشتی لە زمانی کوردیدا زۆر نین[٧]، بەڵام هەر لەم ژمارە کەمەوە سەدان، بەڵکو هەزاران فرمان و چاوگی تری خاوەن مانای تریان لێ وەردەگیرێ و دادەڕێژرێ[٨] بەهۆی پێشگر و پاشگر و پێشبەند و ناو و ئاوەڵناوەوە[٩] هتد. هەریەکە لەمانە بەتەنیا یا پێکەوە لەگەڵ چاوگی سادەدا دەردەکەون چاوگی لێکدراو و دارێژراو پێک دەهێنن. بۆ نموونە:

١- پێشگر + چاوگ هەڵکردن

٢- چاوگ + پاشگر کردنەوە

٣- ناو + چاوگ بیرکردن

٤- ئاوەڵناو + چاوگ پڕکردن

٥- پێشبەند + چاوگ لێکردن

٦- پێشگر + چاوگ + پاشگر هەڵکردنەوە

٧- ناو + چاوگ + پاشگر بیرکردنەوە

٨- پێشبەند + ناو + چاوگ + پاشگر لێکدانەوە (لە + یەک + دان + ەوە)

٩- ئاوەڵناو + چاوگ + پاشگر ڕوونکردنەوە

١٠- پێشبەند + ناو + چاوگ بەسکدان

١١- (پێشگر/پێشبەند) + پێشگر + چاوگ تێ بەردان

١٢- پێشگر + پێشبەند + پێشگر + چاوگ دەربەدەربوون

١٣- پێشبەند + چاوگ لێدان

١٤- پێشبەند + ناو + چاوگ لەبیرکردن

...... هتد

ڕێگایێکی تر بۆ دارشتنی فرمان یا چاوگی تر لە زمانی کوردیدا لە ڕێی قاڵبی بکەر نادیارەوەیە وەک خواردن - خوران (لەش خوران)

گرتن - گیران (مانگ گیران - بەند بوون)
ڕاگیران، هەڵگیران
کوتین - کوتران (بۆ ئاوڵە) ...... هتد

**پەراوێزەکان:**

١- ئەم باسە لە بارەی شێوەی کرمانجیی خوارووەوەیە بۆ یاسای بکەر نادیار لە کرمانجیی ژووروودا سەیری سەرچاوە ژمارە (٢) بکە.

٢- بۆ یاساکانی دەستنیشانکردنی ڕەگی داهاتووی فرمان لە زمانی کوردیدا سەیری ئەم باسەم بکە (چەند یاسایێکی مۆرفۆلۆجیی دارشتنی فرمان) گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠٩) ساڵی ١٩٨٦.

٣- بۆ چەمکی ڕێککەوتن سەیری ئەم باسەم بکە ڕێککەوتن لە زماندا - گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (٩١) ساڵی ١٩٨٢.

٤- بۆ ڕیزبوونی ئەم سێ بەشە بنچینەیەی ڕستە:

أ - بکەر (S) subject

ب- بەرکار (O) object

ج- فرمان (V) verb ئەم شەش ئیحتماله هەیە (VOS - OVS - OSV - VSO - SVO - SOV) تا ئەم دواییە وا دەزانرا کە هەر ئەم سێ ئیحتیماله لە زماندا دەردەکەوێ.

١- (SOV) بکەر - بەرکار - فرمان وەک زمانی کوردی

٢- (SVO) بکەر - فرمان - بەرکار وەک زمانی ئینگلیزی

٣- (VSO) فرمان - بکەر - بەرکار وەک زمانی عەرەبی

بەڵام زمانی تر دۆزرانەوە سێ ئیحتیمالەکەی تریش بگرنە خۆ. بەمە خاڵی یەکەمی نەزەرییەکەی J. Greenberg کە دەڵێ دەرکەوتنی بکەر پێش بەرکار لە ڕستەی ئاساییدا یاسایێکی زمانیی گشتییە Universal بەهەڵە دەرچوو. سەیری لاپەڕە (٢٠٤)ی سەرچاوە ژ (٧) بکە.

٥- ئەم بۆچوونە یەکەم جار لە سەرچاوە ژمارە (٤)دا پێشکەش کراوە. سەیری لاپەڕە (٤٤) و (١١٧) بکە.

٦- ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی کاتی داهاتوو خۆی بەم دوو قاڵبە (ات / ێت) دەردەخا. ئەگەر ڕەگی فرمان بە(ۆ) یا (ـە) کۆتایی بێ ڕاناوەکە قاڵبی (ات) دەگرێتە خۆ. وەک لە:

شوشتن ــ شۆ ( دەشو - ات)

کردن ــ کە (دە - ک - ات - دەکات)

لە هەموو حاڵەتێکی تردا ڕاناوەکە قاڵبی (ێت) دەگرێتە خۆ. ڕەگی فرمانی بکەر نادیاری کاتی داهاتوو هەمیشە بە(ێ) کۆتایی دێ. بۆیە ڕاناوە لکاوەکە بەشێوەی (ێت) دەردەکەوێ.

(ێ)ی نیشانەی کات و (ێ) راناوەکە لەناو یەکتردا دەتوێنەوە و دەبن بەیەک

دەبین + ر + ێ + یت ـــ دەبینرێت

دەشو - ر + ێ + یت ـــ دەشوورێت

(ت)ی (ات / یت) دەشێ لە هەندێ حاڵەتدا گـۆ نەکـرێ optional بێ ئەوەی کـار لە رێزمـانێـتـیی رستەکە بکات.

بەتوانەوەی (ێ) و گۆ نەکردنی (ت)

دەبینرێت ـــ دەبێتە ـــ دەبینرێ

دەشوورێت ـــ دەبێتە ـــ دەشوورێ

٧- بەپێی لێکۆڵینەوەیەکم کە لە ژمارە (٦٥)ی گۆڤاری رۆژی کوردستان ساڵی ١٩٨٤دا بڵاوکراوەتەوە ژمارەی چاوگە سادەکانم بە(٢٤١) لە قەڵەم داوە لەمە (١١١)ی ئەلفێن (٧٦)ی یائێن (٣٤)ی تائێن (١٣)ی دالێن (٧)ی واوین. دوایی هی ترم بۆ دۆزرایەوە و ژمارەکە خۆی لە (٢٩٥) دەدا.

٨- هەر لە فرمانی (دان) بۆ نموونە ئەم هەموو لێکدراو و دارێژراوانە وەردەگیرێن.

(لێـدان - هەڵدان - پەردان - پێـوەدان - لادان - بازدان - دادان - تێـوەردان - دادانەوە - تاودان - گوردان - تێکدان - ئاودان - هەڵدانەوە ـــ پشوودان - لێکدان - لێکدانەوە - کۆڵدان - تێهەڵدان - بەردان - پاڵدان - لوولدان - پاڵدانەوە - بەتەفـرەدان - بەرووداهاتنەوە - گـرێدان - گـارەدان - دڵدانەوە - جـاڕدان - ئازاردان - بەرادان دان - دەردان - هەناسـەدان - ورەبەردان - بەسکدان - سەردان - زیاندان - گیاندان - تەڵاقدان - لە دەسـتدان - بادانەوە - بانگدان - سزادان - لەسەردان - تێـبـەردان - نیـشـاندان - پێـشـاندان - قـانگدان - هاندان - بەبادان - کلیلدان - داتانەوە - پەلامـاردان - رەنجـدان - رەنگدانەوە - دەنگدانەوە - گـوێدان - قـووتدان - فـرێدان - رادان - بەرپێچدانەوە - هەوڵدان - لەتردان - ...) و زۆری تر.

٩- هەموو ناوەڵناوێک (کرن) و (بوون)ی دەچێتە سەر تێپەڕ و تێنەپەڕی لێ دادەرێژرێ.

| | | |
|---|---|---|
| پڕ | پڕبوون | پڕکردن |
| رووناک | رووناکبوون | رووناککردن |
| سەوز | سەوزبوون | سەوزکردن |

سەرچاوە:

١- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاریی کورد.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) ڕستەی بکەر نادیار - گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (٩٥).

٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) تێنەپەڕ فرمانێکی بکەر نادیار گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠٨).

4- Amin .W. O. (1979) Aspects Of the verbal construcion in Kurdish - University of London.

5- Huddleston. R. (1976) An Introduction to English Transformational syntax. Long man.

6- Mackenzie. D. N. (1961) Kurdish dialect studies. London.

7- smith. N. and Wilson (1979) Modern Linguistics.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٩) ساڵی ١٩٩٢، لاپەڕە ١٨-٢٢ بڵاوکراوەتەوە.

# هێز و ئاواز

زمان دیاردەیێکی لە رادەبەدەر ئاڵۆز و چووەناویەکە. ڕێزمان هەوڵدانە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕوویەکی یا لایەنێکی ئەم دیاردەیە.

ئەرکی سەرەکیی ڕێزمان دەستنیشانکردنی کەرەسەکانی زمانە و ڕوونکردنەوەی سروشتی پەیوەندیی نێوان ئەم کەرەسانەیە لە ئاستە جیاوازەکاندا[١].

بەشێ لەو کەرەسە گرنگانەی زمان کە دەورێکی هەرە بالا لە ڕێزماندا- لە هەموو ئاستەکاندا - دەگێڕن ئەوەیە کە لە زانستی زمانا بە(ڕەوت)[٢] Pitch ناودەبرێ. سەرەڕای گرنگێتی ئەم بابەتە نەک هەر لە زمانی کوردیدا بەڵکو لە زۆربەی زمانانی جیهاندا... کەم باس کراوە. ئەم باسە هەوڵدانێکە بۆ پێناسینی ئەم لایەنەی زمان و دەرخستنی هەندێ لە ئەرکەکانییەتی لە زمانی کوردیدا.

**پێناسین:**

دەنگەکانی زمان لە گەلێ ڕووەوە پۆل دەکرێن. یەکێ لەمانە ئەوەیە دەنگەکان دەبنە ژێدار Voiced و بێ ژێ Voicless.

مەبەست لە دەنگی ژێدار ئەوەیە لە کاتی دروستکردنی دەنگەکە ژێکان vocal cords دەلەرێنەوە. دەنگی (بێ ژێ) ئەوەیە لە کاتی دروستکردنیدا ژێکان نالەرێنەوە.

بۆ نموونە دوو دەنگی (ز) و (س). لە هەمان شوێن لە زاردا دروست دەکرێن. هەڵوێستی زمان و هەموو بەشەکانی تری ئەندامانی ئاخاوتن لە کاتی دروستکردنیاندا هەمان جۆرن. ئەوەی لێکیان جیادەکاتەوە ئەوەیە لە (ز)دا ژێکان دەلەرێنەوە و لە (س)دا نالەرێنەوە. هەمان شت لەگەڵ ئەم جووتە دەنگانە.

د - ت

ک - گ

ش - ژ

ف - ڤ ...هتد

جگە لەمە لەرینەوەی ژێکان کەرەسەیێکی تری یەکجار گرنگی (زمانی) پێک دەهێنێ.

ئەم کەرەسەیە لە ئەنجامی گۆڕینی خێرایی لەرینەوەی ژێکان دێتە دی و دەبێتە هۆی (بەرزی) و (نزمی)ی ڕەوتی قسەکردن و بەخشینی ئاوازی جیاجیا بەدەربڕینەکان.

***

قسەکەری هەر زمانێ لە کاتی قسەکردندا وشە و ڕستەکانی خۆی بەڕەوتێکی ئاسۆیی ڕێک لە زارەوە دەرناهێنێ. بەڵکو بەردەوام لە (بەرزی) و (نزمی)دا دەبن، واتا لە (هەڵس) و (کەوت)دا دەبن[٣]. جۆر و ڕادە و پلەی خێرایی و توندی و شلیی ئەم (هەڵس) و (کەوت)انە بەپێی (مەبەست) و (یاساکانی زمانەکە) سەرهەڵدەدەن.

لە زانستی زمانا بۆ هەر جۆرە (هەڵس) و (کەوت)ێک نیشانەیێک دانراوە. بەکار دەهێنرێن لە کاتی شیکردنەوەی زمان و دەرخستنی ئەو لایەنانەی لە نووسینی ئاساییدا پشتگوێ خراون. بۆ نموونە

( ↑ ) هەڵسێکی لە پڕ Sudden rise
( ↕ ) کەوتی لەسەرەخۆ gradual Fall
( ↖ ) هەڵسی لەسەرەخۆ graduall rise
( ↓ ) کەوتی لە پڕ sudden Fall
( | ) وەستانێکی زۆر کورت brief pause
( || ) وەستانێکی تەواو Pause
(٤)

... هتد.

سێ جۆرە ڕەوت لە زمانا دەستنیشان کراوە

١- هێز Stress
٢- ئاواز intonation
٣- تۆن Tone

(هێز) و (ئاواز) گشتێن Universal. واتا لە هەموو زمانێکا هەن.. (تۆن) تایبەتییە و لە بەشێ لە زمانەکانی جیهاندا بەرچاو دەکەون.

## ١- هێز

زیادە وزەیێکی دەنگییە لە پڕ لەسەر یەکێ لە برگەکانی وشە سەر هەڵدەدا... (واتا هێز

سەر بەناستی مۆرفۆلۆجییە و دەوری لە چوارچێوەی ئەم ئاستەدا دەرناچێ) بۆ نموونە وشەی (بەلام) لە دوو برگە پێک هاتووە (بە + لام). لە برگەی یەکەمدا هەلچوونێکی لە پڕی دەنگی سەرهەلدەدا. ئەم هەلچوونە ئەنجامی خێرا لەرینەوەی ژێکانە. ئەمە لە برگەی دووەمدا بەدی ناکرێت.

لە وشەی (خانوو)دا کە ئەمیش هەر لە دوو برگە پێک هاتووە هێز کەوتۆتە سەر برگەی دووەم. وشەی (ئەستێرە) لە سێ برگەی پێک هاتووە (ئەس + تێ + رە) هێز کەوتۆتە سەر برگەی سێیەم. هەلچوونێکی دیار و ئاشکرا لەسەر برگەی سێیەم (رە) بەدی دەکرێ. هەموو خاوەن زمان بەئاسانی هەستی پێ دەکات.

ئەگەر دوو برگەکەی تر (ئەس + تێ) لە ڕووی هێزەوە بەراورد بکرێن دەردەکەوێ کە هێز لەسەر برگەی (ئەس) زیاترە لەوەی لەسەر (تێ)دایە. بەم هێزە دەوترێ هێزی دووەم Sec-ondary stress.

شیکردنەوە بەهۆی ئامێری sound spectograph دەری دەخات کە هێز لەسەر هەموو برگەکانی وشەدا هەن بەلام لەسەر هەر یەکەی بەڕادە و پلەیێ.

ئەگەر شوێنی (هێز) یا ئەم (هێزانە) گۆڕا وشەکان دەشێوێن و تێک دەچن بەڕادەیێ لەوانەیە خاوەن زمان نەیانناسێتەوە و بەبیانییان تێ بگات.

هەر زمانێک دەستەیێک یاسای فۆنۆلۆجیی تایبەت بەخۆوەی هەیە بەهۆیانەوە شوێنی هێزی سەرەکی و هێزی دووەم و سێیەم لەسەر وشەکاندا دەستنیشان دەکرێن.

لە زمانی کوردیدا - بەشێوەیەکی گشتی- هێزی سەرەکی دەکەوێتە سەر دوا برگەی وشەوە. هەندێ ناوێزە بەرچاو دەکەوێ وەک (چونکە، بەلام، هێشتا... هتد) لەم وشانەدا هێز کەوتۆتە سەر برگەی یەکەم.

ئێستا سەیری ئەو وشانەی خوارەوە بکە و ببینە چۆن ئەگەر شوێنی هێز تیایانا گۆڕا واتاکانیان دەگۆڕێ.

نوستن nu'stin / nusti'n

ئازادی aza'dî / azadi'

برایەتی brâ'yati / brâyatî'

سەوزە Sa'wza / Sawza'

['] نیشانەی هێزە

لە (نوستن)دا کە هێز لەسەر دوا برگەدابێ، واتای (چاووگی) دەگەیێنێ وەک بلێی

(نوستن خۆشە) ئەگەر هێزەکە خرایە سەر برگەی یەکەم ماناکە دەگۆڕێ و دەبێتە (ئەوان نوستن).

لە وشەی (ئازادی)دا، کە لە سێ برگە پێک هاتووە (ئا + زا + دی) هێز لەسەر دوا برگەدا بێ واتای (سەربەستی) دەگەیێنێ. ئەگەر خرایە سەر برگەی دووەم ماناکە دەبێتە (تۆ ئازادی) چ بەواتای (تۆ ناوت ئازادە) یا (تۆ سەربەستی).

وشەی (برایەتی) کە لە سێ برگە پێک هاتووە (برا - یە - تی) ئەگەر هێز کەوتە سەر دوا برگە واتای (برایی) دەگەیێنێ. ئەگەر خرایە سەر برگەی یەکەم واتای (ئەو برایەتی) دەگەیێنێ. هەمان شت لەگەڵ وشەی (سەوزە) ئەگەر هێز خرایە سەر برگەی دووەم کە دوا برگەیە واتا (خواردنی سەوزە) دەگەیێنێ یا وەک ناو لە کچان دەنرێ. ئەگەر هێز کەوتە سەر برگەی یەکەم واتای (شتەکە ڕەنگی سەوزە) دەگەیێنێ.

لە ئەنجامی بەراوردکردنی ژمارەیێکی زۆر لەم جۆرە جووتە وشانە بۆم دەرکەوت کە ئەگەر مۆرفیمێ خرایە سەر هەر وشەیێ و وشەی تازەی خاوەن مانای تازەی لێ پێک هێنا ئەوە کار لە شوێنی هێزەکەی دەکات و دەیگوێزێتە سەر دوا برگەوە. ئەگەر کاری لە مانا نەکرد، هێزەکە لە شوێنی خۆی دەمینێ و جێی ناگۆڕێ.

لە وشەی (نووستن) و (ئازادی)دا (ن) و (ی) دوو. مۆرفیمی مۆرفۆلۆجین. (ن) دەچێتە سەر ڕەگی ڕابردووی فرمان و (ی) دەچێتە سەر ئاوەڵناو، ناویان لێ پێک دەهێنن. کە وشەی تر و خاوەن مانای تر و سەر بەبەشە ئاخاوتنی ترن. بۆیە کە چوونە سەر (نوست) و (ئازاد) کاریان لە شوێنی هێز کرد و هێنایانە سەر دوا برگەوە. (چونکە هێز لە وشەی زمانی کوردیدا لەسەر دوا برگە سەرهەڵدەدا).

ئەمە لە لایێک... لە لایەکی ترەوە (ن) و (ی) جگە لەوەی دوو مۆرفیمی مۆرفۆلۆجین هاودەنگیشن (homophones) لەگەڵ دوو مۆرفیمی تری سینتاکسی. دەچنە سەر ڕەگی ڕابردووی فرمان و ئاوەڵناو بۆ بەجێهێنانی ئەرکی سینتاکسی کە کار لە مانای وشەکان ناکەن و بەشە ئاخاوتنەکانیان ناگۆڕن. (ن) نیشانەی ڕێکەوتنە concord لەگەڵ ڕەگی ڕابردووی فرمان دەردەکەوێ بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەگەڵ بکەری کەسی دووەم و سێیەمی کۆ.

ئەوان نوستن - ن

ئێوە نووست -ن

(ی) نیشانەی ڕێکەوتنە لەگەڵ کەسی دووەمی تاکدا دەردەکەوێ لە ڕستەی ناویدا.

تـۆ ئـــازادی

سەیرکە، کە (ن) و (ی) چوونە سەر (نوست) و (ئازاد) مانایان لێرە نەگۆڕی بەڵکو پەیوەندییان پێشان دا لەگەڵ بەشی تری ڕستە. بۆیە کاریان لە شوێنی هێز نەکرد. (ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ کە هێز پەیوەندیی بەلایەنی مۆرفۆلۆجییەوە هەیە و لە ئاستی سینتاکسیدا هیچ دەورێکی نییە).

واتا ئەگەر مۆرفیمێ خرایە سەر هە چ وشەیێک یا مۆرفیمێکی تر و شوێنی هێزی گۆڕی ئەوە مۆرفیمێکی مۆرفۆلۆجییە. ئەگەر نەیگۆڕی ئەوە مۆرفیمێکی سینتاکسییە.

**هێز وەک نیشانەی کات**

ڕستەی

درەختەکە سەوز بوو.

لە ڕووی کاتەوە دوو مانای جیای دەخرێتە پاڵ:

١- ئەگەر هێز کەوتە سەر (بوو) ئەوە دەگەیێنێ کە درەختەکە ئێستا سەوزە و لە ڕابردوودا سەوز نەبووە.

٢- ئەگەر هێز کەوتە سەر (سەوز) ئەوە دەگەیێنێ کە درەختەکە ئێستا سەوز نییە و لە ڕابردوودا سیفەتی سەوزی پێوە بووە.

هۆی ئەم جیاوازییە دەخرێتە پاڵ پێکهاتنی مۆرفۆلۆجیی وشەکانی ڕستەکە و سروشتی پەیوەندیی نێوانیان لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا.

بۆ مانای یەکەم ڕستەکە لە دوو وشە پێک دێت (درەختەکە + سەوز بوو).

وشەی (سەوز بوو) لێرە وشەیێکی لێکدراوە لە (سەوز + بوو) پێک هاتووە. (بوو) لێرە پاشگرێکی مۆرفۆلۆجییە چۆتە سەر (سەوز) کە ناوەڵناوە، فرمانێکی تێنەپەڕی لێکدراوی پێ پێک هێناوە. وشەی سەوز هێزی خۆی دۆڕاندووە و چۆتە سەر (بوو) کە بۆتە دوا برگەی وشە لێکدراوەکە. چونکە لە وشەی زمانی کوردیدا هێز لەسەر دوا برگەدا سەرهەڵدەدا.

پەیوەندیی ڕستەیی نێوان وشەکانی ئەم ڕستەیە بۆ ئەم واتایە بەم جۆرەیە:

وەک ( ئازاد کرِ بوو) واتا پێشتر دەگریا.

بۆ مانای دووەم ڕستەکە لە سێ وشە پێک دێت (درەختەکە + سەوز + بوو). پەیوەندیی ڕستەیی نێوانیان بەم جۆرەیە.

لێرە (سەوز) و (بوو) هەریەکە وشەیەکی سەربەخۆیە و ئەرکی سینتاکسیی خۆی هەیە. (سەوز) تەواوکەری (بوو)ە بۆیە وەک وشەیەکی سەربەخۆ هێزەکەی خۆی پاراستووە.

هەمان شت لەم ڕستەیەی خوارەوە و هەموو ئەوانەی ئەم جۆرە دارشتنەیان هەیە.

۲- ئاواز Intonation

گۆڕینی لەرینەوەی ژێکان دەبنە هۆی گۆڕانی ئاوازی ڕستە. هەر ئاوازەش واتایەکی جیا بەڕستە دەبەخشێ. بۆ نموونە ڕستەی.

ئازاد دوێنێ هات

دەیان مانای جیا دەبەخشێ بەپێی ئاوازەکەی ئەگەر خێرایی لەرینەوەی ژێکان لە سەرتاپای ئەم ڕستەیەدا هەمان شت بوو... ڕستەکە مانای (خەبەری) دەگەیەنێ.

ئەگەر خێرایی لەرینەوەی ژێکان لەسەر وشەی (ئازاد)دا زیادکرا. ڕستەکە دەبێتە وەلامی (کێ دوێنێ هات)؟. کە واتا و مەبەستێکی تری جیا لەوەی سەرەوە دەگەیێنێ.

ئازاد دوێنێ هات.

ئەگەر خێرایی لەرینەوەی ژێکان لەسەر وشەی (دوێنێ)دا زیادکرا، ڕستەکە دەبێتە وەلامی (ئازاد کەی هات)؟.

ئازاد کەی هات.

ئازاد دوێنێ هات.

کە واتا و مەبەستێکی ترە و جیاوازە لەوانەی سەرەوە. ئەگەر خێرایی لەرینەوەی ژێکان لەسەر وشەی (هات)دا زیادکرا. ڕستەکە دەبێتە وەلامی (ئازاد دوێنێ چیی کرد؟).

ئازدا دوێنێ هات.

ئەگەر خێرایییەکی زیاتر لەوەی سەرەوە خرایە سەر وشەی (ئازاد) یا (دوێنێ) یا (هات) ڕستەکە دەبێتە پرسیار + دووپاتکردنەوە (تاکید).

١- (ئازاد) دوێنێ هات؟ بەڵێ ئازاد دوێنێ هات لێرە مەبەست دووپاتکردنەوەیە لەسەر (ئازاد). واتا (ئازاد) هاتووە نەک کەسێکی تر.

٢- ئازاد دوێنێ هات؟ بەڵێ (دوێنێ)
لێرە مەبەست دووپاتکردنەوەیە لەسەر (دوێنێ) هاتووە نەک ڕۆژێکی تر.

٣- ئازاد دوێنێ هات بەڵێ (هات).
لێرە مەبەست دووپاتکردنەوەیە لەسەر (هاتنەکەی)

قسەکەری هەر زمانێ دەتوانێ بەگۆڕینی ئاوازی ڕستەکەی چەمکی سەرسوڕمان و تیز و گاڵتەپێکردن و ڕەزایی و ناڕەزایی و... هتد دەربڕێ و دەری خا مەبەستی کامە بەشی ڕستەکەیە... واتا هەر ڕستەیەی دەیان واتا و مەبەستی جیاواز دەبەخشێ بەپێی ئاوازەکەی. تەنانەت هەڵوێست و مەبەستی شاراوە و باری دەروونی قسەکەریش بەهۆی ئاوازی ڕستەکەوە دەزانرێ و ئاشکرا دەبێ.

## ئاواز و چەمکی دژیەکی

ڕستەی (نەکەی دەتکوژم) دوو واتای بەتەواوی دژیەکی هەیە بەپێی ئاوازەکەی دەستنیشان دەکرێن و دەزانرێن.

١- ئەگەر بکەی دەتکوژم.

٢- ئەگەر نەکەی دەتکوژم.

بۆ دەربڕینی مەبەستی یەکەمی بڕگەی یەکەمی (نەکەی) کورت دەکرێتەوە و بڕگەی دووەم لە پڕ دەوترێ و وەستانێ دوای (نەکەی) هەیە. بڕگەی سێیەمی دەتکوژم بەرزبوونەوەیەکی خێرای لەپڕی پێوەیە.

نەکەی || دەتکوژم.

بۆ دەربڕینی مەبەستی ٢ەوە... وەستان دوای وشەی (نەکەی) نییە. بڕگەی دووەمی نەکەی نزمبوونەوەیەکی خێرای پێوەیە. بڕگەی سێیەمی (دەتکوژم) دەگوترێ.

دەستنیشانکردنی (نزنەی) هەر ڕستەیەک واتا ئاوازەکەی و سروشتی هەر بڕگەیێک بەبێ ئامێری Spectogram ناکرێ. لە ڕاستیدا ئەم لایەنەی زمان ئەوەندە، سرکە، تازەترین و پێشکەوتووترین ئامێریش ناتوانێ هەموو لایەنەکانی بەوردی دەستنیشان

کـات. بۆیە لە سـەرەتای ئەم باسـەدا وتمان ڕێزمـان دەتوانێ لایەنێکی زۆر کـەمی زمـان بخاتەڕوو.

### ٣- تۆن Ton

ژمـارەیەکی زۆر لە زمـانانی جیـهـان بە(تۆنی) ناو دەبرێن. لەم زمـانانەدا هەمـان ڕیزە دەنگ چەند مانایەکی جیاواز دەبەخشێ بەپێی (تۆن)ەکەی.

(تۆن) لەسـەر وشـەی یەک مـۆرفـیـمـیی یەک بڕگـەیی بەرچاو دەکـەوێ و تایبـەتە بەو زمـانانەی بە Isolating ناو دەبرێن وەک زمـانی (چینی) و (تایلەندنی) و (نیـویی) و (توی).

بۆ نموونە لە زمانی چینییا ئەم ڕیزە دەنگە (ta) چوار مانای جیا دەبەخشێ بەپێی تۆنەکەی.

١- مەزن (ta) لە بەرزییەوە بۆ نزمی.

٢- لێدان (ta) نزم و لە پڕ بەرز.

٣- سمین (ta) لە نزمییەوە بۆ بەرزی.

٤- بەرزکردنەوە (ta) ئاسایی ئاستیی.

لە زمـانی تایلەندیدا وشە پێنج تۆنی هەیە... هەر تۆنەی مـانایەک دەبەخشێ بۆ نموونە ڕیزە دەنگی (naa) ئەم پێنج مانایەی هەیە.

١- نازناو (naa) نزم.

٢- برنج (naa) ناوەڕاست.

٣- بچووکترین خاڵ یا پوور (naa) بەرز.

٤- ڕوومەت (naa) لە بەرزییەوە بۆ نزمی.

٥- ئەستوور (naa) لە نزمییەوە بۆ بەرزی.

**پەراوێزەکان:**

١- مەبەست لە ئاستەکان (فۆنۆلۆجی - مۆرفۆلۆجی - سینتاکسی - سیمانتیکی)یە.

٢- Pitch پلەی ئاوازە (درجة النغم). لە کوردییا ئاواز بۆ Intonation بەکار هێنراوە. بەلای منەوە (ڕەوت) بۆ Pitch دەگونجێ. هیوادارم وشەیەکی لەبارتر بدۆزرێتەوە بۆ Pitch ئەگەر ئەمە پەسند نەکرا.

٣- (هەڵس) و (کەوت) بەرامبەر (Falling) و (Rising) پێشنیار دەکەم.

٤- بۆ نیشانەکان سەیری لاپەڕە (ix)ی سەرچاوە ژ (5) بکە.


1- Fromkin and Rodman (1979) An Introduction to language. second Edition.

2- Jones. D. (1979) An outline of English Phonetics. Cambridge.

3- Hockett. C. F. (1985) A course in modern Linguistics.

4- Mackenzie. D. N. (1962) Kurdish dialects stadies - London.

5- Robins. R. H. (1971) General Linguistics. Longman.

6- Oconner. J. D. (1971) Advanced phonetic reader. Cambrigde university press.

7- Oconner and Arnold. C. F. (1973) Introduction of colloquiol English.



*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٤) ساڵی ١٩٩٤، لاپەڕە ١٣-١٦ بڵاوکراوەتەوە.**

## لێڵی لە زمانی کوردیدا...

لێڵی Ambiguity لە زمانا ئەوەیە دەربڕینێک زیاتر لە مانایێک ببەخشێ. دوو جۆری لێ دەستنیشان کراوە.

١- لێڵی مۆرفۆلۆجی.

٢- لێڵی سینتاکسی.

لێڵی لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا ئەوەیە وشەیێک یا مۆرفیمێک (بەتەنیا) ببیستری یا بخوێنرێتەوە گوێگر یا خوێنەر بەزیاتر لە مانایێک تێی بگا. وەک (ڕواندن، بار، لایدا، خوێن، ڕان... هتد) کە ئەم واتایانەیان دەدرێتە پاڵ.

وشە هەیە تەنیا لە نووسیندا لێڵە... بەبیستن لێڵییەکەی دەڕەوێتەوە. وەک (سەوزە) لە وتندا ئەگەر هێز stress خرایە سەر برگەی یەکەم دەبێتە سیفەتێک دەخرێتە پاڵ شتێک[1]. وەک (گیا سەوزە- Sa'wza) ئەگەر هێز خرایە سەر برگەی دووەم واتای (خواردەمەنیی سەوزە-Sa'wza) دەگەیێنێ.

هۆی ئەمە ئەوەیە(ـە) جارێ وەک دانەیێکی مۆرفۆلۆجی و جارێ وەک سینتاکسی لەگەڵ (سەوز)دا دەردەکەوێ واتا (ە) دوو مۆرفیمی جیای هاودەنگن. Homophon. لە حاڵەتی مۆرفۆلۆجیدا دەچێتە سەر (سەوز) وشە و مانای تازەی لێ دادەڕێژێ. هێزەکە دەگوێزێتە سەر دوا برگە (چونکە لە زمانی کوردیدا هێز لەسەر دوا برگەی وشەدا سەر هەڵدەدا).

لە لایێکی ترەوە (ە) وەک دانەیێکی سینتاکسی دەچێتە سەر (سەوز) بۆ دەربڕینی (ڕێکەوتن و کات) لەم حاڵەتەدا کار لە شوێنی هێز ناکات[2]. هێز لە نووسیندا دەرناکەوێ بۆیە ئەگەر بەتەنیا بەرچاو کەوت بەلێڵ لە قەڵەم دەدرێ. لە وتندا لێڵییەکەی نامێنێ. نموونەی تری ئەم جۆرە (برایەتی - وردە... هتد)

وشە هەیە لە نووسیندا لە دوو ڕووەوە زیاتر لێڵە. بەوتن بەشێکی لێڵییەکەی دەڕەوێتەوە. وەک (نوستن - هاتن) لەم وشانەدا ئەگەر هێز خرایە سەر بڕگەی دووەم چەمکی چاوگی و ناوی دەگەیێنێ. (نوستن خۆشە). ئەگەر هێزەکە خرایە سەر بڕگەی یەکەم چەمکی فرمانی دەگەیێنێ. ئەم دارشتنانە لە چەمکی فرمانیدا دیسان لێڵن چونکە ڕاناوی کەسی دووەم و سێیەمی کۆ (ن) هاودەنگن.

هەمرو چاوگە تێنەپەڕەکان بەر ئەم جۆرە لێڵییە دەکەون. لە (چوون - مان)دا لێڵی سێ ڕوویییە. چونکە یەک بڕگەیین بەوتن شوێنی هێز ناگۆڕێ.

لە (یانی) تێنەپەڕدا لێڵییەکە دەبێتە چوار ڕوویی. وەک(پێکەنین - پژمین - خزین -) کە ڕاناوی کەسی یەکەمی کۆ(ین)یان دەچێتە سەر... (ی)ی ڕاناو لەگەڵ (ی)ی ڕەگی ڕابردوو لەناو یەکتردا دەتوێنەوە دەبن بەیەک (ی).

پێکەنین ـــ پێکەنین خۆشە (چاووگ)
ئەوان پێکەنین (پێکەنی + ن)
ئێوە پێکەنین (پێکەنی + ن)
ئێمە پێکەنین (پێکەنین + ین)

ئەم جۆرە لێڵییانە هەموو لە ڕستەدا نامێنن.

## لێڵی لە ڕستەدا

ڕستە لێڵە ئەگەر زیاتر لە مانایێکی بوو. چەند هۆیێکی هەیە و بەچەند جۆرێ لێک دەدرێتەوە.

یەکەم - هەبوونی وشەی (فرەواتا) Polysemous لە ڕستەدا وەک لە:

ئازاد ئازار لە دڵ دەڕوێنێ.

ئەم دوو واتا دژیەکەی هەیە:

١- ئازاد ئازار دەخاتە دڵ.

٢- ئازاد ئازار لە دڵ لا دەبا.

هۆی ئەمە ئەوەیە وشەی (دەڕوێنێ) ئەم دوو مانایەی دەخرێتە پاڵ (١- چاندن. ٢- تێپەڕی ڕۆیشتن).

دووەم: جیایی لە ئاوازی ڕستەدا Intonation وەک لە ڕستەی:

هەر چواریان هاتن.

ئەم دوو واتایەی هەیە:

١- هەموو. چواربوون و هەموو هاتن. بۆ ئەم واتایە وزەی زیاد دەخرێتە سەر (هەر).

٢- زیاتر بوون لە چوار و تەنیا چواریان لێ هاتن.

بۆ ئەم واتایە وزەی زیاد دەخرێتە سەر (چوار).

ڕستەی (هەر چواریان ئامادە بوون) ئەم چوار واتایەی دەخرێتە پاڵ.

١- هەموو چوار بوون و هەموو (لە ڕابردوودا) ئامادە بوون.

٢- هەمرو چوار بوون و هەمرو (ئێستا) ئامادە بوون.

٣- لە چوار زیاتر بوون تەنیا چواریان (لە ڕابردوودا) ئامادە بوون.

٤- لە چوار زیاتر بوون تەنیا چواریان (ئێستا) ئامادەن.

هۆی ئەمە ئەوەیە سەرباری ئەوەی لە سەرەوە لە بارەی (هەرچواریان) ڕوون کرایەوە، (ئامادەبوون)یش دوو واتا و پەیوەندیی جیا دەگەیێنێ، بەپێی شوێنی هێز.

ئەگەر هێز خرایە سەر (بوو) واتای کاتی ئێستا دەگەیێنێ. ئەگەر خرایە سەر (ئامادە) واتای کاتی ڕابردوو دەگەیێنێ.

سێیەم: هەبوونی دوو پەیوەندیی جیا لە نێوان بەشەکانی ڕستە لە بنجدا deep structure و دەرنەکەوتنی ئەم جیاوازییە لە سیمادا Surface structure. وەک لە:

ئاواز و ئاهەنگی خوشکم چوونە هەولێر. دوو واتای جیای هەیە:

١- ئاواز و ئاهەنگ هەردووک خوشکمن.

٢- هەر ئاهەنگی خوشکمە.

ئەم دوو پەیوەندییە لە بنجدا بەم شێوەیە ڕوون دەکرێتەوە.

چوارەم: لە ئەنجامی سەپاندنی هەندێ یاسای گوێزانەوە... یاسای جیا دوو ڕستەی جیا (لە بنجدا) دەکەن بەهاوسیما. بۆ نموونە ڕستەی (پێم دەشکێ).

ئەم دوو واتایەی هەیە:

١- قاچم دەشکێ.

٢- من دەتوانم بیشکێنم.

بەگوێرەی واتای یەکەم: لە زمانی کوردیدا یاسایێک هەیە بەهۆیەوە دەشێ ڕاناوی جودای هەیی بکرێ بەلکاو. بەپێی ئەم یاسایە (پێی من) دەبێتە (پێم). کە (م) جێی (من) دەگرێ دەوری (ی)ی بەستێ نامێنێ و لادەچێ. بەم یاسایە ڕستەی (پێی من دەشکێ) دەبێتە (پێم دەشکێ).

بەگوێرەی مانای دووەم: لە زمانی کوردیدا یاسایێک هەیە بەهۆیەوە ڕاناوی جودای بەرکاری دەشێ بەڕاناوێکی لکاو جێگیر بکرێ ئەگەر ڕاناوەکە دوای (بە)بێ (بە) دەبێتە (پێ). بەم یاسایە (بەمن) دەبێتە (پێم) و ڕستەی (بەمن دەشکێ) دەبێتە (پێم

دەشکێ) کە لەگەڵ ڕستەکەی پێشوودا دەبێتە هاوسیما[٣].

ڕستەی (پێی دەخورێ) ئەم سێ واتایەی هەیە:

١- قاچی (وەک خواردن) دەخورێ.

٢- قاچی (وەک هەست و ئازار) دەخورێ.

٣- دەتوانێ بیخوا.

بۆ ئەم لێڵییە دوو هۆ دەستنیشان دەکرێ.

١- (دەخورێ) دوو واتای هەیە.

٢- (پێی) سێ مانا و پەیوەندیی جیای هەیە.

ڕستەی (ئەڕۆی دەتکوژم) ئەم دوو واتا دژیەکەی هەیە.

١- ئەگەر ئەڕۆی دەتکوژم.

٢- ئەڕۆی ئەگینا دەتکوژم.

هۆی ئەم لێڵییە ئەوەیە. ئەم ڕستەیە دوو بنجی هەیە. جارێ وەک ڕستەیێکی (نهی) داخوازی و جارێ وەک ڕستەیێکی (مەرجی). بەپێی یاسایێکی گوێزانەوە ئامرازی (ئەگەر)ی لێ لابراوە. لە وتندا بەئاوازی ڕستەکە ماناکان لێک جیا دەکرێنەوە.

لەناو چوارچێوەی زمانێکدا ئەگەر یەک ڕستە لە مانایێکی زیاتر بەخشی ئەوە ئەم

ڕستەیە زیاتر لە بنجێکی هەیە. یاسای گوێزانەوەی جیا لە سیمادا وەک یەکیان لێ دەکات.

ئەگەر چەند ڕستەیێکی جیاواز هەمان واتایان بەخشی ئەوە ئەم ڕستانە یەک بنجیان هەیە. وەک

| | | |
|---|---|---|
| أ- قالە حەمەی کوشت. | یەک بنج | |
| ب- حەمە بەدەستی قالە کوژرا. | دوو سیما | |

| | |
|---|---|
| أ- من تۆ دەبینم | یەک بنج |
| ب- تۆ دەبینم | سێ سیما |
| ج- دەتبینم | |

بەستنی چەند ڕستەیێکی جیاواز بەهەمان بنجەوە و هەمان ڕستە بەچەند بنجێکی جیاوازەوە گرنگترین لایەن و بەردی بناغەی پێڕەوی گوێزانەوەیە - Transformation Generative theory

پەراوێزەکان:

(١) و (٢) بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی ئەم لایەنانەی زمانی کوردی سەیری سەرچاوەی ژمارە (٢) بکە.

(٣) بۆ یاساکانی گۆڕینی ڕاناوی جودا بەلکاو لە زمانی کوردیدا سەیری سەرچاوەی ژ (١) بکە.

سەرچاوە:


١- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو - بەغداد.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٩٤) هێز و ئاواز - گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ (١٣٤).

3- Amin, W. O. (1976) Some fandamental rules of Kurdish syntax structure - London. University.

4- Lyons, J (Ed) (1970) New Horizons in Linguiestics.

5- Palmer, F. R. (1976) Semantics - Cambridg.



* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٦) ساڵی ١٩٩٥، لاپەڕە ٦٦-٦٩ بڵاوکراوەتەوە.

# لە یاسا دەنگییەکانی زمانی کوردی

کە دەنگەکانی زمان دەکەونە پاڵ یەک بۆ دارشتنی دانەی گەورەتر (برگە - وشە - رستە)، کار لێک دەکەن. لە ئەنجامی ئەم کارلێککردنە دەنگ هەیە دەگۆڕێ... هەیە پەیا دەبێ... هەیە دەفرتێ و دەتوێتەوە... هتد...

ئەو بەشەی زانستی زمان کە یاساکانی ئەم لایەنەی زمان دەستنیشان دەکات بەفۆنۆلۆجی Phonology ناودەبرێ. ئەم باسە هەندێ لە یاسا فۆنۆلۆجییەکانی زمانی کوردی دەخاتەڕوو.

## ١- یاسای دەرکەوتنی (ر)

لەگەڵ فرمانی (دان - گەیشتن - کردن چوون- هاتن)[١]... هتد، ئەو ناوە یا ڕاناوەی لە دوای پێشبەندی (بە) دەردەکەوێ بەڕاناوی لکاو دەربڕا[٢]. پێشبەندەکە دەبێتە پاشبەندێکی فرمانی و قاڵبی (ێ) دەگرێتە خۆ.

لێرە دوو بزوێنی (ـە) و (ێ) کەوتنە پاڵ یەک دەنگی (ی - y)ی کپ لە نێوانیانا دەردەکەوێ و دەبێتە:

شتەکانم بدەیێ

هەندێ جار لە جیاتی ئەم (ی)یە (ر) دەردەکەوێ

شتەکانم بدەرێ

جاری واش هەیە (ـە) دەتوێتەوە و دەبێتە شتەکانم بدێ.

لە (کۆ)دا (ن)ی کۆ دەکەوێتە نێوان بزوێنەکان بۆیە ئەم (ی) یا (ر)یە دەرناکەون.

لە ڕستەی (شتەکە بدە بەئەو)دا دەشێ پێشبەندی (بە) بەپاشبەندی (ـە) جێگیر بکرێ. لەم حاڵەتەدا دوو (ـە) دەکەونە پاڵ یەک. لێرە ناشێ (ی) لە نێوانیانا دەرکەوێ و (ر) دەردەکەوێ.

جار هەیە یەکێ لە (ـە)کان دەقرتێ و پێویست بە(ر) ناکات.

لە کۆدا (ر) دەرناکەوێ چونکە (ن)ی کەسی دووەمی کۆ لە نێوان دوو (ـە)کاندا دەردەکەوێ.

لە فرمانە لێکدراوەکانی بەپاشگری (ەوە)ی وەک (کردنەوە - خواردنەوە - چوونەوە... هتد) لە داخوازی تاکدا کە دوو بزوێن دەکەونە پاڵ یەک (ر) لە نێوان دوو بزوێنەکەدا دەردەکەوێ.

دەرگاکە بکە [ر]ەوە ⟵ بکەرەوە

ئەم شیرە بخۆ [ر]ەوە ⟵ بخۆرەوە

بچۆ [ر]ەوە ⟵ بچۆرەوە

لە کۆدا (ن) دەردەکەوێ پێویست بە(ر) ناکات

دەرگاکە بکەنەوە

ئەم شیرە بخۆنەوە

هەندێ جار بزوێنەکان لەناو یەکا دەتوێنەوە پێویست بە(ر) ناکات.

دەرگاکە بکە - ەوە ⟵ دەرگاکە بکەوە

ئەم شیرە بخۆ - ەوە ⟵ ئەم شیرە بخۆوە

**٢- یاسای دەرکەوتن (ت)**

یەکەم: ئەو پێشبەندانەی کە لەگەڵ ئەو جۆرە فرمانانەدا دەردەکەون کە چەمکی گوێزانەوە دەگەیەنن (وەک چوون بۆ - ناردن بۆ - دان بە... هتد) دەشێ پێشبەندەکە بەپاشگری (ـە) جێگیر بکرێ.

١- أ- چووم بۆ هەولێر.

ب- چوومە هەولێر

٢- أ- ناردیان بۆ ئاسمان

ب- ناردیانە ئاسمان

٣- أ- دام بەئازاد

ب- دامە ئازاد

٤- أ- هێنایان بۆ ئێرە

ب- هێنایانە ئێرە

لەم جووتە ڕستانەی سەرەوە پێشبەندی ڕستەی (أ) لە (ب)دا بەپاشبەندی (ـە) جێگیر کراوە و هەمان واتا و ئەرکی ڕێزمانی بەجێ دەهێنێ. ئەگەر کاتی فرمانەکە خرایە ئێستەی تەواو Present Perfect[٣] (ت) لە نێوان دوو بزوێنەکەدا دەردەکەوێ. {(ـە)ی نیشانەی کات و (ـە)ی پاشبەند}.

ب- ئێمە هێناومانەتە ئێرە.

ب- من ناردوومەتە بەغا.

ب- ئەوان داویانەتە ئازاد.

ئەگەر ڕەگی فرمان بەکپ Consonant کۆتایی هاتبێ. بەنەمانی ڕاناوی لکاوی کەسی، [وو]ی نیشانەی کاتی ئێستای تەواو دەبێتە [ۆ] و [ـە] نامێنێ. وەک [ناردن] ڕەگی ڕابردووی بە[د] کۆتایی دێ [نارد]. لەم ڕستانەدا.

ا- ئێمە ناردوومانە بۆ بەغا.

ب- ئێمە ناردومانەتە بەغا.

ج- ئێمە ئازادمان ناردۆتە بەغا.

ئەگەر ڕەگی فرمان بەبزوێن Vowel کۆتایی هاتبێ [وو]ی نیشانەی کاتی ئێستای تەواو بەکپ خۆی دەردەخا و (ـە) ناتوێتەوە وەک لە هێنان - دان بڕین... هتد .

ب- ئەولن داویانەتە ئازاد.

ا- ئێمە هێناومانە بۆ بەغا.

ب- ئێمە هێناومانەتە بەغا.

ج- ئێمە ئازادمان هێناوەتە بەغا.

(hênâ wata)

٢- ئێوە زۆر ڕووتان داوەتە ئەو.

(dâwata)

٣- تۆ چاوت بڕیوەتە ئەو.

(brîwata)

لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕ ئەم یاسایە تەنیا لەگەڵ بکەری کەسی سێیەمی تاکدا دەردەکەوێ چونکە لەم حاڵەتەدا ڕاناوی لکاو هیچ نیشانەیەکی نییە.

ا- گەر ڕەگ کۆتایی بەکپ هاتبێ وەک لە (ڕۆیشتن)دا.

ئازاد ڕۆیشتووەتە بازاڕ.

ب- گەر ڕەگ کۆتایی بەبزوێن هاتبێ وەک لە (پەڕین)دا:

ئاسن پەڕیوەتە چاوی (Pâřîwata).

دووەم: ئەگەر فرمانی لێکدراو بەپاشگری (-ەوە) بخرێتە کاتی ئێستەی تەواو تەواو، [ت] لە نێوان (ە)ی نیشانەی کات و (ە)ی (-ەوە)دا دەردەکەوێ و هەمان ئەو یاسایانەی لەسەرەوە باس کران بەسەریا دەسەپێ.

خواردوومەتەوە ←——— ئاوم خواردۆتەوە

**یاسای دەرکەوتنی (تی):**

کە ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک (ی) لەگەڵ (ە)ی فرمانی بێ هێز دەکەونە پاڵ یەک مۆرفیمی پووچ empty morphem (تی) دەردەکەوێ:

من خوێندوومە

تۆ خوێندووتە

ئەو خوێندوویە(تی)

ئێمە خوێندوومانە

ئێوە خوێندووتانە

ئەوان خوێندوویانە

**یاسای دەرکەوتنی (ی):**

لە ئەنجامی لێکدانی مۆرفیمەکان ئەگەر دوو بزوێن کەوتنە پاڵ یەک، بەشێوەیێکی گشتی (ی) لە نێوانیانا دەردەکەوێ.

مامۆستا + ان ——→ مامۆستایان

چەقۆ + ەکە ——→ چەقۆیەکە

ڕێ + ەکە ⟵ ڕێیەکە

ئەم پەنجەرە + ە ⟵ ئەم پەنجەرەیە

لە هەندێ حاڵەتا یەکێ لە بزوێنەکان دەتوێتەوە و پێویست بە(ی) ناکات:

أ- ئەگەر دوو (ـە) کەوتنە پاڵ یەک بەمەرجێ (ـە)ی دووەم ئەرکی ڕێزمانی نەبێ:

پەنجەرە + ەکە ⟵ پەنجەرەکە

بەڵام لەم نموونانەی خوارەوە ناتوێتەوە چونکە (ـە)ی دووەم ئەرکی ڕێزمانیـیان هەیە (ی) لە نێوانیانا دەردەکەوێ:

ئەمە ئەستێرە + ە ⟵ ئەمە ئەستێرەیە

ئەم پەنجە + ە ⟵ ئەمە پەنجەیە

ئازاد گەورە + ە ⟵ ئازاد گەورەیە

ب- ئەگەر دوو بزوێن کەوتنە پاڵ یەک و یێکێکیان کورت و ئەویتریان درێژ کورتەکە دەتوێتەوە:

منداڵەکە + ان ⟵ منداڵەکان

ج- ئەگەر دوو (ی) کەوتنە پاڵ یەک... لەناو یەکتردا دەتوێنەوە و دەبن بەیەک (ی):

ئێمە قوتابی + ین ⟵ ئێمە قوتابین

د- ئەگەر ڕاناوی لکاو (ین ـ یت) لەگەڵ ڕەگی فەرمان (یا وشەیێ) دەرکەوت بەبزوێن کۆتایی هاتبێ (ی) ڕاناو شێوەی کپ consonant دەگرێتە خۆ:

تۆ سووتایت sût-â-yt

ئێمە ئازاین âz-â-yn

ئەگەر ڕەگی فرمان بەکپ کۆتایی هاتبێ (ی)ی ڕاناو شێوەی بزوێن دەگرێتە خۆ:

تۆ پیاویت Pyâw-ît

ئێمە هاتین hât-în

پەراوێزەکان:

١- (ێ) ڕەگــی داهاتــووی (هاتن)ە، کــە (دە)ی لەگــەڵا دەردەکــەوێ (ــــە) دەتــوێتــەوە. (دە + ێ + م ـــــ◄ دێم). داخوازییەکەی (وەرە) ناوێژەیە لە هەندێ شێوەدا بەیاسا وەردەگیرێ.

بـ + ڕەگی داهاتوو

بـ + ێ ـــــــــ بێ

بـ + ێ + ن ـــــــــ بێن (کۆ - وەرن)

لەوانەیە لە بناغەدا (هێ) ڕەگی داهاتووی (هاتن)بێ، بۆ سووککردنەوە سواوە و تواوەتەوە (دە + هێ + م ـــــــ◄ دەهێم). لە کرمانجی ژووروودا ئەم (هێ)یە ماوە.

ئەز دهێم

٢- بۆ پێشبەندەکان و پەیوەندییان بەڕاناوی لکاوەوە و یاسای گۆڕینیان سەیری سەرچاوەی ژ (٣) بکە.

٣- ئێستای تەواو Present Perfect: ئەو کارەیە کە ڕووی دا و تەواو بوو بەڵام تەنسیری مایە ئێستا. یاساکەی ئەمەیە.

[ڕەگی ڕابردوو + وو + ڕاناوی لکاو + ـە] (لەگەڵ تێنەپەڕدا (ـە) تەنیا) لەگەڵ کەسی سێیەمی تاکدا دەردەکەوێ.

| لەگەڵ تێپەڕدا | لەگەڵ تێنەپەڕدا |
|---|---|
| من خواردوومە | من نوستووم |
| تۆ خواردووتە | تۆ نوستوویت |
| ئەو خواردوویەتی | ئەو نوستووە |
| ئێمە خواردوومانە | ئێمە نوستووین |
| ئێوە خواردووتانە | ئێوە نوستوون |
| ئەوان خواردوویانە | ئەوان نوستوون |

بۆ یاساکانی کاتەکانی زمانی کوردی سەیری ئەم باسە بکەن.

وریا عـومـەر ئەمین (١٩٨٦) هەندێ یاسـای مـۆرفـۆلۆجـیی داڕشـتنی فـرمـان. گ. ڕۆشنبـیـری نوێ ژ (١٠٩).

سەرچاوەکان:

١- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) یاسایێکی فۆنۆلۆجی، گ. ڕۆژی کوردستان ژ (٦٦).

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) یاسای دەرکەوتنی (ر)، گ. ڕۆژی کوردستان ژ (٧٢).

٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) پاشبەندەکان، گ. کۆڕی زانیاری، ژ (١٥).

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٦) ساڵی ١٩٩٥، لاپەڕە ٦٦-٦٩ بڵاوکراوەتەوە.

# رەخنەی نارەخنە

* مامۆستا محەمەد مەعروف فەتاح لە باسێکیدا ئەڵێ «کاری سادە لە کوردیدا نییە»[١]. د. ئاورەحمانی حاجی مارف ئەمە بەڕاست نازانێت و لە وتارێکی ڕەخنەییدا[٢] بەپێی بۆچوونی خۆی هەوڵ ئەدات پێچەوانەی ئەمە ساغ کاتەوە. لە بارەی ئەم باسەیەوە چەند تێبینییەک پێشکەش ئەکەم.

* بەپێی پێڕەوە تازەکانی زمانەوانی و مەنتیقی پەیوەندیی نێوان کەرەسەکانی زمان، کاری سادە نەک هەر لە کوردیدا، بەڵکو لە هیچ زمانێکا نابێ هەبێ.

* (ڕابردوو) و (داهاتوو) دوو چەمکی سیمانتیکیی جیان و سەر بەکەرەسەی گشتی universal features[٣] زمانن. بۆیە ئەبێ مۆرفیمی کاتی ڕابردوو و داهاتوو لە هەموو زمانێکا هەبن. ئەم مۆرفیمانە لە هەر زمانێکدا بەجۆرێ خۆیان لە سیمادا Surface structure دەرئەخەن.

* لە زمانی کوردیدا بەشێکی ئەم مۆرفیمانە قالبی ئاشکرایان Overt Form هەیە. بەشەکەی تر کە ڕێژەییێکی کەمە[٤]، لەو جۆرەن کە بەضمنی implicit ناو ئەبرێن. وەک [هێشت - هێڵ/ وت - ڵێ/ دروو/ بیست/مان - مێن... هتد] ئەمانە لە ڕێی شیکردنەوەی سیستەماتیکی و دەستنیشانکردنی پەیوەندیی سیمانتیکی نێوان کەرەسەکانی زمان لە بنجدا Deep structure ساغ ئەکرێنەوە. ئەمە لە دەسەڵاتی پێڕەوی (تقلیدی)دا نییە چونکە ئەم پێڕەوە هەر دیوی دەرەوەی زمان ئەبینێ و سەیری زمان ناکات وەک سیستەمێکی ئاڵۆزی فرە ڕووی پەیوەندیدار. بۆیە هەر لێکۆڵینەوەیەکی زمان بەپێی ئەم پێڕەوە ساکار دەرئەچێ.

* لە زمانی کوردیدا شەش حەوت کار هەن کە ڕەگی ڕابردوو و داهاتوویان هاودەنگن. د. ئاورەحمان ئەمەی کردۆتە بەڵگەی هەرە بەهێزی بۆ سەلماندنی ڕاکەی و ئەڵێ ئەمانە «کە لەیەک کاتدا ڕەگیش بن و قەدیش بن ئەوە بێ بیرکردنەوە دەزانین لە یەک مۆرفیم پێکهاتوون»[٥]... بۆ ئەمە ئەڵێم:

١- دەربڕینی (بێ بیرکردنەوە) لە زانستا نییە و جێی نابێتەوە و نابێ خاوەن ناسناوی ئاکادیمی ئەم جۆرە دەربڕینانە بەکاربهێنێ و بێ بیرکردنەوە بڕیار بدات. مێژووی زانست

بۆمان ئەگێڕێتەوە کە زۆر دیاردە بۆ هەزاران ساڵیش بەراستیی زەق زانرابوو. لە ئەنجامی بیرکردنەوەدا دەرکەوت وانییە[٦].

٢- دەرنەکەوتنی مۆرفیمی کات لەگەڵ شەش حەوت کاردا ناکرێ بەقیاس بۆ زمانێ... ئەمە وەک ئەوە وایە بڵێین ڕاناوی لکاو لە زمانی کوردیدا نییە چونکە لەگەڵ کەسی سێیەمی تاکی ڕابردووی تێنەپەڕدا ڕاناوی لکاو هیچ سیمایێکی نییە و دەرناکەوێ.

٣- ژمارەیێکی زۆر کار لە کوردیدا مۆرفیمی (ڕابردوو) و (داهاتوو)یان بەپێڕەوی ڕووبەڕووکردنی مۆرفۆلۆجی[٧] morphological identifcation بەئاسانی لە ڕەگ جیا ئەکرێتەوە. وەک (سووتا - سووتێ، برژا - برژێ، زا - زێ، خنکا - خنکێ، گریا - گریێ) و زۆری تر..! لەمانەدا (سووت - برژ - ز - خنک - گر) ڕەگن. (ا) و (ێ) مۆرفیمی کاتی ڕابردوو و داهاتوون.

* ئەوەی ساغی ئەکاتەوە کە (ا) و (ێ) مۆرفیمی ڕابردوو و داهاتوون.

أ- داڕشتنی بکەر دیار و نادیارە.[٨]

ب- ڕەگی کاری (دالی) بکرێ بەداهاتوو (ا) ئەبێتە (ێ) [چاند - چێن، سپارد - سپێر، نارد - نێر... هتد][٩].

ج- لە کردنی تێنەپەڕ بەتێپەڕ و داڕشتنی کار لە ناوی سروشتییەوە (اند) بۆ ڕابردوو (ێن) بۆ داهاتوو ئەخرێتە سەر ڕەگ و ناوە سروشتییەکە... لەمانەشا (ا) لە ڕابردوودا و (ێ) لە داهاتوو سەر دەرئەهێنن.

٤- ژمارەیێکی زۆر ڕەگ هەن کە مۆرفیمی ڕابردوویان ئاشکرایە بۆ کردنی ئەمانە بەداهاتوو ئەم مۆرفیمە لادەبرێ.

دەخەوتم / دەخەوم ت ـ Ø

دەخزیم / دەخزم ی ـ Ø

دەمهێنا / دەهێنم ا ـ Ø

* ئەمانە بەپێرەوی نیشانەدار - بێ نیشانە - Marked Unmarked لێک جیا ئەکرێنەوە. وەک لە زمانی ئینگلیزیدا I walked ڕۆیشتم و I walk ئەڕۆم) کاری ڕستەی یەکەم مۆرفیمی ڕابردووی لەگەڵا دەرکەوتووە... لە داهاتوودا هیچ نیشانەیەکی دیاری نییە.

٥- (دروو - گروو - بەست - بیست... هتد) لەو کارانەی زمانی ئینگلیزی ئەکەن کە نە لە ڕابردوو نە لە داهاتوودا هیچ نیشانەیێکی کاتیان لە سیمادا لەگەڵا دەرناکەوێ shut, Put, cut... هتد.

* باری هەڵوێست Contex of situation یا پەیوەندیی سیستەماتیکی نێوان بەشەکانی ڕستە (ڕابردوو) لە (داهاتوو) لە سیمادا جیا ئەکاتەوە بۆ نموونە دەرکەوتنی ناوەڵفرمان yesterday I cut my Finger / Often I cut my Finger.

لە کوردیدا سیستەمی ڕاناوی لکاو ئەم دەورە ئەگێڕێ و ڕابردووی ئەم جۆرە فرمانانە لە داهاتوو یان لە سیمادا جیا ئەکاتەوە (دەماندروو - دەدروویین)[١٠].

٦- ئەگەر ئەم کەرەسە سیمانتیکیانە بوونیان نەبێ چی (ڕابردوو) لە (داهاتوو) جیا ئەکاتەوە... هەر کەرەسەیێکی سیمانتیکیش نەبێ مۆرفیمێکی هەبێ بینوێنێ واتا ئەبێ ئەوەی بە(قەد) و (ڕەگ) ناو ئەبرێن هەریەکە لە دوو مۆرفیم پێک هاتبێ و نابێ سادەبن.

* ئەمانە هەموو بۆ ئەکرێن بەبەڵگەی هەبوونی شتێکی (ملموس) و شەش حەوت نموونە

بکرێن بەبەڵگەی نەبوونی ئەم شتە هەست پێکراوە مەنتیقییە کە تەنانەت لە پێڕەوی تەقلیدیشا ئەخرێتە خانەی (تاوێزە)کانەوە...؟

٧- ئەوەی ئاگاداری دوا پەرسەندنەکانی قوتابخانەی چۆمسکی بێ ئەزانێ کە بەپێی ئەم پێڕەوە سادەترین کار نەبێ بەلای کەمی لە سێ مۆرفیم پێک هاتبێ نەک (یەک و دوو).

١- مۆرفیمی ڕەگ stem.

٢- مۆرفیمی کات tense.

٣- مۆرفیمی جۆری کات Aspect.

لە بارەی ئەمەوە چی ئەڵێن؟

* د. ئاورەحمان لەم باسەیا زۆر تەئکید لەسەر پێڕەوی زانستی ئەکات کەچی نەیتوانیوە تیایا خۆی بەئاسانترین مەرجەکانی ببەستێتەوە. بۆ ئەوەی لە دوور یا نزیکەوە هیچ پەیوەندییەکی بەناوەرۆکی ڕەخنەکەیەوە هەبێ ناوی وتارێکم (یاسایێکی فۆنۆلۆجی)[11] کە سیانزە ساڵ لەمەوبەر بڵاوکراوەتەوە ئەخزێنێتە ناو باسەکەیەوە و لەگەڵ باسێکی مامۆستا مەسعود محەمەددا بەراوردی ئەکات کە لە بارەی کرداری (انتقالي)[12] دایە کە ئەمیش پەیوەندیی بەباسەکەیەوە نییە و بڕیاری ئەوەش ئەدات کە ئەوەکەی من لە چاو هی ئەو کزە.

١- وەک دەرئەکەوێ د. ئاورەحمان ئەختێ بەپەلە سەیری کردووە.

* باسەکەی من (بەناو و ناوەرۆکەوە) لە بارەی دەنگسازییەوەیە. بەقەد پێویستی سێ چوار نموونەم هێناوەتەوە کە چەمکی گوێزانەوە ئەگەیەنن بۆ شیکردنەوە و گەیشتنە یاسا دەنگییەکە کە ئامانج و ئەنجامی وتارەکەیە. بەهیچ جۆر تخون پۆل کردن و ڕووی کێشەداری ئەم لایەنە ناکەوم.

* باسەکەی مامۆستا مەسعود محەمەد شتێکی ترە و بەهیچ جۆرە خۆی لە دەنگسازی نادات.

ئەو پرسیارەی ئاراستەی د. ئاورەحمان ئەکرێ لێرە ئەوەیە... کام پێڕەوی زانستی ڕێ ئەدات لە وتارێکی ڕەخنەییدا دوو بابەتی جیاواز بەراورد بکرێن و حوکمیان لەسەر بدرێ کە هەریەکە لە بارەی شتێکەوە بن و هیچ پەیوەندییان بەناوەرۆکی ڕەخنەکەوە نەبێ...؟

٢- لەم باسەدا من یاسایێکی دەنگیی زمانی کوردی دەستنیشان ئەکەم و (وەک من بزانم) دۆزینەوەی خۆمە و پێشتر باس نەکراوە.

٣- د. ئاورەحمان ئەڵێ لەم باسەدا سەرچاوەم بەکار نەهێناوە. لەم وتارە یەکجار کورتەمدا (لاپەرەیێک و نیوە) ئەنجامێکی شیکردنەوەی خۆم ئەخەمە روو. باسی شتێ ئەکەم پێشتر باس نەکراوە، سوودم لە هیچ سەرچاوەیێک وەرنەگرتووە... بەکارهێنانی سەرچاوە لە بواری زانست و مەنهەجییەتدا هونەری خۆی هەیە و لاپەرە رەشکردن نییە. با د. ئاورەحمان ئەنجامەکەم هەڵسەنگێنێ و بڵێ لە کوێ پێشتر باس کراوە و ئەم یاسایە دەستنیشان کراوە. ئەوسا من سەرچاوەکانی بۆ ریز ئەکەم.

٤- د. ئاورەحمان لە زۆر شوێنا دەربرینی (تێر و تەسەل) بەکارئەهێنێ. تێر و تەسەلی لە زانستا مەوزووعییەت و راستی دەرخستن و گەیشتنە یاسا و ئەنجامی تازەیە بەکورتترین رێگا.

٥- لەم باسەمدا من (گوێزانەوە)م وەک زاراوە بەرامبەر بە(انتقالي) بەکار نەهێناوە وەک د. ئاورەحمان بۆی چووە... من ئەڵێم... (لەو فرمانانەی کە چەمکی گوێزانەوە ئەگەیەنن... هتد). ئەم وتووە (فرمانی گوێزانەوە)... تا وەک زاراوە بەکاری بهێنم ئەم دوو دەربرینە زۆر جیاوازن.

٦- (گوێزانەوە) و (گواستنەوە) هەردووک تێپەرن و (گواستنەوە) تێنەپەر نییە.

لە کۆتاییدا ئەڵێم. ئەم جۆرە رەخنانە باویان نەماوە... ئیمرۆ لە زمان کۆڵینەوە فەلسەفە و بیر و پێرەو و زانست و هونەرە و... هەر کارێکی زمانەوانی بێ ئەساسی ئەزەری دەنگی بێ رەنگە...

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

١- محەمەد مەعروف فەتاح (١٩٨٩) کار پۆلینکردن بەپێی رۆنان، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژ (١٢١).

٢- ئاورەحمانی حاجی مارف (١٩٩٧) وتاری کارپۆلینکردن بەپێی رۆنان و چەند سەرنجێک، گ. رۆشنبیری نوێ ژ (١٣٩).

٣- مەبەست ئەو کەرەسە زمانییانەن کە هەموو زمانانی جیهان تیایانا بەشدارن.

٤- بۆ یاساکانی وەرگرتنی رەگی کار لە زمانی کار لە زمانی کوردیدا و رێژەی ئەوانەی بەیاسا رەگەکانیان دەستنیشان ئەکرێ سەیری ئەم باسە بکەن: وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) کات و رەگی فرمان، گ. رۆژی کوردستان ژ (٦٥).

ئەم یاسایانەم بەشێوەیێکی راستتر و پوختتر دووبارە لەم وتارەدا پێشکەش کردۆتەوە.

وریا عومەر ئەمین (١٩٩٢) نیشانەکانی کات لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کاروان ژ (٩٢).

٥- پەراوێزی ژ (٢) ل ٨.

٦- بۆ ئەم جۆرە بەرکردنەوەیە لە مێژووی زانستا سەیری ئەم وتارەم بکەن (شۆڕشی کۆپەرنیکی) ڕۆژنامەی (العراق) ڕۆژی ١٩٨٧/١/٧.

٧- بۆ ئەم پێرەوە لە مۆرفۆلۆجیدا سەیری ل(٦٥-٧٧)ی ئەم کتێبە بکەن:

Gleason, A. H. (1965) An Introduction to descriptive Linguistie.

٨- بۆ ئەمە سەیری ئەم باسەم بکەن:

وریا عومەر ئەمین (١٩٩٢) لە پەیوەندییەکانی بکەر نادیار، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ (١٢٩).

٩- سەیری پەرلوێز ژ (٤) بکە.

١٠- ئەم گیروگرفتە مۆرفۆلۆجییانەی زمانی ئینگلیزی و زۆر لە زمانانی تری جیهان، لە پێڕەوی (بنوی)یەتدا Structuralism زۆر باس کراوە و پێوانە بۆ هەر حاڵەتێک دانراوە... سەیری (١٠٧-١٣٤)ی ئەم کتێبە بکە.

Palmar. F. (1971) Grammar Pelican

١١- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) یاساییەکی فۆنۆلۆجی، گ. ڕۆژی کوردستان ژ (٦٦).

١٢- مەسعوود محەمەد (١٩٧٦) چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی - بەغداد.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤٠) ساڵی ١٩٩٧، لاپەڕە ٢٢-٢٤ بڵاوکراوەتەوە.

# ڕێزمانی هەیی لە زمانی کوردیدا

* دوو شت گەر یەکێکیان سەر بەئەوی تر بێ... دەربڕینی ئەم جۆرە پەیوەندییە لە زمانا بەهەیی Possessive ناو دەبرێ. لەم باسەدا بەکورتی و چڕی چەند یاسایێکی ئەم لایەنەی زمانی کوردی[1] دەخرێتە ڕوو.

## ١- هەیی لەناو چوارچێوەی فرێزی ناویدا

* یەکێ لە یاساکانی داڕشتنی فرێزی ناوی لە زمانی کوردیدا ئەوەیە (فرێز لە ناوێ یا زیاتر پێک دێت)[2]. ئەگەر پەیوەندیی نێوان ناوەکان لەسەر بناغەی (هەیی)دابێ. ناوەکان بەئامرازی بەستن (ی) لێک دەدرێن. لەم حاڵەتەدا ناوی یەکەم سەر بەدووەم و دووەم سەر بەسێیەم... هتد دەبێ. وەک لەم ڕستانەدا.

١- کلیلی دەرگاکە ون بوو.

٢- من کلیلی دەرگای ژوورەکەم ون کرد.

٣- ئازاد دەرگاکەی بەکلیلی دەرگای ژوورەکەی من کردەوە.

* لە ڕستەی (١)دا فرێزی بکەری لە دوو ناو پێکهاتووە (کلیل و دەرگا) ناوەکان بەئامرازی بەستن (ی) لێک دراون. لە ڕووی پەیوەندیی سیمانتیکییەوە ناوی یەکەم سەر بە هی دووەمە.
* لە ڕستەی (٢)دا فرێزی بەرکاری لە سێ وشە پێکهاتووە (کلیل و دەرگا و ژوور)... ناوەکان بەئامرازی بەستن (ی) لێک دراون... لە ڕووی پەیوەندیی سیمانییکییەوە... ناوی یەکەم سەر بە هی دووەمە و دووەم سەر بە سێیەمە...
* لە ڕستەی (٣)دا... فرێزی بەرکاری ناڕاستەوخۆ لە سێ ناو و ڕاناوێک پێکهاتووە... پەیوەندی لەنێوانیان وەک ئەوەی لە ڕستەی (١) و (٢) دایە.

## ٢- هەیی لە چوارچێوەی ڕستەی فرمان تەواودا[3]

* لە ڕستەی فرمان تەواودا... ئەگەر زیاتر لە ناوێ پەیوەندی یان لە بنجدا[4] Deep Structure لەسەر بناغەی (هەیی)دا بێ و هەر یەکە کەوتبێتە فرێزەکەوە... ناوە دووبارەکراوەکان بەجێناوی (خۆ + ڕاناوی لکاو) جێگیر دەکرێ. ڕاناوە لکاوەکە سەر

بەکۆمەڵی (م-ت-ی-مان-تا-یان) دەبێ و بەپێی کەس و ژمارەی ناوە جێگیرکراوەکە. وەک لە:

ئازاد کتێبەکانی خۆی دەفرۆشێت.

ئەم ڕستەیە لە بنجدا بەم جۆرەیە:

(ئازاد) لە فرێزی دووەمدا دووبارە کراوەتەوە بەپاسایێکی هەمان لابردن Equi de-letion ناوە دووبارەکراوەکە لادەبرێ و (خۆ + ڕاناوی لکاو) جێی دەگرێ و ڕستەکە لە سیمادا[٥] Surfac structure دەبێتە.

ئازاد کتێبەکانی خۆی دەفرۆشێت.

ڕستەی:

ئازاد کتێبەکانی خۆی دا بەبرای خۆی.

لە بنجدا بەم جۆرەیە:

(ئازاد) له فرێزی بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆدا دووبارەکراوەتەوە. بەهەمان جۆر (خۆ + ڕاناوی لکاو) جێیان دەگری. ڕستەکە دەگوێزرێتەوە سیما.

ئازاد کتێبەکانی (ئازاد)ی دا بەبرای (ئازاد)

ئازاد کتێبەکانی خۆی دا بەبرای خۆی.

دوو (ی) کەوتنە پاڵ یەک. یێکێکیان دەقرتێ.

## ٣- هەیی لە چوارچێوەی ڕستەی فرمان (بوون)دا Copulative

* لەم جۆرە ڕستانەدا کە ناوی خاوەن لە بنجدا لە فرێزی دووەمدا دووبارە دەبێتەوە بەیاسایێکی گوێزانەوە ناوەکە لادەبرێ و (هـ) شوێنی دەگرێ. بۆ نموونە ڕستەی:

ئەم خانووە هی ئازاد بوو.

لە بنجدا بەم جۆرەیە.

ئەم خانووە هی ئازاد بوو.

## ٤- چەووکی هەیی (هەبوون)

پێشگری (هە) دەچێتە سەر (بوون) و دەبێتە (هەبوون). ئەمە لەگەڵ کۆمەڵە ڕاناوی (م. ت. ی. مان. تان. یان)دا چەمکی هەیی دەگەیێنێ.

* لەگەڵ کەسی سێیەمی تاکدا لە کاتی ئێستادا (تی) دەردەکەوێ.

٥- وا باوە کە کۆمەڵە ڕاناوی لکاو (م، ت، ی، مان، تان، یان) ڕاناوی هەیین لە زمانی کوردیدا. ئەم کۆمەڵە لە ڕاستیدا ڕاناوی هەیی نین بەڕەسەن، بەڵکو بەپرۆسێزی گۆڕینی ڕاناوی جودا بەلکاو Cliticization ئەم ئەرکە ئەبینن وەک لە:

برای — من / تۆ / ئەو / ئێمە / ئێوە / ئەوان — برا — م / ت / ی / مان / تان / یان

پەراوێزەکان:

١- کرمانجیی خواروو.

٢- بۆ فرێز و یاساکانی دارشتنی لە زمانی کوردیدا سەیری سەرچاوە ژ (٥) بکە.

٣- مەبەست لە ڕستەی فەرمان تەواو نەوەیە جیا بکرێتەوە لە ڕستەی فرمان (بوون) کە هەندێ جار بەرستەی ناوی Copulative ناو دەبرێ.

٤- بۆ بنج deep structure و سیما surface structure سەیری سەرچاوە ژ (٤) بکە.

٥- (هەبوون) لەگەڵ ڕاناوی (م، یت، ە، ین، ن، ن) چەمکی (وجود) existential دەگەیێنێ.

| | | |
|---|---|---|
| من | | م |
| تۆ | | یت |
| ئەو | هە( بوو ) | ە |
| ئێمە | | ین |
| ئێوە | | ن |
| ئەوان | | ن |

بۆ ڕێزمان و ئەرکەکانی (هەبوون) سەیری سەرچاوە ژمارە (٥) ل٩٧-١٠٨ بکە.

سەرچاوەکان:

١- کۆڕی زانیاریی کورد (١٩٧٦) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) بیناغەی سادەترین ڕستەی کوردی، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١١).

٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٩) ڕێککەوتن لە زماندا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (٩١).

٤- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٩) بنج و سیما و یاساکانی گوێزانەوە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١٢١).

5- Waria Omar Amin (1979) Aspects of the Verbal construction in Kurdish. London university.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤١) ساڵی ١٩٩٨، لاپەڕە ٧-٨ بڵاوکراوەتەوە.

# پاشبەندی (ێ) لە ڕەخنەی ناڕەخنەدا

د. ئاوڕەحمانی حاجی مارف لە باسێکیدا[1] وای لە قەڵەم ئەدات کە من هەندێ بابەتی زمانەوانیی مامۆستا مەسعود محەمەد وەرگرتووە... و ... کردوومە بەماڵی خۆم و ناویم وەک سەرچاوە نەهێناوە.

وەک دەرئەکەوێ د. ئاوڕەحمان لەگەڵ ڕێزم بۆی بەوردی لە سروشت و ئەنجامی باسەکانی مامۆستا مەسعود محەمەد و هی من نەکۆڵیتەوە... ئەگینا شتی تری بۆ دەرئەکەوت.

بەزنجیرەیێک وتار یەکە یەکە موناقەشەیەکی زانستیی هەموو ئەو ڕەخنانەی د. ئاوڕەحمان ئەکەم بۆ دەرخستنی ڕاستی.

یەکەم وتارمان لە بارەی پاشبەندی (ێ)وە ئەبێ، کە مامۆستا مەسعود محەمەد لە کتێبی (چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی)[2]دا و من لە وتاری (پاشبەندەکان)[3]دا، باسی ئەکەم... بەلای د. ئاوڕەحمانەوە مامۆستا مەسعود یەکەم کەسە باسی ئەم پاشبەندەی کردووە... و... من لەوم وەرگرتووە...

***

یەکەم کەس باسی ئەو پێشبەندەی کردبێ (ئەدمۆنس)ە لە ساڵی ١٩٥٥دا لە وتارێکیدا بەناوی (پێشبەند و ڕاناوی لکاو لە کوردی خواردوودا)[4]. دوای ئەم لە ساڵی ١٩٦١دا د. مەکەنزی[5] باسی ئەم پاشبەندە ئەکات... بەڵام هیچ کامێکیان یاساکەیان دەستنیشان نەکردووە. لەوانەیە مامۆستا مەسعود محەمەد ئاگاداری ئەم سەرچاوانە نەبووبێ... ئەمیش لە لای خۆیەوە هەوڵی داوە ئەم دیاردەیە لێکداتەوە... ئەمیش ئەگەیشتۆتە ئەنجام.

لە ساڵی ١٩٨٦ لە وتاری (پاشبەندەکان)دا. یاسای دەرکەوتنی (ێ)م زۆر بەچڕی پێشکەش کردووە... لێرە بەشێوەیەکی فراوانتر پێشکەشی ئەکەمەوە و لەگەڵ بۆچوونەکەی مامۆستا مەسعود محەمەددا بەراوردی ئەکەم بۆ دەرخستنی جیاوازی نێوان ئەم دوو باسە.

***

دەرکەوتنی پاشبەندی (ێ) بەشێکە لە یاسای ڕێزمانی ڕاناوی لکاو. بۆیە سەرەتا ئەبێ ئەم لایەنەی ڕێزمانی کوردی بخرێتە ڕوو. زمانی کوردی[6] دوو دەستە ڕاناوی لکاوی هەیە. بەپێی کەس و ژمارە لەم نەخشەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو | |
|---|---|---|---|---|
| | | | ١ | ٢ |
| تاک | ١ | من | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | ø-یت/ات |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن |

کەسی سێیەمی تاک لە کۆمەڵی (٢)دا بۆ ڕابردوو هیچ قاڵبێکی ئاشکرای overt form نییە. لە داهاتوودا [یت / ات][7] دەردەکەوێ.

ئەم دوو دەستەیە هەردوو دەوری بکەری و بەرکاری لە دوو کاتی دژ یەکا ئەبینن. بەپێی ئەم یاسایە:

...... یاسا (١)

دە ـ ی ـ نێر ـ ێت      دە ـ ی ـ نارد ـ Ø
دە ـ مان ـ نێر ـ ن      دە ـ تان ـ نارد ـ ین
دە ـ تان ـ نێر ـ ین      دە ـ مان ـ نارد ـ ن
دە ـ یان ـ نێر ـ ین      دە ـ یان ـ نارد ـ ن

دەستەی (۲) هەمیشە بەرەگی کارەوە ئەلکێ. ... یاسا (۲)

دەستەی (۱) بەپێی قاڵبی ڕستەکە جێگۆڕکێ ئەکات.. بەبچووکترین ژمارەی ئەم بەشانەی ڕستەوە ئەلکێ:

...... یاسا ژ (۳)

واتا ئەگەر بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەکەدا ئامادەبوو ئەم کۆمەڵە ڕاناوە بەمەوە ئەلکێ... ئەگینا بەخاوەن ژمارە (۲)وە ئەلکێ و بەم جۆرە... لە ڕستەی:

ئێمە بۆ تۆ - مان (۳) نارد (۲).

بەرکاری ڕاستەوخۆ، کە ژمارە (۱)ە لەم ڕستەیەدا نییە... بۆیە بەبەرکاری ناڕاستەوخۆوە ئەلکێ، چونکە لەم ڕستەیەدا ئەمیان خاوەن بچووکترین و ژمارەیە.

لە ڕستەی:

من   بۆم   نارد
(۳)   (٥)

ڕاناوی کۆمەڵی (۱) بەژمارە (۳)وە لکا... چونکە پێشبەند لەم ڕستەیەدا خاوەن بچووکترین ژمارەیە.

***

بۆ گۆڕینی ڕاناوی جودای بەرکاری بەڕاناوێکی لکاو:

١- سەیری کاتی کارەکە ئەکەین... داهاتوویێ ڕوو لە کۆمەڵی یەکەم ئەکەین... ڕابردوو بێ لە کۆمەڵی دووەم.

٢- بەپێی کەس و ژمارەی ڕاناوە جوداکە، لکاوەکە هەڵئەبژێرین.

٣- بەپێی یاساکانی شوێن... شوێنی ڕاناوی لکاو لە ڕستەکەدا جێگیر ئەکرێ.

لە ڕستەی (تۆ ئێمەت بەئەوان ناساند).

بۆ گۆڕینی ڕاناوی جودای بەرکاری ڕاستەوخۆ (ئێمە) بە لکاو:

١- کاتی کارەکە ڕابردووە - واتا ڕاناوی لکاوی بەرکاری بەپێی یاسا ژمارە (١) لە کۆمەڵی (٢)وە وەرئەگیرێ (م، یت، ×، ین، ن، ن).

٢- (ئێمە) کەسی یەکەمی کۆیە. ڕاناوی لکاوی بەرامبەری لە کۆمەڵی (٢)دا... (ین)ە.

٣- (ین) جێی (ئێمە) ئەگرێ و بەپێی یاسای شوێن ژ (٢). بەرەگی کارەکەوە ئەلکێ لەم حاڵەتەدا (ت) کە ڕاناوی لکاوی بکەرییە و سەر بەکۆمەڵی (١)ە... بەرەڵلا ئەبێ... بەپێی یاسای (٣) ئەم کۆمەڵە ئەگەر بەرکاری ڕاستەوخۆ ئەما بەبەرکاری ناڕاستەوخۆوە ئەلکێ... ئەم گوێزانەوەیە لەم ڕستەیدا بەم جۆرە ئەبێ:

بۆ گۆڕینی ڕاناوی جودای بەرکاریی ڕاستەوخۆ بە لکاو لە ڕستەی:

***

لە ئەنجامی گۆڕینی ڕاناوی جودای دوای پێشبەندی (بە - لە) هەندێ گۆڕانکاری لە شێوەی ئەم پێشبەندانە ڕوو ئەدات کە ئەمانەن:

یەکەم: ئەگەر ئەو ناوە یا ڕاناوە جودایەی دوای پێشبەندی (بە ـ لە) کرا بەلکاو:

بە ئەبێتە پێ

لە ئەبێتە لێ

ئێمە بە تۆ مان سپارد

پێ بەرکار بکەر ڕابردوو

(٢) (١)

یت

یاسا (٢)

ئێمە پێمان سپاردیت

دووەم: لەگـەڵ هەندێ کـاردا... ئەگـەر ئەو ناوە یا ڕاناوەی دوای پێـشـبـەندی (لە) کـرا
بەلکاو... (لە) ئەبێتە (تێ).

سێیەم: لەگەڵ بەشێ لەو کارانەی چەمکی گوێزانەوە ئەگەیەنن وەک (دان - گەیشتن -
گرتن... هتد) ئەگەر ئەو ناوە یا ڕاناوە جودایەی دوای پێشبەندی (بە - لە) ئەم
پێـشـبـەندانە ئەبن بەپاشـبـەند و قـاڵبی (ێ) ئەگـرنە خۆ و بەکۆتایی کـارەکەوە
ئەلکێن:

من ئەو یاسایەم لە وتاری (پێشبەندەکان)دا بەم جۆرە دارشتووە [لەگەڵ فرمانی (دان - گەیشتن.. هتد) ئەگەر ئەو ناوە یا راناوەی دوای پێشبەندی (بە) دەرئەکەوێ بەراناوێکی لکاو دەربرا پێشبەندی (بە) ئەبێتە پاشبەندێکی فەرمانی و قاڵبی (ێ) ئەگرێتەخۆ][8].

ئێستا دێینە سەر بۆچوونەکەی مامۆستا مەسعود محەمەد و بزانین تا چ رادەیێک تیایا سەرکەوتوو بووە.

مامۆستا مەسعود محەمەد لە (چەند حەشارگەیێکی رێزمانی کوردی)دا باسی پاشبەندی (ێ) ئەکات و ئەڵێ... [لەوەدا لە حاڵی بزربوونی مفعول بزوێنەکە دەبێتە

(ێ)...] تا دێته ل ٥٦ و ئەڵێ «دەرکەوتنی مفعول لە وێنەی ڕاناوی لکاو مەنعی هاتنی (ێ) کە ناکات».

لەگەڵ ڕێزم بۆ مامۆستا مەسعود ئەم بۆچوونە دوورە لە ڕاستی لەبەر ئەم هۆیانە:

١- بزوێنەکە نییە ئەبێتە (ێ)، بەڵکو پێشبەندە بەدوو جۆر یاسای گوێزانەوەی جیا جارێ ئەبێتە (ـە)[٩] و جارێ ئەبێتە (ێ). و بوونی پێشبەند بە(ێ) پەیوەندیی بەسیستەمی ڕاناوی لکاوەوە هەیە... بەڵام بوونی بە(ـە) هیچ پەیوەندییەکی بەڕاناوی لکاوەوە نییە:

ئەو دای بەتۆ ——— ئەو دایە تۆ

ناردم بۆ سلێمانی ——— ناردمە سلێمانی

٢- (کە زۆر گرنگە) بزربوونی مفعول نییە ئەیکات بە(ێ)، بەڵکو گۆڕینیەتی بە لکاو.

وەک لە سەرەوە ڕوونکرایەوە کۆمەڵە ڕاناوی (م، یت، ×، ین، ت، ن) دەوری بەرکاری لەگەڵ ڕابردووی تێپەڕا نەبینن.

لەم کۆمەڵەدا کەسی سێیەم هیچ قاڵبێکی ئاشکرای نییە (ئەممەت بیرنەچێ)، بۆیە ئەگەر ئەو ناوە یا ڕاناوەی دوای هە ج پێشبەندێ لە کەسی سێیەمی تاکدا بێ و بکرێ بە لکاو هیچ سیمایێکی بۆ دەرناکەوێ.

نموونەکەی مامۆستا مەسعود لەم جۆرەیە:

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە، سەیری هەموو ئیحتمالەکان بکە (بەپێی نموونەکەی مامۆستا مەسعود محەمەد).

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | من | | م | |
| | تۆ | | یت | |
| بەردی گرتـ... ـە | ئەو (چۆلەکەکە) | گرت ⟵ | Ø | + ێ |
| | ئێمە | | ین | |
| | ئێوە | | ن | |
| | ئەوان | | ن | |

لە داهاتوودا دەوری ڕاناوەکان ئاڵوگۆڕ ئەبێ و کۆمەڵی (م، ت، ی، مان، تان، یان) دەوری بەرکاری ئەبینن.. لەم کۆمەڵەدا ڕاناوی لکاوی کەسی. سێیەمی تاک قاڵبی ئاشکرای هەیە (ی)

واتا نموونەکەی مامۆستا مەسعود محەمەد بکرێ بەداهاتوو ڕاناوە لکاوەکە نەبێ دەرکەوێ ئەگینا ڕستەکە لە ڕێزمانێتی ئەکەوێ.

(بەرد دەگرێتێ) ڕستەیەکی ناڕێزمانییە.

ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ڕاناوی لکاو لەم جۆرە ڕستانە نەبێ دەرکەوێ obligatory.

نموونەکەی مامۆستا مەسعود محەمەد بکرێ بە کۆ... هەموو شت ئاشکرا ئەبێ.

لەبەر ئەوەی مامۆستا مەسعود محەمەد ڕستەی (بەردم گرتە چۆلەکەکە)ی کردۆتە بەلگە بۆ بۆچوونەکەی. بۆیە وای بۆ چووە کە بزربوونی مفعول (لە) ئەکا بە(ێ).

بەداخــەوە ئەلێم د. ئاوڕەحـــمـــان لەم بۆچوون و بڕیارەیدا ئەخـــتێ پەلەی کـــردووە و بۆچوونەکەی مامۆستا مەسـعود محەمەدی بەڕاسـتیـیەکی مطلق لە قەلەم داوە و بڕیاری ئەوەی داوە من لەوم وەرگرتووە... ئەمە دژی هەموو جۆرە پێڕەوێکی زانستییە.

سەرچاوە و پەراوێز:

١- لە ژمـارە ١٤٠ای سـالی ١٩٩٧ی گـۆڤـاری ڕۆشنبـیـری نوێدا بەناوی (ڕەخنەی ناڕەخنە)وە هەندێ تێبینیم لە بارەی وتارێکی د. ئاوڕەحمانەوە کە لە بارەی باسێکمەوە بوو خستبووە ڕوو. د. ئاوڕەحمان بەباسێکی دوور و درێژ بەناوی (ڕەخنەی ناڕەختە)وە وەلامی داوەتەوە...

٢- مەسعود محەمەد (١٩٧٦) چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی... بەغداد.

٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) پاشبەندەکان - گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق - دەستەی کورد بەرگی ١٥.

4- Edmonds, C. J. (1955), Prepositions and Personal affixes in southren Kurdistan BSOAS XVII 490.

5- Mackenzie, D. N. (1961) Kurdish dialect studies V. I. London.

٦- کرمانجی خواروو.

٧- بۆ (ێت- ات) سەیری ئەم باسەم بکە. وریا عومەر ئەمین (١٩٩٨) ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک - ڕۆژنامەی هاوکاری ژ ٢٨٦١ ڕۆژی ١٩٩٨/٣/٨.

٨- بەراوێز ژ (٣) ل.
٩- د. ئاورەحمان لە ڕەخنەکەیا لە بارەی پاشبەندی (ـە)وە ئەڵێ «مامۆستا مەسعود محەمەد لە کۆتایی ل ٥٤دا ئەوەی یادداشت کردووە کە بەشێک لە کردارەکان هەڵناگرن (ـە) (یان بگۆڕێ بەپێشبەند، هەرچی د. وریاشە ئەو دەربڕینەی پاش و پێش کردووە».
من بەپێی پێرەوی گوێزانەوەی چۆمسکی سەیری زمان ئەکەم و لایەنەکانی زمانی کوردی شی ئەکەمەوە... ئەم پێرەوە دوو ئاست جیا ئەکاتەوە (بنج) و deep structure و (سیما)-Surface struc-ture دەستەیێک یاسای گوێزانەوە Transformational بنجەکە ئەگوێزنەوە سیما... پێشبەند سەر بەبنجە و (ـە) سەر بەسیمایە... واتا پێشبەندە و پاشبەندی لێ وەرئەگیرێ.. ڕاکەی مامۆستا مەسعود محەمەد پێچەوانەی ئەو پێوانەیە من کاری پێ ئەکەم..
١٠- Pronominolization ڕاناواندن... لە پێرەوی چۆمسکیدا جێگیرکردنی ڕاناو لە جێی ناوێ یا فرێزێکی ناوی.
Cliticization جێگیرکردنی ڕاناوێکی لکاوە لە جێی جودا. بۆ ئەمانە سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە.
Waria Omar Amin (1979) Aspects of the verbal Constraction in Kurdish - London University.

خاڵێکی تر لە ڕەخنەکەی د. ئاورەحماندا کە پەیوەندیی بەمامۆستا مەسعود محەمەدەوە هەیە ئەوەیە ئەڵێ گوایا من لە وتاری (ڕەخنەی ئاڕەخنەدا)دا قسەی ناشیرینم بەمامۆستا مەسعود محەمەد وتووە... ئەو گۆڤارەی کە ئەم وتارەی تیا بڵاوکراوەتەوە هێشتا مەرەکەبەکەی وشک نەبۆتەوە... با خوێنەری بەرێز سەیرێکی بکات و بزانێ چییە.
ئەوەندەی من لەم وتارەدا باسی مامۆستا مەسعود محەمەد ئەکەم ناوی ئەهێنم هەر ئەوەیە ئەڵێم «باسەکەی من بەناو و ناوەرۆکەوە لە بارەی دەنگسازییەوەیە و باسەکەی مامۆستا مەسعود محەمەد شتێکی ترەوە بەهیچ جۆر خۆی لە دەنگسازی نادات» لەمە زیاتر هیچ ناڵێم و بەهیچ جۆر ناوی ناهێنمەوە.
لە کۆتایی وتارەکەدا... وەک ئەنجامێک ئەوە دەرئەخەم کە «لەم باسەدا یاسایێکی دەنگیی زمانی کوردی دەستنیشان ئەکەم و وەک من بزانم دۆزینەوەی خۆمە و پێشتر باس نەکراوە و بەشێوازێکی زانستی دوور لە سەلەفییەتی درێژدادڕی بێ سوود ئەنجام پێشکەش کراوە... ئەبوو د. ئەورەحمان واقیعی بوایە و ئەمەی دەربخستایە». لێرە من وەسفی وتارەکەم ئەکەم... ئەمە چ پەیوەندییەکی بەمامۆستا مەسعودەوە هەیە و چی مامۆستا مەسعودی هێنایە سەر ئەمە.
ئەوەی مایەی دڵخۆشییە ئەوەیە د. ئاورەحمان دوای ئەمە هەموو دان بەوەدائەنێ کە باسەکەی من و مامۆستا مەسعود دوو بابەتی جیاوازن و ئەمجارە لە بارەیە ئەڵێ: «ئەگەر بیوتایە تەنیا لە سلێمانی و چەند ناوچەیەکی کەمی دی ئەم دیاردەیە دەبینرێ ئەوە ڕەخنەی ئەدەهاتە سەرە» ل٣.
د. ئاورەحمان چەند جارێ لەبەردەم مامۆستا و قوتابییانی خوێندنی باڵا ئەوەی دووبارە ئەکردەوە کە نامەکانی ماجستێر و دکتۆرا هەموو (وریانامە)ن، چونکە زۆربەی زۆری سەرچاوەکانیان وتار و باس و لێکۆڵینەوەکانی منن.. کەچی لەم ڕەخنەیەیدا پێچەوانەی ئەمەی دەرخستووە.

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤٢) ساڵی ١٩٩٨، لاپەرە ١٥-٢٠ بڵاوکراوەتەوە.**

# بەراوردییەک

ڕاناوە جودا و لکاوەکانی زمانی کوردیی (خواروو)[١] بەپێی کەس و ژمارە لەم وێنەیەدا کۆکراونەتەوە.

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو | |
|---|---|---|---|---|
| | | | A | B |
| تاک | ١ | من | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | Ø-یت/ات |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن |

کەسی سێیەمی تاک لە دەستەی (B)دا بۆ ڕابردوو هیچ قاڵبێکی ئاشکرای Overt from نییە (Ø) بۆ داهاتوو خۆی بە(یت/ات)[٢] دەرئەخا.

ڕاناوە لکاوەکان لەگەڵ کارا دەرئەکەون بۆ دەربڕینی ڕێککەوتن[٣] concord لەگەڵ بکەرا لە کەس و ژمارەدا... بەم جۆرە.

| | تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|---|
| ڕابردوو | A | B |
| داهاتوو | B | B |

| | ڕابردوو | | | | داهاتوو | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | تێپەڕ | A | تێنەپەڕ | B | تێپەڕ | B | تێنەپەڕ | B |
| من | | م | | م | | م | | م |
| تۆ | | ت | | یت | | یت | | یت |
| ئەو | کرد- | ی | خەوت- | Ø | دەنووس- | ێت | دەڕۆ- | ات |
| ئێمە | | مان | | ین | | ین | | ین |
| ئێوە | | تان | | ن | | ن | | ن |
| ئەوان | | یان | | ن | | ن | | ن |

دەستەی (B) هەمیشە بەڕەگی کارەوە ئەلکێ... یاسا ژ (١)

دەستەی (A) بەپێی قالبی ڕستەکە جێگۆڕکێ ئەکات و بەخاوەن بچووکترین ژمارەی ئەم بەشانەی ڕستەوە ئەلکێ:

...... یاسای ژ (٢)

| بکەر | 1<br>بەرکاری (١) | 3<br>پێشبەند | 2<br>بەرکاری (٢) | 4<br>یەکەم پێشگر | 5<br>ڕەگ |
|---|---|---|---|---|---|
| من | تۆ - م | بۆ | ئەو | نە - دە | نارد |
| تۆ | — | بۆ | ئەو - ت | نە - دە | نارد |
| ئەو | — | بۆ - ی | — | نە - دە | نارد |
| ئێمە | — | — | — | نە - مان دە | نارد |
| ئێوە | — | — | — | دە - تان | نارد |
| ئەوان | — | — | — | — | نارد - یان |

ئەم دوو دەستەیە جگە لە دەوری بکەرییان... لەگەڵ کاری تێپەڕدا دەوری بەرکاریش لە دوو کاتی دژیەکا ئەبینن.. بەپێی ئەم یاسایە

بۆ گۆڕینی ڕاناوی جودای بەرکاری بە لکاو

١- سەیری کاتی کارەکە ئەکەین... ڕابردووبێ ڕوو لە دەستەی (B) ئەکەین... داهاتووبێ لە (A).

٢- بەپێی کەس و ژمارەی ڕاناوە جوداکە لکاوەکە دەستنیشان ئەکرێ.

٣- بەپێی یاساکانی ژ (١) و (٢) شوێنی ڕاناوە لکاوەکە لە ڕستەکەدا دەستنیشان ئەکرێ.

بۆ نموونە ڕستەی:

ئەوان تۆیان هەڵ - خەڵەتاند.

١- کـار لە تێپـەڕی ڕابردوودایە بۆیە ڕاناوی لکاوی بکەری (یان) سـەر بەدەسـتـەی (A)یە.
٢- (تۆ) بەرکاری ڕاستەوخۆیە... لە دووەمی تاکدایە بۆ جێگیرکردنی بەڕاناوی لکاو ڕوو لە دەستەی (B) ئەکەین. بەرامبەرەکەی (یت)ە.
٣- (یت) جێی (تۆ) ئەگرێ و بەپێی یاسای ژ (١) بەرەگی کارەکەوە ئەلکێ.
(یان) بەرەڵلا بوو... بەپێی یاسای ژ (٢) بەپێشگرەکەوە ئەلکێ. گوێزانەوەکە بەم جۆرە ئەبێ.

بۆ گلەیی ـ مان لێ ئەکەیت[٤].

لە شێوەی باشووری کرمانجیی خواروودا (کە گەرمیان بەشێکییەتی) ئەم دیاردەیە بەجۆرێکی تر خۆی دەرئەخا. کە بەم جۆرەیە:

١- دەستەی (B) دەوری بکەری لەگەڵ تێپەڕی داهاتوودا ئەبینێ... هەرگیز لەگەڵ تێپەڕی ڕابردوودا دەرناکەوێ و دەوری بەرکاری نابینێ.

٢- دەستەی (A) دەوری بکەری لە ڕابردوودا و بەرکاری لە (ڕابردوو و داهاتوودا) ئەبینێ.

ئەرکی بکەری و بەرکاری ڕاناوە لکاوەکان لەگەڵ کاری تێپەڕدا لەم شێوەیەدا لەم نەخشەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

یاسا ژ (٤)

واتا لەم شێوەیەدا لە جیاتی ئەوەی دەستەی (B) دەوری بەرکاری لە ڕابردوودا ببینێ... دەستەی (A) ئەیبینێ. یاساکانی تر هەموو هەمان شتن و هاوجۆرن.

کە ڕاناوی جودای بەرکاری لەم شێوەزارەدا لە ڕابردوودا ئەکرێ بەلکاو... دوو ڕاناوی لکاو سەر بەدەستەی (A) ئەکەونە پاڵ یەک. ڕیزبوونیان بەم جۆرە ئەبێ.

... یاسای ژ (٥)

واتا ڕاناوی لکاوی بەرکاری ئەکەوێتە نێوان ڕاناوی لکاوی بکەری و ئەو بەشەی پێوەی لکاوە[٥].

لە ڕستەی:

ئەوان تۆیان هەڵ - خەڵەتاند.

١- (یان) ڕاناوی لکاوی بکەرییە.

٢- (تۆ) بەرکارە... بۆ کردنی بەلکاو بەپێی یاسای ژ (٤) ڕوو لە کۆمەڵی (A) ئەکەین. بەرامبەرەکەی (ت)یە.

٣- (ت) جێی (تۆ) ئەگرێ.

٤- بەپێی یاسا ژ (٢) ڕاناوە لکاوەکە بەپێشگرەکەوە ئەلکێ.

٥- (یان) بەرەڵلا بوو... ئەمیش بەپێی یاسای ژ (٢) بەپێشگرەکەوە ئەلکێ...

٦- بەپێی یاسای ژ (٥) ڕیزبوونی ڕاناوە لکاوەکان بەم ڕیزە بەپێشگرەکەوە ئەلکێن.

پێشگر + ڕاناوی بەرکاری + ڕاناوی بکەری

گوێزانەوەکە بەم جۆرە ئەبێ:

لە ڕستەی (تۆ ئێمەت ناسی)

١- (ت) ڕاناوی لکاوی بکەرییە.

٢- (ئێمە)بەرکارە بۆ کردنی بەلکاو...ڕاناوەکە لکاوە لە دەستەی (A)یەوە وەرئەگیرێ. (مان) بەرامبەریەتی.

٣- (مان) جێی (ئێمە) ئەگرێ.

٤- دوو ڕاناوی لکاوی سەر بەکۆمەڵی (A) بەرەڵلا بوون بەپێی یاسای ژ (٢) هەر دوو

بەرەگی کارەکەوە ئەلکێن.

٥- ڕیزبوونیان بەپێی یاسای ژ (٥) بەم جۆرە ئەبێ:

ڕەگ + ڕاناوی بەرکاری + ڕاناوی بکەری

کە بەرکاری ناڕاستەوخۆ ئەکرێ بەلکاو

که بەرکاری ناڕاستەوخۆ ئەکرێ بەلکاو.

کە هەردوو بەرکار (ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ) کران بەلکاو لەم حاڵەتەدا سێ ڕاناوی لکاوی سەر بەکۆمەڵی (A). ئەکەونە ڕیز یەک و هەرسێک بەپێشبەندەوە ئەلکێن... بەم جۆرە:

پێشبەند + بەرکاری (٢) + بەرکاری (١) + بکەر ... یاسای ژمارە (٦)

واتا لەم حاڵەتەدا بەرکاری ناڕاستەوخۆ ناجووڵێتەوە هەر لە شوێنی خۆیدا ئەکرێ بەلکاو... و بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەپێی یاسای ژ(٥) ڕیز ئەبن و پێیەوە ئەلکێن.

ئەگەر بەرکار (ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ) لە کەسی سێیەمی تاکدا بێ و بکەرێ بە لکاو... هیچ سیمایێکی بۆ دەرناکەوێ... یاسای ژ (٧)

نارد + Ø + مان

منت بۆ نارد

پەراوێزەکان:

١- بۆ سیستەمی کارکردنی ڕاناو لە کرمانجی ژووروودا سەیری ئەم باسە بکەن.

وریا عومەر ئەمین (١٩٩٠) ڕێزمانی ڕاناو لە کرمانجی ژووروودا. گ. کۆڕی زانیاریی عێراق دەستەی کورد ژ (٢١).

هەروەها سەیری سەرچاوەی ژ (٤) بکەن.

٢- بۆ یاسای [ێت / ات] سەیری سەرچاوەی ژ (٤) ل٦٣ بکەن.

٣- بۆ چەمکی ڕێکەوتن سەیری ئەم باسە بکەن:

وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) ڕێککەوتن لە زمانا. گ. ڕۆشنبیری نوێ ژ (٩١).

٤- ئەگەر ئەو ڕاناوە جودایەی دوای (بە - لە) کرا بە لکاو (بە) ئەبێتە (پێ) و (لە) ئەبێتە (لێ).

بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی ئەمەوە سەیری سەرچاوەی ژ (٢) بکە.

٥- لە بەشێکی ئەم شێوەیەدا ئەم ڕیزبوونە بەم جۆرەیە (بکەر + بەرکار).

من تۆم نارد / نارد - م - ت.

تۆ منت نارد / نارد - ت - م.

ئێمە ئێوە - مان نارد / نارد - مان - تان.

قسەکەری واش هەیە هەردوو جۆری لێ ئەبیسترێ بەتایبەتی کە (بکەر) و (بەرکار) لە کەسی یەکەم و دووەمی تاکدا ئەبن.

من تۆ -م نارد ⟵ نارد - م - ت یا نارد - ت - م

تۆ منت نارد ⟵ نارد - ت - م یا نارد - م - ت

لەم حاڵەتەدا بارودۆخی قسەکە Contex of situation مەبەستەکە ئەگەیێنێ.. ئەم حاڵەتانە لە ڕێی پراگماتیکەوە Pragmantics چارەسەر ئەکرێن.

سەرچاوەکان:

١- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو - بەغداد.

٢- (١٩٩٧) ڕەخنەی نارەخنە. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ (١٤٠).

٣- شێرکۆ بابان (١٩٩٩) نەخشەی ڕۆنانی ڕێژەی کار - هەولێر.

4- Amin. W. O. (1979) Aspects of the verbal Construction in Kardish. Thesis Presented to the university of London.

5- Mackenzie, D. N. (1961) Kurdish dialect studies V. I. London.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤٦) ساڵی ٢٠٠٠، لاپەڕە ١٦-٢٠ بڵاوکراوەتەوە.

## سیستەمی کارکردنی ڕاناو لە کوردیی ژووروودا

لە تایبەتیەتەکانی سیستەمی ڕاناو لە کوردیی ژووروودا (ک.ژ) ئەمانەن:

١- دوو دەستە ڕاناوی جودا و یەک دەستە ڕاناوی لکاوی هەیە.

٢- هەر دەستەیێ لەمانە چەن ئەرکێکی تایبەتیی خۆی هەیە کە هەرگیز دەستەکەی تر جێبەجێی ناکات.

٣- ئەگەر بکەر یا بەرکار یا هەردووکیان بەڕاناوی جودا دەربڕابن و کاتی کاری ڕستەکە دژێنرا... ڕاناوەکان شێوەی خۆیان ئەگۆڕن.

٤- کار لەگەڵ بکەرا لە کەس و ژمارەدا ڕێک ئەکەوێ... جاری واش هەیە لەگەڵ بەرکارا ڕێک ئەکەوێ.

٥- ئەگەر ڕێکەوتن لە نێوان بکەر و کاردابێ... بەگۆڕینی کاتی کاری ڕستەکە ڕێکەوتنەکە دەبێتە نێوان بەرکار و کار... و بەپێچەوانەوەش.

٦- بەگوێزانەوەی ڕستەیێکی بکەر دیار بۆ بکەر نادیار لە هەندێ حاڵەتا ڕاناوی بەرکاری شێوەی خۆی ئەگۆڕێ.

٧- بەگوێزانەوەی ڕستەیێکی کار تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ جاری وا هەیە ڕاناوی بکەری، کە ئەبێتە بەرکار شێوەی خۆی ئەگۆڕێ... هتد.

ئەم باسە هەوڵدانێکە بۆ خستنە ڕوویەکی خێرای سیستەمی گشتیی کارکردنی ڕاناوەکان لەم شێوەیەدا. ڕاناوە جودا و لکاوەکانی (ک.ژ) لەم خشتەیەدا بەپێی کەس و ژمارە ڕوون کراونەتەوە و خراونەتە ڕوو.

| ژمارە | کەس | ڕاناوی جودا A | B | ڕاناوی لکاو |
|---|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من | ئەز | م |
| | ٢ | تە | تو | ی |
| | ٣ | وی/وێ | ئەو | -،ت/ەت |
| کۆ | ١ | مە | ئەم | ین |
| | ٢ | وە | هوون | ن |
| | ٣ | وان | ئەوان | ن |

هەر دەستەیێ لەمانە ئەرکی تایبەتیی خۆی لەناو چوارچێوەی سیستەمی ڕێزمانی (ک. ژ)دا هەیە...

ئەرکی ڕاناوەکان بەم جۆرەی خوارەوە دابەش ئەکرێن.

<table>
<tr><th>دەستەی (A)</th><th colspan="4">دەستەی (B)</th></tr>
<tr><td>دەوری بکەری لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا</td><td colspan="4">دەوری بکەری لەگەڵ کاری تێپەڕ و تێنەپەڕی داهاتوو و تێنەپەڕی ڕابردوو.</td></tr>
<tr><td></td><td></td><td>تپ - دا</td><td>تن - دا</td><td>تن - را</td></tr>
<tr><td>من نڤیسی</td><td>ئەز</td><td>دکەم</td><td>دنڤم</td><td>نڤستم</td></tr>
<tr><td>تە نڤیسی</td><td>تو</td><td>دکەی</td><td>دنڤی</td><td>نڤستی</td></tr>
<tr><td>وی/وێ نڤیسی</td><td>ئەو</td><td>دکت</td><td>دنڤت</td><td>نڤست</td></tr>
<tr><td>مە نڤیسی</td><td>ئەم</td><td>دکەین</td><td>دنڤین</td><td>نڤسین</td></tr>
<tr><td>وە نڤیسی</td><td>هوون</td><td>دکەن</td><td>دنڤن</td><td>نڤستن</td></tr>
<tr><td>وان نڤیسی</td><td>ئەوان</td><td>دکەن</td><td>دنڤن</td><td>نڤستن</td></tr>
<tr><td>دەوری بەرکاری لە داهاتوودا<br>ئەز تە دبینم.<br>تو من دبینی.<br>ئەو وی دبینت.<br>ئەم وە دبینین.<br>هوون مە دبینن.<br>ئەوان وێ دبینن.</td><td colspan="4">دەوری بەرکاری لە ڕابردوودا<br>تە ئەز دیتم.<br>من تو دیتی.<br>وی ئەم دیتین.<br>وان هوون دیتن.<br>مە ئەوان دیتن.<br>وە ئەو دیت.</td></tr>
<tr><td>هەرگیز لەگەڵ کارا ڕێک ناکەوێ<br>(سەیری نموونەکانی سەرەوە بکە)</td><td colspan="4">هەمیشە لەگەڵ کارا ڕێک ئەکەوێ<br>(سەیری نموونەکانی سەرەوە بکە)</td></tr>
<tr><td>دوای پێشبەند دەرئەکەوێ<br>من هوون ژ بو وێ هنارتن.<br>هوون مە ژ بۆ وان دهنێرن.</td><td colspan="4">هەرگیز دوای پێشبەند دەرناکەوێ</td></tr>
<tr><td>لە باری ئیزافەدا دەرئەکەوێ<br>ئەڤە کچا منە.<br>ئەڤە برایێ ویە.</td><td colspan="4">هەرگیز لە باری ئیزافەدا دەرناکەوێ</td></tr>
</table>

سیماکانی Features ئەرکەکانی ڕاناوەکان ئەمانەن:

| | | رابردوو | | داهاتوو | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | تێپەڕ | تێنەپەڕ | تێپەڕ | تێنەپەڕ |
| بکەری | A | + | – | – | – |
| | B | – | + | + | + |
| بەرکاری | A | – | – | + | – |
| | B | + | – | – | – |
| ڕێکەوتن | A | – | – | – | – |
| | B | + | + | + | + |
| دوای پێشبەند | A | + | + | + | + |
| | B | – | – | – | – |
| ئیزافە | A | + | + | + | + |
| | B | – | – | – | – |

ئەم سیمایانە بەپێی ئەم سیستەمە کار ئەکەن:

ئەوەی سەرەوە یاسای گشتیی کارکردنی راناوەکانی (ک. ژ)ە.

لەم یاسا گشتییەدا دەرئەکەوێ کە دەستەی (A) و (B) هەمان دەور لە دوو کاتی دژیەکا نەبینن و ڕێکەوتن هەمیشە لە نێوان کار و دەستەی (B) دایە.

واتا... لە ڕستەدا ئەگەر (بکەر) و (بەرکار) بەڕاناوی جودا دەربڕابن و کاتی کاری ڕستەکە دژێنرا...

١- ڕاناوی سەر بەدەستەی (A) ئەبێتە (B) و هی سەر بە (B) ئەبێتە (A).

٢- ڕێکەوتنی نێوان (بکەر) و (کار) ئەبێتە نێوان (بەرکار) و (کار)... و هی نێوان (بەرکار) و (کار) ئەبێتە نێوان (بکەر) و (کار).

یاساکانی ئاڵوگۆڕبوونی (دەستە) و (ڕێکەوتن) بەگۆڕینی کات.

لە ڕستەی

ئەز وە دبینم

(ئەز) بکەرە

(وە) بەرکارە

(م) ڕاناوی لکاوی ڕێکەوتنە لە نێوان (بکەر) و (کار)دا...

(کات) داهاتووە... بکرێ بەڕابردوو...

(ئەز) ئەبێتە (من)

(وە) ئەبێتە (هوون)

ڕێکەوتن لە نێوان (بکەر) و (کار)ە، ئەبێتە نێوان (بەرکار) و (کار)... ڕاناوی لکاو ئەبێتە (ن) چونکە بەرکار لە کەسی دووەمی کۆدایە.

ڕستەی

وان تو دیتی

(وان) بکەرە سەر بەدەستەی (A)یە.

(تو) بەرکارە سەر بەدەستەی (B)یە.

(ی) ڕاناوی لکاوی ڕێکەوتنە لە نێوان (بەرکار) و (کار)

(کات) ڕابردووە بکرێ بەداهاتوو

(وان) ئەبێتە (ئەوان)

(تو) ئەبێتە (تە)

ڕێکەوتن لە نێوان (بەرکار) و (کار) ئەبێتە نێوان (بکەر) و (کار).

**ڕاناو لە ڕستەی بکەر نادیاردا:**

بۆ گۆڕینی ڕستەیێکی بکەر دیار بەبکەر نادیار لە کوردیی ژووروودا.

١- بکەر و ڕاناوی لکاوی ڕێکەوتن لائەبرێن.

٢- بەرکار جێی بکەر ئەگرێ لەبەر ئەوەی زمانی کوردی سەر بەتایبی (SOV)یە. بۆیە لە شوێنی خۆی ئەمێنێ.

٣- چاووگی کاری ڕستەکە وەرئەگیرێ.

٤- (هات - ـە) ئەخرێتە پێش کارە بەچاووگ کراوەکە.

٥- کاتی کاری ڕستەکە ئەکرێتە بەر (کاری) (هات).
٦- بەپێی کەس و ژمارەی بەرکارە بەبکەر بووەکە. ڕاناوێکی لکاو ئەخرێتە سەر (هات).
یاسای گوێزانەوەی ڕستەی بکەر دیار بۆ بکەر نادیار بەم جۆرەیە:

ئەگەر کاتی کارەکە لە داهاتوودابێ... ڕاناوی بەرکاری لە دەستەی (A)یەوە ئەبێ. بکرێ بەبکەر نادیار... ئەگۆڕێ بەدەستەی (B).

بەبەراورد کردنی ئەو ڕستانەی کە کاتەکانیان ڕابردوون و ئەکرێن بەبکەر نادیار لەگەڵ ئەوانەی کاتەکانیان داهاتوون... دەرئەکەوێ کە ڕاناوی لکاوی ڕێکەوتنی ڕستەی کار کات ڕابردوو ناگۆڕێ و هەر خۆی دەمێنێتەوە. تەنیا شوێنەکەی ئەگوێزرێتەوە و ئەچێتە سەر (هات - ـه) چونکە ڕێکەوتن لە ڕابردوودا لە نێوان بەرکار و کار دایە و هەر بەرکارەکە خۆی ئەبێتە بکەری ڕستەی بکەر نادیار. بەڵام لە ڕستەی کات داهاتوودا... ڕێکەوتن لە نێوان بکەر و کاردا ئەبێ، کە ئەکرێتە بکەر نادیار ئەگوێزرێتە نێوان کار و بەرکارە بەبکەر کراوەکە بۆیە ڕاناوێکی لکاوی تر جێی ئەگرێ بەپێی کەس و ژمارەی بکەرە تازەکە وەک لە ڕستەی:

ئەز وە دبین -م

(م) ڕاناوی ڕێکەوتنە لەگەڵ (ئەز)ی بکەرا... کە ئەم ڕستەیە ئەکرێتە بکەر نادیار... (وە)ی بەرکار ئەبێتە بکەر و ڕێکەوتنەکە ئەبێتە نێوان کار و بەرکاری بەبکەر کراودا.

سەرچاوە:


۱- بدرخان سندی (۱۹۸۳) (ئەز) ئو (من) د ئەزمانێ کوردیدا، گ. کۆڕی زانیاریی عێراق، دەستەی کورد، بەرگی (۱۰)، بەغدا.

۲- صادق بهاالدین (۱۹۷٦) ڕێزمانا کرمانجی، بەغداد.

۳- وریا عومەر ئەمین (۱۹۸۲) ڕستەی بکەر نادیار، گ. ڕۆشنبیری نوێ ژ (۹٥).

٤- وریا عومەر ئەمین (۱۹۸۳) پەیوەندیی ڕاناو و فەرمان لە کرمانجی ژووروودا گ. کاروان ژ (۲).

٥- وریا عومەر ئەمین (۱۹۹۰) ڕێزمانی ڕاناو لە کرمانجیی ژووروودا، گ. کۆڕی زانیاریی عێراق، دەستەی کورد، بەرگ (۲۱ و ۲۲).

6- Bakaev, Ch (1973) Izik Kurdov SSR Maskva

7- Comrie. B, (1973) The Ergative, Lingua 32 PP 239-252.

8- Kurdoev, K. (1978) Gramatika Kurskava Izika. Maskva.

9- Mackkenzie, D. N (1961) Kudrish Dialect Studies - London.

10- Waria Omar Amin (1979) Aspets of the verbal constrction in Kurdish - Thesis presented to the Universty of London.


* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (۱٤۷) ساڵی ۲۰۰۱، لاپەڕە ٥۰-٥٥ بڵاوکراوەتەوە.

# ڕوونكردنەوەیەك...

خۆبەستنەوە بەپەیڕەوێک و دانانی سنوور بۆ لێکۆڵینەوە سیمای کاری ئەکادیمییە. هەر باسێک ئەم لایەنانەی تیا ڕەچاو نەکرێت سەرپێیی دەرئەچێ. ڕەخنەگریش ئەبێ لەناو چوارچێوەی ئەم پەیڕەو و سنوورەدا باسەکە هەڵبسەنگێنێ و کەم و کورپیەکانی دەرخات، نەک پڕ بداتە دەرەوەی. ئەبێ باسەکە لەگەڵ ئەوانەی پێشتر بڵاوکراونەتەوە بەراورد بکات و پێشانی بدات چی تازەی تیا پێشکەش کراوە و گرنگێتیی ئەم شتە تازەیە لەو مەیدانەدا چییە و تا چ ڕادەیێک نووسەرەکە لە پێشکەشکردنیا سەرکەوتوو بووە... هتد... ئەگینا نابێ بەڕەخنە.

لە بەرگی (١٢)ی ساڵی (١٩٨٥)ی گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق - دەستەی کورد (ل ٤٥-٩٣)، لەژێر ناوی - جێناوی کەسیی جودا لە زمانی کوردیدا - وتارێکی د. ئاوڕەحمانی حاجی مارف بڵاوکراوەتەوە تیایا لە بارەی وتارێکمەوە کە لە ژمارە (١٠)ی ساڵی (١٩٨٣)ی هەمان گۆڤاردا بڵاوکراوەتەوە ئەڵێ:

«دووەم وتار کە بەناوی (لایەنێکی جیاوازی)یەوەیە و نووسەرەکەی د. وریا عومەر ئەمینە، بەشێکی کەمی دەربارەی جێناوی کەسیی جودایە. باشیی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەتایبەتی لەوەدایە، کە لەسەر شێوازێکی زانستیی نوێ نووسراوە، بەڵام بەگشتی باسێکی قووڵ نییە و کەرستەی زمانی کوردی کەم تێدایە و ناتەواوی زۆرە.

د. وریا لە نەخشەی ژمارە ٣دا (بڕوانە: ل ٢٦١) و لەسەر پاکی نووسینەکەیدا لە دەستەی Bی جێناوی کەسیی جودا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بۆ کەسی دووەمی کۆ (هون)ی نووسیوە. وەک پێشتر لێی دوام و دواتریش باسم کردووە، (هوون) پتر لە (هون) بەکاردێ. سەرنج ڕاکێش، ئەوەیە کە لەنێو نووسەرانی کورددا تەنیا مامۆستا جگەرخوێن (هون)ی تۆمار کردووە.

دابەشکردنی جێناوە کەسییە جوداکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان و بەراوردکردنیان لەلایەن زانایانی کورد و بێگانەوە، بەزمانی کوردی و بێگانە تاڕادەیێک باس کراوە، کەچی د. وریا پەنجەی بۆ هیچ یەکێک لەو سەرچاوانە ڕانەکێشاوە.

ئەو نموونانەی نووسەر بۆ ئیسپاتکردنی باسەکەی هێناونییەوە، لە قووڵایی زمانی

کوردییەوە نین، واتا لە فۆلکلۆر و ئەدەب و...ی تۆمار کراوەوە نین، بەڵکو ڕستەی سادەی زمانی خۆی یان ناسیاوێکیتی... و هەندێکی تر).
گەر ڕەخنەگر ناسناوێکی ئەکادیمیی بەرزی ئەبا ئەم ڕوون کردنەوەیەم نەئەخستە ڕوو.
ئەوەی بەلامەوە زۆر گرنگە و بەپێوستیی ئەزانم ڕوونی کەمەوە ئەو بەشەی ڕاکانیەتی کە ئەڵێ:
«... بەلام ئەوەی یادداشت نەکردووە کە ئەم دوو دەستەیە بەپێی دۆخ جیا دەبنەوە».
وەک دەرئەکەوێ ڕەخنەگر لە مەبەستی من حالی نەبووە. ئەم وتارە هەوڵدانێکە بۆ پێشاندانی سیستەمی کارکردنی ڕاناو لە زمانی کوردی یا بەگشتی و دەستنیشانکردنی یاساکانیانە... تیایا پیشانی ئەدەم و ساغی ئەکەمەوە کە دابەشکردنی دوو دەستە جێناوی کرمانجیی ژووروو بەپێی دۆخ هەڵەیە. ئەم دوو دەستەیە هەرگیز ناشێ بەپێی دۆخ جیا بکرێنەوە چونکە هەردوو دەستە هەردوو دۆخی ڕاستەوخۆ وتیان لە دوو کاتی ڕێزمانیی جیاوازدا پێشان ئەدەن.
هەموو ئەوانەی ئەم دوو دەستەیەیان بەپێی دۆخ جیا کردۆتەوە لەژێر کارتێکردنی ڕێزمانی زمانی تر وای بۆچوون کە هەبوونی فۆرمی جیای ڕاناو بەڵگەی هەبوونی دۆخی جیاوازە. گەر ئەمە لەگەڵ زمانی ڕووسی یا (بۆ نموونە) وابێ... لەگەڵ شێوەی کرمانجیی ژووروودا مەسەلەکە بەتەواوی بەجۆرێکی ترە.
لە کرمانجیی ژووروودا دوو دەستە داناوی جودا و یەک دەستە ڕاناوی لکاو هەیە. دابەشبوونیان بەپێی کەس و ژمارە لەم نەخشەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

| ژمارە | کەس | ڕاناوی جودا | | ڕاناوی لکاو |
|---|---|---|---|---|
| | | ١ | ٢ | |
| تاک | ١ | من | ئەز | م |
| | ٢ | تە | تو | ی |
| | ٣ | وی/وێ | ئەو | -ـ‌ت/ەت |
| کۆ | ١ | مە | ئەم | ین |
| | ٢ | وە | هوون | ن |
| | ٣ | وان | ئەو | ن |

لەگەڵ فرمانی تێپەڕا... کۆمەڵی یەکەم گەر کاتی فرمانەکە ڕابردوویێ دەوری (بکەری - واتا دۆخی ڕاستەوخۆ) ئەبینێ. وەک لەم نموونانەدا ڕوون کراوەتەوە.

| بکەر | بەرکار | |
|---|---|---|
| دۆخی ڕاستەوخۆ | دۆخی | فەرمانی |
| دەستەی یەکەم | دەستەی دووەم | ڕابردوو |
| من | تو | دیتی |
| تە | ئەز | دیتم |
| وی/وێ | ئەو | دیت |
| مە | هوون | دیتێ |
| وە | ئەم | دیتین |
| وان | ئەو | دیتێ |

| بکەر | بەرکار | |
|---|---|---|
| دۆخی ڕاستەوخۆ | دۆخی تیان | فەرمانی |
| دەستەی یەکەم | دەستەی دووەم | داهاتوو |
| ئەز | تە | دبینم |
| تو | من | دبینی |
| ئەو | وی/وێ | دبینی |
| ئەم | وە | دبینین |
| هوون | مە | دبینێ |
| ئەو | وان | دبینێ |

سەیرکە لە ڕابردوودا فرمان لەگەڵ بەرکارا لە کەس و ژمارەدا ڕێک ئەکەوێ. واتا فرمان ڕاناوێکی لکاو وەرئەگرێ بەپێی کەس و ژمارەی بەرکارەکە. کەی بەرکار لاچوو ڕاناوی لکاویش لا ئەچێ.

تە ئەز دیتم ←—— تە دیت

من تۆ دیتی ←—— من دیت

وان هوون دیتێ ←—— وان دیت

هەر ئەو دیاردەیەشە وای کردووە هەموو ئەوانەی لە فرمانی کرمانجیی ژووروو کولیونەتەوە وای بۆ بچن کە فرمانی تێپەڕ لە ڕابردوودا ڕاناوی لکاو وەرناگرێ..
دەوری ئەم ڕاناوانە بەپێی دۆخ لەم نەخشەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

واتا هەردوو دەستە هەردوو دەوری دۆخی ڕاستەوخۆ و تیان لە دوو کاتی ڕێزمانیی جیاوازدا ئەبینن.. ئیتر بە چ مەنتقێ ئەشێ ئەم دوو دەستەیە بەپێی دۆخ جیا بکرێتەوە گەر بەم جۆرە نەبێ کە پێشکەش کرا...

د. ئاوڕەحمان ئەڵێ... «باشی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەتایبەتی لەوەدایە کە لەسەر

شێوازێکی زانستیی نوێ نووسراوەتەوە... بەڵام بەگشتی باسێکی قووڵ نییە و کەرەستەی زمانی کوردی کەم تێدایە...».

ئەم قسانە یەک ناگرنەوە... گەر باس و لێکۆڵینەوە زانستی بێ و لەسەر شێوازێکی زانستی نوێ نووسرابێتەوە ئەبێ شتێکی تازەی بەدەستەوە دابێ و هەر بنێشتە تاڵەکەی پێش خۆی نەجووبێتەوە... باس و لێکۆڵینەوەی زانستی ئەوەیە هەڵەیەکی باوی ڕاست کردبێتەوە... قاعیدەی بۆ دیاردەیێ دانابێ... شتێکی ساغ کردبێتەوە نووسەرەکە لە نووسینا فەلسەفەی هەبێ و خۆی بەپەیڕەوێکەوە بەستبێ... سنووری بۆ باسەکەی دانابێ... هتد. ئیتر چۆن ئەشێ بوترێ لەسەر شێوازێکی زانستیی نوێ نووسراوەتەوە و ناتەواوی زۆرە؟.

من لەم وتارەدا هەڵەیەکی باوم ڕاست کردۆتەوە. باسی بابەتێکم کردووە و قاعیدەکەیم دەستنیشان کردووە (وەک من بزانم) هیچ زمانەوانێ پێشتر بۆی نەچووە و نەیتوانیوە بەم شێوەیە لێکی بداتەوە، بێ ئەوەی ناوی ئەم و ئەو بهێنم و بڵێم ئەوان بەهەڵەدا چوون و من ڕاستم...

د. ئاوڕەحمان ئەڵێ: «ئەو نموونانەی نووسەر بۆ ئیسپاتکردنی باسەکەی هێناونییەوە لە قووڵایی زمانی کوردییەوە نین»... وا دیارە نموونەکانی من لە توێکڵی زمانی کوردییەوەن... لە سەرەتای وتارەکەما (ل ٢٦٠) ئەڵێم: «لەم وتارەدا باسی ڕاناو ئەکرێ لە ڕووی سینتاکسەوە. واتا پەیوەندیی ڕاناوی لکاو بەبەشەکانی تری ڕستەوە. بۆیە لێکۆڵینەوەکەم لە ڕووی ئاستەکانی تری زمانەوە ساکار دێتە بەرچاو». من کە خۆم وا بڵێم ئیتر باس نەکردنی لایەنی مۆرفۆلۆجی بۆ بەکەموکوڕی لە قەڵەم بدرێ... باسەکەی من سینتاکسییە. بۆ ئەم جۆرە باسانە یەک دەستە وەک نموونە هەڵئەبژێررێت. ئەم دەستەیە وەک (ستاندەرت) تەمسیلی هەموو فۆرمە جیاوازەکانی شێوەکانی زمانەکە ئەکات... جا (هون)م نووسیبێ یا (هوون) هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ و پەیوەندی بەگەوهەری باسەکەوە نییە.

د. ئاوڕەحمان ئەڵێ: «دابەشکردنی جێناوی کەسییە جوداکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان و بەراوردکردنیان لەلایەن زانایانی کورد و بێگانەوە بەزمانی کوردی و بێگانە تاڕادەیێک باس کراوە. کەچی د. وریا پەنجەی بۆ هیچ یەکێک لەو سەرچاوانە ڕانەکێشاوە».

هۆی ئاماژە نەکردنم بۆ ئەو سەرچاوانە ئەوەیە چونکە هیچ سوودێکم لێ وەرنەگرتوون...

ئەوەی من باسی ئەکەم هەموو ئەنجامی لێکدانەوەی خۆمن و کەس پێشتر بەم جۆرە بۆی نەچووە و باسی نەکـردووە. لێکۆڵینەوەی ئەکـادیمی پەیڕەوی تایبـەتیی خـۆی هەیە لە دەستنیـشان کـردنی سەرچاوەکانا. لە هەموو شت ئاسانتر ڕیزکـردنی سـەرچاوەیە، بەڵام چۆن؟ وا کـتێـبێکم لەژێر دەسـتـایە گـوایە ئەتروحـەی دکـتـۆرایە... نـووسەرەکـەی نزیکەی دووسەد سەرچاوەی بۆ ڕیز کردووە و بەچەن زمانێ... لەو بڕوایەدام گەر نووسەری ئەم کتێبە بەچاکی تەنیا لە چواری ئەم سەرچاوانەی ڕیزی کردوون بگەیشتایە بەرهەمەکەی وا پووچ دەرنەئەچوو...

حەزم ئەکرد د. ئاورەحمان نەختێ مەوزووعی با لە هەڵسەنگاندنی ئەم وتارە و هەر بەو گیانە ئەکادیمییە پتەوەی من ئەیناسم سەیری بکردایە.

لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیم بۆ مامۆستا و هاوڕێم د. ئاورەحمان حاجی مارف.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری نووسەری کورد - گۆڤاری یەکیەتی نووسەرانی کورد، ژمارە (٢) ساڵی ١٩٨٥، لاپەڕە ٨٢-٨٨ بڵاوکراوەتەوە.

# فۆنیمەکانی زمانی کوردی

زانینی دەنگەکانی زمان و لەیەکدانیان بۆ دروستکردنی برگە بەشێکی زانیاریی قسەکەرە دەربارەی زمانی خۆی. گرنگترین لایەن لە زانینی زمانێ زانینی ئەو سیستەمە تایبەتییەیە کە دەنگ و مانا لەیەک ئەبەستێ. گەر زمانێکی بێگانە ببیستی هیچی لێ تێناگەیت و نازانیت وشەکانی لەکوێوە دەست پێ ئەکەن و لە کوێ تەواو ئەبن. چونکە ئەو سیستەمە تایبەتییە نازانیت کە دەنگەکانی ئەم زمانە لە ماناکانییەوە ئەبەستێ. واتا لەهەر زمانێکا ڕیزە دەنگێکی تایبەتی مانایەکی تایبەتی ئەبەخشێ، گۆڕینێ بەسەر ئەم ڕیزە دەنگە بێ ماناش ئەگۆڕێ. بۆ نموونە دوو ڕیزە دەنگی (بەهار) و (گوڵ) لە زمانی کوردیدا مانایان جیایە چونکە دەنگەکانیان وەک یەک نین. ئەم دوو وشەیە دەنگەکانیان بەتەواوی جیان. جووتە وشەی وا هەیە هەندێ لە دەنگەکانیان یەکن و هەندێ جیان وەک لە (هاوین) و (هەویر)دا، (ھ)، (و) و (ی) یەکن و ئەوانی تر جیان. جووتە وشەی واش هەیە تەنها لە تاکە دەنگێ ئەبێ هەموو یەکن وەک لە (پیر) و (بیر)دا. لەم وشانەی دواییدا ئەبینین گۆڕینی تاکە دەنگێ مانای تەواوی وشەکانی گۆڕی. ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە (پ) و (ب) لە زمانی کوردییا دوو نرخی جیایان هەیە. بەم جۆرە (پ) و (ب) دوو فۆنیمی جیان لە زمانی کوردییا. لە (کەر) و (کەڕ) یا (برین) و (بڕین)دا (ر) و (ڕ) دوو فۆنیمی جیان چونکە دەرکەوتنیان لەهەمان بینەدا مانای جیایان بە وشەکانا بەخشی. ئەو وشانەی هەموو دەنگەکانیان وەک یەکن تەنیا لە تاکە دەنگێ ئەبێ و ئەم جیاییە لەم تاکە دەنگەدا مانای جیای بەوشەکانا بەخشی (جووتۆکە)ن.

بەبەراوردکردنی ئەم جووتۆکانە فۆنیمەکانی زمان دەسنیشان ئەکرێت.

لە ئەنجامی گەڕان بەشوێن هەموو ئەو وشانە -با بڵێین- لەگەڵ (پیر) و (بیر)ا ڕێک ئەکەون، لە زمانی کوردیدا ئەم حەوت وشانەی خوارەوە دەس ئەکەون (بەپێی کۆششی خۆم).

بیر – پیر – تیر – شیر – سیر – ژیر – میر

بەم جۆرە توانیمان حەوت فۆنیم (ب، پ، ت، ش، س، ژ، م) دەسنیشان کەین. ئەبوونی وشەی تر ڕێککەوێ لەگەڵ ئەم کۆمەڵە ئەوە ناگەیەنێ کە فۆنیمەکانی زمانی

کوردی هەر ئەم حەوتەن. کۆمەڵێکی تری وەکو ئەوانەی خوارەوە بەراورد ئەکرێن.

کەر - کەڕ - کەو - کەم - کەس - کەی - کەڵ - کەف. ئەم هەشت وشانە کە هەموو جووتۆکەی یەکترن و وەک یەکن تەنیا لە دەنگی دوایییانا نەبێ، هەشت فۆنیم دەستنیشان ئەکەن، (ر، ڕ، و، م، س، ی، ڵ، ف) دوانیان (س، م) لەگەڵ کۆمەڵی یەکەما هاوبەشن و شەشیان تازەن. ژمارەی فۆنیمەکان بوو بەسیانزە. لیستەکەمان زیاد ئەکەین بەزیادکردنی کۆمەڵی تری وەکو ئەوانەی سەرەوە... تا ئەگەینە ڕادەیەک هیچ فۆنیمی تازە نادۆزرێتەوە... وەک ئەوەی خوارەوە.

| جووتۆکە | فۆنیمەکان | فۆنیمی تازە | ژمارە |
|---|---|---|---|
| بیر، پیر، سیر، شیر، تیر، ژیر، میر | ب، پ، س، ش، ت، ژ، م | ب، پ، س، ش، ت، ژ، م | ٧ |
| کەر، کەڕ، کەو، کەم، کەس، کەی، کەڵ، کەف | ر، ڕ، و، م، س، ی، ڵ، ف | ر، ڕ، و، ی، ڵ، ف | ٦ |
| پار، بار، شار، کار، زار، دار، هار، مار، غار | پ، ب، ش، ک، ز، د، هـ، م، غ | ک، ز، د، هـ، غ | ٥ |
| شەو، خەو، کەو، چەو | ش، خ، ک، چ | خ، چ | ٢ |
| خاو، چاو، داو، ناو، ڕاو، لاو | خ، چ، د، ن، ڕ، ل | ن | ١ |
| ڤیان، ژیان، زیان | ڤ، ژ، ز | ڤ | ١ |
| حەوت، نەوت، کەوت، خەوت، چەوت | ح، ن، ک، خ، چ | ح | ١ |
| چل، چڵ | ل، ڵ | ڵ | ١ |
| بەش، گەش، ڕەش، لەش، شەش، کەش | ب، گ، ڕ، ل، ش، ک | گ | ١ |
| هەزار، هەژار، هەنار | ز، ژ، ن | - | - |
| باش، ماش، جاش | ب، م، ج | ج | ١ |

| جووتۆکە | فۆنیمەکان | فۆنیمی تازە | |
|---|---|---|---|
| هەور، چەور، جەور | ه، چ، ج | – | – |
| ڕەق، ڕەش، ڕەپ، ڕەز | ق، ش، پ، ز | ق | ١ |
| ماچ، مان، مار، ماف، ماش، ماڵ، ماد، مام، مات | چ، ن، ر، ف، ش، ڵ، د، م، ت | – | – |
| مازی، ماسی | س، ز | – | – |
| دوور، دار، دەر | وو، ا، ە | وو، ا، ە | ٣ |
| شێر، شار، شیر | ێ، ا، ی | ێ، ی | ٢ |
| زۆر، زار، زوور | ۆ، ا، وو | ۆ | ١ |
| ژن، ژین، ژان | (i)، ی، ا | (i) | ١ |
| کۆن، کون | ۆ، و | و | ١ |
| برین، بڕین | ر، ڕ | – | – |
| کەڕ، کوڕ، کۆڕ، کڕ | ـە، و، ۆ، (i) | – | – |
| بان، باغ، بار، باڕ، باو، باش | ن، غ، ر، ڕ، و، ش | – | – |

هەرچەند کۆمەڵی تر زیادکەین هیچی تری نوێمان بۆ نادۆزرێتەوە ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە فۆنیمەکانی زمانی کوردی بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە (٣٥)ن.

یەکێ لەو گۆڕینانەی بەسەر سیستەمی فۆنۆلۆجیی شێوەی سلێمانی هاتبێ توانەوەی دەنگی (د)یە لە هەندێ بینەدا. یەکێ لەمانە توانەوەی (د)ی ئامرازی هەمیشەییە.

Daxom ———— Axom

Damxwârd ———— Amxward

سروشتی ئەلف و بێی عەرەبی ئەم (ئـ)یەی بەسەر زمانی کوردیدا سەپاندووە لە نووسینا.

(دەکەم) – (ەکەم)، (ە) بەتەنیا ناشێ بنووسرێ و کراوە بە (ئە).

هەروا دەرنەکەوتنی (ئـ) لە هیچ وشەیێکی کوردی و بوونی بە(ی) لەو وشانەی لە

عەرەبییەوە وەرگیراون ئەیسەلمێنن کە ئەم (ئـ)یە نیشانە نییە بۆ هیچ دەنگێ و ناشێ بخرێتە سیستەمی فۆنۆلۆجی کوردییەوە.

گەلێ وشەی عەرەبیش کە دەنگی (ع)ی تیایە لە زمانی کوردی ئیمڕۆمان بەکار ئەهێنرێن وەک (لەعنەت). (عیسا)،... هتد ئەشێ (ع)ش بەفۆنیمێکی کوردی دابنرێت. بەم - جۆرە و بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە زمانی کوردی (شێوەی خواروو) (٣٦) فۆنیمی هەیە.

ئاشکرایە کە دەنگی (س) لە وشەی (سەر و باس)دا جیان لە دەنگی (س) کە لە وشەی (ساڵ و سەد)دا دەرئەکەوێ. لەم وشانەی دواییدا دەنگەکە وەک بڵێی شێوەی (ص)ی وەرگرتبێ سەرەڕای ئەم جیاوازییە هەردووکیان سەر بەیەک فۆنیمن و یەک نرخیان لە سیستەمی فۆنۆلۆجی زمانی کوردیدا هەیە. چونکە جووتە وشەی وا نادۆزرێتەوە لەم زمانەدا کە ئەم دوو دەنگە جیاوازەی تیا لەهەمان بینەدا دەرکەوێ و دوو مانای جیا ببەخشێ. ئەم دوو دەنگە هەردووک لە زمانی عەرەبیشدا هەن کەچی سەر بەدوو فۆنیمی جیان چونکە دوو نرخی جیایان هەیە. لە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی عەرەبیدا هەردووک لە هەمان بینەدا دەرئەکەون و مانای جیا ئەبەخشن وەک لە (سار: ڕۆیشت) و (صار: بوو) هەردووک لە بینەی [(....)ار] دەرکەوتن و مانای جیایان بەخشی.

(ر) و (ڕ) لە زمانی کوردیدا دوو فۆنیمی جیان چونکە لەم زمانەدا جووتە وشەی وا هەیە ئەم دوو دەنگە جیاوازە تیایانا لە هەمان بینەدا دەرئەکەون و مانای جیا ئەبەخشن وەک لە (برین) و (بڕین) یا (کەر) و (کەڕ)دا لە بینەی (بـ....ین) و (کە...). ئەم دوو دەنگە لە زمانی عەرەبیشا هەن وەک لە وشەی (کریم) و (رب)دا دەرئەکەون، بەڵام لە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی عەرەبیدا بەیەک فۆنیم ئەژمێررێن چونکە وشەی وا لە زمانی عەرەبیدا نییە تیایا بەئاڵوگۆڕکردنی ئەم دەنگە مانا بگۆڕێ. ئەم دەنگانە شێوەی جیا ئەگرن بەپێی ئەو بینە جیاوازانەی تیایانا دەرئەکەون. تیایا دەرکەوتنی ئەم دوو دەنگە جیاوازە لەهەمان بینەدا دوو مانای جیا ببەخشێ. واتا فۆنیم شتێکی (مجرد).

لە زانستی زمانا بۆ جیاکردنەوەی ئەم دوو لایەنە نیشانەی فۆنیم ئەخرێتە نێوان دوو هێڵی لارەوەی وەک // و نیشانەی دەنگ ئەخرێتە نێوان دوو کەوانە [ ]. پەیوەندی نێوان دەنگ و فۆنیم لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

وەک:

[س]
/س/
[ص] (لە زمانی کوردیدا)

ئەلف و بێی هەر زمانێ ئەبێ بەپێی ژمارەی فۆنیمەکانی دەستنیشان ئەکرێن. هەر فۆنیمەی نیشانەیەکی بۆ دائەنرێ کە پێی ئەوترێ (پیت) یا (تیپ).

* ئەم وتارە لە گۆڤاری نووسەری کورد - گۆڤاری یەکیەتی نووسەرانی کورد، ژمارە (٨) ساڵی ١٩٨٢، لاپەڕە ٢٩-٣٥ بڵاوکراوەتەوە.

# وشە

ڕێزمانی تەقلیدی وشەی بەبنچ داناوە بۆ شیکردنەوەی زمان بەلام نەیتوانیوە پێناسینێکی پڕ بەپێست بۆ چەمکی وشە دارێژێ بشێ تیۆرێکی گشتیی لەسەر دابنرێ (ڕستە لە کۆمەڵە وشەییێک پێک دێت). (بەشەکانی ئاخاوتن بریتین لە چەن گرووپێک وشە) بەلام وشە خۆی چییە و چۆن لە زمانا دەسنیشان ئەکرێ بەتەواوی ساغ نەکراوەتەوە.

ئەو پێناسین و پەیڕەوانەی بۆ چەمکی وشە دانراون ئەنجامێکی ئەوتۆ بەدەستەوە نادەن و گەلێ ناوێزەیان تیا دەرئەکەوێ، یا تەنیا بۆ چەن زمانێ ئەشێن (ئەویش بەتەواوی نا). هەندێ لەم پێناسین و پەیڕەوانە ئەخەینە بەرچاو و لایەنە کزەکانی دەسنیشان ئەکەین.

١- وشە بریتییە لە کۆمەڵە دەنگێکی بەزار دروستکراو مانایێ ئەبەخشێ.

بەپێی ئەم پێناسینە (گوڵ)، (گەنم)، (ڕەش)، (با) هەر یەکە وشەیەکە چونکە هەر یەکەی لە کۆمەڵە دەنگێکی بەزار دروستکراو دروست ئەکرێ و مانایێک ئەبەخشێ.

(گوڵەگەنم) و (ڕەشەبا) هەریەکە چەن وشەیە و چەن مانا ئەبەخشێ؟ (گوڵەکە)، (گوڵەکان) و (گوڵەکانم) هەریەکە یەک وشەیە ئایا لە ڕووی ماناوەش هەریەکە یەک مانا ئەبەخشێ. چ پێوانەیێک وامان لێ ئەکات بڵێین (گوڵ) و (بمانخواردنایە) هەردووک بەر چەمکی وشە ئەکەون لەکاتێکا (گوڵ) تاکە مانایێک ئەبەخشێ و (بمانخواردنایە) مانای ڕستەیێکی تەواوی لە ڕووی کاتەوە ئاڵۆز ئەبەخشێ؟.

لە (گوڵ و موڵ) و (ئەزان و مەزان)دا (موڵ و مەزان) وشەن یا نا؟ گەر وشەبن چ مانایێکیان لە فەرهەنگا بۆ دائەنێیت. گەر وشە نەبن چین؟

(بار) کە زیاتر لە مانایێک ئەبەخشێ وەک لە (بارەدارێک) و (بارێکی نالەبار) بەیەک یا دوو وشە لە قەڵەم ئەدرێن؟

گەلێ پرسیاری تری لەم بابەتە خۆیان ڕاست ئەکەنەوە بێ ئەوەی وەلامێکی ڕێکوپێکیان بۆ بدۆزرێتەوە. جگە لەمەش چەمکی (مانا) خۆی شتێکی شاراوەیە. مانای (مانا) خۆی ساغ نەکراوەتەوە چۆن ئەشێ شتێ بکرێ بەپێوانە بۆ پێناسینی شتێکی تر کە ئەو شتە خۆی شاراوەبێ و ساغ نەکرابێتەوە. هەچ هەوڵدانێک بۆ پێناسینی وشە لە ڕووی ماناوە ئەنجامێکی ئەوتۆ بەدەستەوە نادات.

٢- وشه هەر دانەیێکی سەربەخۆیە لە زمانا بتوانێ (لە هەندێ بینەدا) دەوری ڕستەیێکی تەواو بگێڕێت. (من) وشەیێکە چونکە لە وەڵامدانەوەی (کێ خواردی) ئەڵێی (من) کە دەوری ڕستـەیێکی پاشگر و پێشگری وەک (هەڵ-، -دوە، دا-، -ن... هتد) ناکرێت بۆیە ئەمانە بەوشە لە قەڵەم نادرێن.

لێرە دیسان چەند گیروگرفتێ هەیە. لەگەڵ پرپەوزیشن و وشەی وەک (لەگەڵ - تا - بۆ - بەڵام... هتد) چی ئەکەین؟

٣- لە هەندێ زمانا بەپێوانەی فۆنۆلۆجی وشە دەسنیشان ئەکرێت. بۆ نموونە زمان هەیە لە وشەکانیا هێز (stress) ئەکەوێتە سەر دوا برگە. واتا شوێنی هێز ئەبێ بەسنووری وشە وەک لە زمانی کوردیدا ئەمەش بەداخەوە هەموو وشەیێک ناگرێتەوە و گەلێ ناوێزەیان تیا دەرئەکەوێ وەک (بەڵام - چونکە... هتد).

زمانی تورکی و هەنگاری لەو جۆرە زمانانەن کە داڕشتنی وشەکانیان سەر بەسیستەمی ڤاوڵ هارمۆنێن Vowel Harmony لەم جۆرە زمانانە ڤاوڵی ڕەگ لە وشەدا چ جۆرێ ڤاوڵی پێشگر و پاشگریش سەر بۆ هەمان جۆر دائەنوێنن. واتا گۆڕینی شێوی ڤاوڵ گوێزانەوەیە لە وشەیەکا بۆ وشەیێکی دیکە. لێرەش دیسان گەلێ ناوێزەیان تیا دەرئەکەوێ و ناشێ بکرێ بەپێوانە بۆ پێناسینی وشە تەنانەت لەو زمانانەش کە سەر بەو سیستەمەن.

ئەوەی وترا ئەمە ئەسەلمێنێ کە هیچ پێوانەیێکی سیمانتیکی یا فۆنۆلۆجی نییە بۆ پێناسینی وشە لە زمانا بشێ بکرێ بەبنج بۆ شیکردنەوەی زمان بۆیە زانایانی زمان ڕوویان لە وشە وەرگێڕا وەک کەرەسەیێکی بنجی بۆ شیکردنەوەی زمان و لە جێگری (بدیل) تر گەڕان. یەکێ لەم جێگیرانە چەمکی مۆرفیم بوو.

مۆرفیم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە لە فۆنیمێ یا زیاتر پێک دێت و دەورێکی لە ڕێزمانا هەیە بەگۆڕین و لابردنی هەر فۆنیمێکی یا بەلەتلەتکردنی، مانا و دەورە ئەسڵییەکەی تیا ئەچێ. واتا مۆرفیم چوار ڕووی هەیە:

١- قالبێکی فیزیاویی هەیە - کە فۆنیمەکانیەتی.

٢- مانایێکی هەیە.

٣- دەورێکی لە ڕێزمانا هەیە.

٤- بەلەتلەتکردن و جیاکردنەوەی فۆنیمەکانی لە یێک مانا و دەورە بنجییەکەی نامێنێ.

بۆ نموونە (پیاو) مۆرفیمێکە چونکە.

١- قالبێکی فیزیاویی هەیە (پ - ی - ا - و) ئەوەیە کە ئەبیسترێ وەک دەنگ لە قسەکردنا.

٢- مانایێکی هەیە (ئادەمیزادێکی نێرینەی بەتەمەن ١٨ ساڵ و بەرەو ژوور... هتد).

٣- دەور ئەگێڕێ لە ڕێزمانا بۆ نموونە ئەشێ دەوری بکەر ببینێ لە ڕستەدا وەک لە (پیاو هات).

٤- بەلەتلەتکردن و جیاکردنەوەی فۆنیمەکانی دەور و مانا بنجییەکەی نامینێ (پ - یاو) (پیا - و)... هتد هیچ مانا و دەوریان لە زمانی کوردیدا نییە.

لەوانەیە هەندێ لەتەکانی یا هەندێ لە لەتەکانی مۆرفیم مانایان بۆ پەیا بێ ئەم مانایانە هیچ پەیوەندییەکیان بەمانا ئەسڵییەکەوە نابێ و مەسەلە ڕێکەوتنە. وەک مۆرفیمی (بازوو) بەلەتلەتکردنی بەم جۆرانە (با - زوو)، (باز - وو)... هتد (با، زوو، باز) مانایان بۆ پەیا بوو بەڵام هیچ پەیوەندییان بەمانا ئەسڵییەکەوە نییە بەم جۆرە (بازوو) یەک دانەی ساغە و یەک مۆرفیمە.

وشەی (کوڕەکەتان) کە بریتییە لە سێ مۆرفیمی (کوڕ-ەکە-تان) هەریەکە لەمانە قالبێکی فیزیاویی هەیە واتا هەر یەکە لە ڕیزە فۆنیمێک پێک دێت. لە زمانی کوردیدا هەریەکە مانا و دەورێکیان پێ ئەسپێررێ. بەجیاکردنەوە و قرتاندنی هەر فۆنیمێکیان مانا و دەورە بنجییەکەی تیا ئەچێ.

مۆرفیم لە چەن ڕوویێکەوە دابەش ئەکرێت:

١- مۆرفیم (سەربەست)ە یا (بەند)ە.

مۆرفیمی سەربەست ئەوەیە کە بەتەنیا وەک وشەیێکی سەربەخۆ دەرئەکەوێ، وەک (کوڕ - خانوو - چیا...) مۆرفیمی بەند ئەوەیە کە هەرگیز وەک دانەیێکی سەربەخۆ دەرناکەوێ و ئەبێ لەگەڵ مۆرفیمێکی تر دەرکەوێ وەک (ەکە، -ان، هەڵ-، نە... هتد).

٢- مۆرفیم (ڕەگ)ە یا (ئەفیکس)ە ڕەگ ئەو بەشەی وشەیە کە ئەمینێتەوە دوای لابردنی هەموو ئەفیکسەکان.

جیاکردنەوەی ئەم دوو جۆرە مۆرفیمە لەبێک کارێکی زەحمەت و ئاڵۆزە بەشێوەیێکی گشتی ئەشێ بوترێ کە ڕەگ (ناووکی) وشە پێک ئەهێنێ (ئەفیکس)یش ئەکەوێتە ڕیزی دووەمەوە و سەر بەڕەگن. ڕەگ لە ئەفیکس درێژترە و بەژمارە زۆرترە لەهەر زمانێکا.

ژمارەی ئەفـێکس سنووردارە (داخراوە) واتا ڕێگا نادات بۆ هی تر بچـێـتـە ناریانەوە. گۆڕینی ژمارەیان بەندە بەگۆڕینی سیسـتـەمی (ڕێزمانی)ی زمانەکە بۆ نموونە ڕاناوەکانی هەیی لکاو لە زمانی کوردیدا (م - ت - ی - مان - تان - یان) ئەم شەشەیە و داخراوە ڕێگا نادەن بە هی تر بێتە ناریانەوە هەر ئەمانەن لای هەموو قسەکەرێکی ئەم (شێوەیە).
کەچی مۆرفیمی ڕەگ سنووری بۆ نییە و کراوەیە و ژمارەی هەمیشە لە گۆڕینایە بەنەمان و پەیابوونی هی تازە چ بەوەرگرتن چ بەداڕشتن.

ئەفێکس سێ جۆرە (پێشگر - ناوگر - پاشگر) پێشگر ئەو ئەفێکسەیە کە لە پێش ڕەگەوە دەرئەکەوێ وەک (هەڵ-، ڕا-، نە... هتد) لە (هەڵگرتن - ڕاگرتن)دا. ناوگر ئەو ئەفێکسەیە کە لەناو ڕەگدا دەرئەکەوێ لە زمانی کوردیدا ئەم جۆرە ئەفێکسە نییە بۆ نموونە لە زمانی عەرەبییا ڕەگی Ktb چەمکی نووسین ئەگەیەنێ. ناوگری i - â ئەیکا بە Kitâb (کتێب) و ناوگری i - â ئەیکا بە Kâtib - نووسەر).

پاشگریش ئەو ئەفێکسەیە کە لە دوای ڕەگدا دەرئەکەوێ وەک (ەوە، ان) لە (هاتنەوە و کوڕان)دا.

٣- مۆرفیم مۆرفۆلۆجی (اشتقاقی)یە یا (ڕێزمانی).

مۆرفیمی مۆرفۆلۆجی ئەوەیە کە ئەچێتە سەر مۆرفیمی تر بۆ دروستکردنی وشەی تازەی خاوەن مانای تازە وەک (هەڵ - ڕا - دا - تێ... هتد) لە (هەڵگرتن، ڕاگرتن، داگرتن، و تێ گرتن)دا.

مۆرفـیـمی ڕێزمـانیش ئەوەیە کە ئەچێـتـە سەر وشە بۆ دەربڕینی پەیوەندیی نێوان ئەم وشـەیە و وشـەکانی تر لەناو چوارچێوەی ڕسـتـەدا. ڕاناوە لکاوەکانی لەگەڵ فـەرمـانا دەرئەکەون لە زمانی کوردیدا هەموو مۆرفـیـمی ڕێزمـانێن چونکە پەیوەندیی نێوان بکەر و فەرمان لە ڕستەدا دەرئەبڕن.

من نوست - م.

ئێمە نوست - ین.

لەم ڕستەیەدا.

کچە جوانە زیرەکەکە هات.

(ە)ی (کـچـە) و (جـوانە) مـۆرفـیـمـێکی ڕێزمـانیـیـە چونکە دەوری بەسـتنی (ناو) و (ئاوەڵناو)ی بەیەکەوە گێڕا لەناو چوارچێوەی ئەم ڕستەیەدا.

مۆرفیم و جۆرەکانی لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

ئەو تیرە خاڵ خاڵانە ئەوە ئەگەیەنێ کە زۆربەی ئەفێکسەکان لە جۆری مۆرفیمی (بەند)ن و ڕەگەکان لە جۆری مۆرفیمی (سەربەست)ن. مۆرفیمی ڕێزمانی هەموو ئەفێکسن.

بەم جۆرە لەم قۆناغەدا ئەتوانین بڵێین (وشە) ئەو دانە (ڕێزمانی)یەیە لە مۆرفیمێ یا لە چەند مۆرفیمێ پێک دێت. ئەم مۆرفیمانە بەشێکیان مۆرفۆلۆجین و بەشێکیان ڕێزمانین. مۆرفیمە (ڕێزمانی)یەکان سروشتی پەیوەندی نێوان وشەکان لەناو چوارچێوەی ڕستەدا دەرئەبڕن بۆیە وشە لە دەرەوەی ڕستە پێ ناناسرێت.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری نووسەری کورد - گۆڤاری یەکیەتی نووسەرانی کورد، ژمارە (٩) ساڵی ١٩٨٢، لاپەڕە ٨٣-٨٩ بڵاوکراوەتەوە.

# (یت)ی شێوێنەر

لە زمانی کوردیدا[١] دوو دەستە ڕاناوی لکاو هەن. ڕاناوەکان و ئەرکیان لەگەڵ کاری تێپەڕا لەم نەخشەیەدا ڕوون کراونەتەوە.[٢]

وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

(١)

(أ)

| | | بکەر | ڕابردوو | بەرکار |
|---|---|---|---|---|
| من تۆم ڕاگرت. | ڕا | م | گرت - | یت |
| تۆ منت ڕاگرت. | ڕا | ت | گرت - | م |
| ئەو ئێمەی ڕاگرت. | ڕا | ی | گرت - | ین |
| ئێمە ئەوانمان ڕاگرت. | ڕا | مان | گرت - | ن |
| ئێوە ئەوتان ڕاگرت. | ڕا | تان | گرت - | Ø[٣] |
| ئەوان ئێوەیان ڕاگرت. | ڕا | یان | گرت - | ن |

(ب)

(٢)

| | (ا) | (ب) | |
|---|---|---|---|
| | بەرکار | ڕابردوو | بکەر |
| من تۆ ڕادەگرم. | را ت | دەگر - | م |
| تۆ من ڕادەگریت. | را م | دەگر - | یت |
| ئەو ئێمە ڕادەگرێت. | را مان | دەگر - | ێت |
| ئێمە ئەو ڕادەگرین. | را ی | دەگر - | ین |
| ئێوە ئەوان ڕادەگرن. | را یان | دەگر - | ن |
| ئەوان ئێوە ڕادەگرن. | را تان | دەگر - | ن |

شیکردنەوە دەری دەخات کە ئەو کارانەی لە چاوگی (ویستن)ەوە[٤] وەردەگیرێن لەم یاسا گشتییە لادەدەن.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە و دەستنیشانکردنی یاساکانی ئەم لایەنە سەیری ئەم ڕستانە بکەن.

(٣)

| | (ا) | (ب) | |
|---|---|---|---|
| | بکەر | ڕابردوو | بەرکار |
| من تۆم دەویست. | دە م | ویست - | یت |
| تۆ منت دەویست. | دە ت | ویست - | م |
| ئەو ئێمەی دەویست. | دە ی | ویست - | ین |
| ئێمە ئەوانمان دەویست. | دە مان | ویست - | ن |
| ئێوە ئەوتان دەویست. | دە تان | ویست - | Ø |
| ئەوان ئێوەیان دەویست. | دە یان | ویست - | ن |

(٤)

| | (ا) | (ب) | |
|---|---|---|---|
| | بکەر | ڕابردوو | بەرکار |
| من تۆم دەوێ. | دە م | ەوێ - | یت |
| تۆ منت دەوێ. | دە ت | ەوێ - | م |

| ئەو ئێمەی دەوێ. | دە ی | ەوێ - | ین |
|---|---|---|---|
| ئێمە ئەوانمان دەوێ. | دە مان | ەوێ - | ن |
| ئێوە ئەوتان دەوێ. | دە تان | ەوێ - | ێت |
| ئەوان ئێوەیان دەوێ. | دە یان | ەوێ - | ن |

لەو ڕستانەی سەرەوەدا... (کار) لە چاوگی (ویستن)ەوە وەرگیراون. لە (أ)ەکانا بکەر و بەرکار بەڕاناوی جودا دەربڕاون. لە (ب)کانا بکەر و بەرکار کراون بەڕاناوی لکاو.

لە (١٣)دا کات ڕابردووە. بکەر و بەرکار بەڕاناوی جودا دەربڕاون. لە (٣ب) کراون بەلکاو. تیایانا کۆمەڵی (١) [م - ت - ی - مان - تان - یان] دەوری بکەری و کۆمەڵی (٢) [م - یت - ∅ - ین - ن - ن] دەوری بەرکاری دەبینن. ئەمە لەگەڵ یاسای گشتیی کارکردنی ڕاناوە لکاوەکان دەڕوا...[٥]

لە کۆمەڵی (٤)دا کاتی کارەکە کراوەتە داهاتوو، بەڵام دەوری ڕاناوەکان ئاڵوگۆڕ نەبوو.

بە بەراوردکردن و شیکردنەوەی ئەو ڕستانەی سەرەوە هەموو دەردەکەوێ کە:

١- گۆڕینی کاتی کارەکە لە ڕابردووەوە بۆ داهاتوو ئەرکی ڕاناوە لکاوەکانی ئاڵوگۆڕ نەکرد... ئەمە لادانە لە یاسا گشتییەکە.

٢- ئەرکی ڕاناوە لکاوەکان لەگەڵ کاری لە چاوگی (ویستن)ەوە وەرگیراو، بەم جۆرەیە کە لەم نەخشەیەدا ڕوون کراوەتەوە.

٣- لە ئەنجامی بەراوردکردنی مۆرفۆلۆجییەوە. Morphological Identification دەردەکەوێ کە ڕەگی داهاتووی کاری لە (ویستن)ەوە وەرگیرا و (ەوێ)یە نەک (ەو) و

ئەم (ێ)یە بەشێکە لە ڕەگەکە و نیشارەت نییە بۆ کەسی سێیەمی تاک...
بۆ ساغکردنەوەی ئەمە سەیری ئەم ڕستەیە بکە:

ئێمە ئەومان دەوێ.

(ئێمە) بکەرە، (ئەو) بەرکارە، (مان) ڕاناوی لکاوی بکەرییە سەر بەدەستەی یەکەمە. بۆ جێگیرکردنی ڕاناوی جودای بەرکاری (ئەو) بە لکاو ڕوو لە دەستە ڕاناوەکەی تر دەکەین... لەم دەستەیەدا ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک (ێت)ە.

ئەمە جێی (ئەو) دەگرێ بەپێی یاسای شوێن بەڕەگی کارەکەوە دەلکێ و (مان) دەچێتە سەر پێشگری (دە)وە. بەم جۆرە:

کە (ێت) دەچێتە سەر ڕەگی (ەوێ) دوو (ێ) دەکەونە پاڵ یەک... لەناو یەکتردا دەتوێنەوە Reduction و دەبن بەیەک.

لە ئەنجامی سەپاندنی یاسای بەئارەزووی Optional لابردنی (ت)ی ڕاناوی لکاو ڕستەکە دەبێتە.

دەرک نەکردنی ئەم پێوەندییە ڕێزمانییەی نێوان بنج و سیما Deep and surface structure لەم جۆرە ڕستانەدا وای کردووە هەندێ زمانەوان وای بۆ بچن کە (ێ)ی کاری لە چاووگی (ویستن)ەوە وەرگیراو لە هەموو حالەتێکا ئیشارەتە بۆ کەسی سێیەمی تاک و تەنانەت بەپێی قیاسێکی هەڵەوە هەندێ جار (ت)یشی پێوە دەلکێنن وەک لەم دوو ڕستەیەدا.(٦)

١- من ئەوانم دەوێت

٢- تۆ ئەوانت دەوێت

لە ئەنجامی شیکردنەوە و بەراوردکردنی ئەم دوو ڕستەیە و بەپێی پێوەندیی بنج و سیما دەردەکەوێ کە ئەم (ێت)ەی ئەم دوو ڕستەیە هیچ پێوەندییەکیان بەڕاناوی لکاوەوە نییە... (چ بکەری چ بەرکاری)... لەبەر ئەم هۆیانە.

أ- ئیشارەت نین بۆ بکەر یا بەرکار، چونکە لە هەردوو ڕستەکەدا ڕاناوی جودا و لکاوی بکەری ئامادەن و ب- بەرکار لە هەردوو ڕستەکەدا بەڕاناوی جودا (ئەوان) دەربڕاوە... بەپێی ئەم بۆچوون و ئەنجام و شیکردنەوەیە... لەم دوو ڕستەیەدا.

١- تۆ خۆشت دەوێت.

٢- تۆ ئەوت خۆش دەوێ.

(ێت)ی ڕستەی یەکەم ڕاناوی لکاوی بەرکارییە لە ڕاناوی جوداوەوە بەم جۆرە گوێزراوەتە لکاو...

(ێت)ی ڕستەی دووەم هیچ پێوەندییەکی بەڕاناوی لکاوەوە نییە... (ێ) یەکە بەشێکە لە ڕەگ و (ت) کە بەپێی قیاسێکی هەڵە خراوەتە سەری. بۆیە هەچ شیکردنەوەیەکی ڕێزمانی کوردی ئەمە بەڕاناو لە قەڵەم بدات، هیچ ئەنجامێ بەدەستەوە نادات.

پەراوێزەکان:

١- کرمانجیی خواروو

٢- بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی ئەرک و سروشتی کارکردنی ڕاناوە لکاوەکان.. سەیری سەرچاوە ژ (٢) بکە.

٣- [ø] نیشانەیە بۆ نەبوونی سیما... یا لابردنی دانەیەکی ڕێزمانی.

لە ڕابردوودا ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک لەگەڵ کاری تێنەپەڕدا لە دەوری بکەریدا هیچ سیمایەکی بۆ دەرناکەوێ [ئەو هات - ø].

لە داهاتوودا [ێت/ات] دەردەکەوێ و بەپێی ئەم یاسایە (ئەگەر ڕەگی کار بە(ە) یا (ۆ) کۆتایی هاتبێ ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک قالبی (ات) دەگرێتەخۆ (ئەو دەڕوات - ئەو دەکات.. تاد)، لە هەموو حاڵەتێکی تردا بە(ێت) خۆی دەردەخا.

٤- سەیری ل (٢٦)ی سەرچاوە ژ (٢) بکە.

٥- سەرچاوە ژ (١) ل (٦٣).

٦- سەرچاوە ژ (١) ل (٦٢ و ٦٣).

سەرچاوەکان:

١- مەسعوود محەممەد (١٩٧٦) چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی - بەغداد.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو - بەغدا.

3- Chomsky, N. (1965) Asppects of Theory of syntax - Cambridge, Mass. MIT Press.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕامان- دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی گوڵان، ژمارە (٣٩) ساڵی ١٩٩٩، لاپەڕە ٢٢٤-٢٣٥ بڵاوکراوەتەوە.

# ئینسایکلۆپیدیای کوردستان... ئاواتێکە

تا ئێستا چەن کارێ بەناوی ئینسایکلۆپیدیایەوە کەوتوونەتە کتێبخانەی کوردییەوە[1]... ئەمانە هیچ کامێکیان بەر چەمکی ئینسایکلۆپیدیا ناکەون و هیچ لە ئامانجەکانی جێبەجێ ناکەن... هەموو ئەرکی دڵسۆزیی تاکە کەسێ و هەوڵی سەرەتایی سادەن.

ئەگەر جاران تاکە کەسێ بۆی هەبوو خۆی لە دانانی ئینسایکلۆپیدیای گشتی بدات... ئێستا کە سەردەمی تەقینەوە و لافاوی زانیارییە... تاکە کەسێ هەرچەن بلیمەت و شارەزا و بەتوانین بێ، هەرچەن کات و وزەی بۆ تەرخان بکات هەرگیز دەرەقەتی نایێ.

ئینسایکلۆپیدیای گشتی پرۆژەیەکی یەکجار فراوان و گەورە و مەزنە... بۆ وەدیهێنانی دەبێ دامودەزگای تایبەتیی بۆ تەرخان بکرێ... تێیدا بەسەدان شارەزا و پسپۆڕ بەپێی پلان و نەخشەیەکی ستراتیجیی دوورخایەن و ڕوون و دیار و ئامانجدار کار بکەن.

ئەم باسە هەوڵدانێکە بۆ پێناسێن و خستنەڕوویەکی خێرایی مێژووی ئینسایکلۆپیدیا و پێشنیارێکە بۆ سەرنج ڕاکێشانی کاربەدەستان بەڵکو بیر لە پرۆژەی دانانی (ئینسایکلۆپیدیای کوردستان) بکەنەوە. ئەمە لەم سەردەمەی ئێستاماندا پێویستییەکی نەتەوەیی یەکجار گرنگە و بەڵگە و نیشانەی قۆناغێکی پێشکەوتووی ڕۆشنبیرییە.

ئینسایکلۆپیدیا کتێبێکە یا زنجیرە کتێبێکە زانیاریی تێدا لە بارەی زانست و خەڵک و هونەر و ئەدەب و فەلسەفە و شوێن و... تاد تۆمار دەکرێ و بەپێڕەو و هونەرێکی تایبەتی ڕیز دەکرێن و پێشکەش دەکرێن.

زاراوەی ئینسایکلۆپیدیا لە نەژادا لەم دوو وشە گریکییەوە Enkyklios Paideia وەرگیراوە و داڕێژراوە، کە واتای (زانیاریی دەستاودەست) دەگەیەنن.

ئەوەی بیەوێ هەر زانیارییەکی لە بارەی هەر شتێ یا هەر بابەتێ دەستکەوێ... دەتوانێ پەنا بەرێتە بەر ئینسایکلۆپیدیا و ئەم ویستەی خۆی زۆر بەئاسانی بێنێتە دی بۆیە ئینسایکلۆپیدیا گرنگیتییەکی یەکجار زۆری هەیە بۆ بواری ئەکادیمی و ڕۆشنبیریی گشتی. پێویستە هەر ڕۆشنبیر و زانستخوازێک لە بەکارهێنانی ڕابێ و مامۆستایانی زانکۆ سوود و گرنگیتیی لە قوتابییان بگەیەنن.

ئینسایکلۆپیدیا گەلێ جۆری هەیە... (جیهانی) (گشتی) (تایبەتی)... ئێستا

بەهەزارانی لێ و بەدەیان زمان لەژێر دەستدایە... هەر یەکە لەمانە ئاست و سوود و ئامانجی تایبەتیی خۆی هەیە و بۆ پلەیەکی تایبەتیی ڕۆشنبیری و ئەکادیمیی دەست دەدا.

هەیە بابەتەکانی زۆر بەقووڵی و فراوانییەوە پێشکەش دەکات... هەشە زۆر بەکورتی و سادەیی.

ئینسایکلۆپیدیای (جیهانی) بۆی هەیە باسی هەموو شتێکی ئەم سروشتە بکات. هی (گشتی) تەرخانە بۆ بوارێک وەک (زانست)، (ئۆقیانۆس و دەریاکان) (فڕۆکە)... تاد.

کەچی (تایبەتی)یەکە خۆی بەلقێکی بوارێکەوە دەبەستێتەوە... وەک (فیزیا) (فەلسەفەی یۆنانی) (جەنگی دووەمی جیهانی)... تاد.

ئینسایکلۆپیدیا چەند گشتی بێ... گشتیتری هەیە و چەن تایبەتی بێ تایبەتیتری هەیە.

چەن بەرەو گشتیتی بڕوا بابەتەکانی کورتتر و چڕتر دەبن و چەن بەرەو تایبەتیتی بڕوا فراوانتر دەبن.

مێژوونووسانی بیری مرۆڤایەتی، فەیلەسوفی گریکیی سەدەی چوارەمی پێش زایین ئەریستۆتل Aristotle (٣٨٤ - ٣٢٢پ. ز) بەباوک و دامەزرێنەری ئینسایکلۆپیدیا دادەنێن.

(ئەریستۆتل) یەکەم کەس بوو هەوڵی دا ئەو زانیاری و ڕاستییانەی لەو سەردەمەدا باو و پەرشوبڵاو بوون کۆیان بکاتەوە و بەزنجیرەیەک کتێب پێشکەشیان بکات و بیروڕا و بۆچوونی تایبەتیی خۆشی لە بارەیانەوە تۆمار کرد.

دوای (ئەریستۆتل) بەنزیکەی دووسەد ساڵ (مارکۆس تێرینیتەس ڤارۆ Marcus Terentius Varro (١١٦-٢٧ پ.ز) کە نووسەر و زانایەکی ڕۆمانی بوو کتێبێکی نۆ بەرگی لەسەر هونەر و زانست دانا بەناوی Disciplines (بوارەکان). هیچ دانەیەکی ئەمە و ئەوەکەی (ئەریستۆتل) نەماوە و هەر لە ڕێی نووسەرانی دوای خۆیانەوە بەم کارانە زانراوە.

پلینی ذی ئێلدەر Pliny the Elder (٢٣-٧٩ز) نووسەرێکی تری ڕۆمانی بوو کتێبێکی بەناوی (مێژووی سروشتییەوە Historia Naturalis دانا تێیدا بەهەزاران لەتە زانیاری و ڕاستی لە بارەی ئاژەڵ و ڕووەک و خەڵک و شتەوە تۆمار کرد.

ئەمە زۆرتر بایەخی بەو جۆرە بابەت و زانیارییانە دەدا کە بەکەڵک ئەوانە دەهات کە

دەیانویست بین بەفەرمانبەری میری.

ئایسیدۆر Isidor لە ساڵی (٦٢٣)دا ئینسایکلۆپیدیایەکی بیست بەرگی بەناوی ئەتیمۆلۆجیاوە Etymologiarum Libri XX ئامادە کرد. زانا و خوێندەوار و ڕۆشنبیرە ئەوروپاییەکان بۆ زیاتر لە هەزار ساڵ ئەمەیان وەک سەرچاوەیەکی ڕەسەن و سەرەکی بەکار دەهێنا.

(ابن قتيبة البغدادي) لە سەدەی نۆیەمی زایینیدا یەکەم ئینسایکلۆپیدیای بەزمانی عەرەبی بەناوی (كتاب عيون الاخبار)ەوە دانا.

لە دەوروبەری ساڵی (٩٩٠ز)دا بوو خوارزمی (مفاتيح العلوم)ی تەواو کرد. هەر لەو سەردەمەدا بوو چەن زانا و ڤوتابییەک لە بەسرە (رسائل إخوان الصفا)یان تەواو کرد.

بارتۆلۆمیو دی گلانڤیل Bartholomew de Glanville مامۆستای زانستی ئایین لە پاریس ئینسایکلۆپیدیایەکی بەزمانی لاتینی بەناوی De Proprietatibus rerum لە سەرەتای سەدەی سیانزدەهەمدا (لە بارەی شتەکانەوە) دانا... تێیدا زیاتر بایەخی بەبابەتی ئایینی و ڕەوشتی دەدا... زۆری بەسەردا نەچوو وەرگێردرایە سەر زۆربەی زمانە ئەوروپاییەکان و بۆ سەدان ساڵ وەک سەرچاوەیەکی گرنگ و سەرەکی لە زانکۆکانی ئەوروپا بەکار دەهێنرا.

لە ساڵی (١٢٤٤)دا (ئاوێنەی گەورەتر)ەکەی Speculum maius ڤینسینت بیاوڤایسی Vincent Beauvais دەرکەوت. لە ساڵی (١٢٧٣)دا (ما - توان - لین)ی چینی ئینسایکلۆپیدیایەکی (٣٨٤) بەرگیی بەناوی (لێکۆڵینەوەی گشتیی ڕۆشنبیری)یەوە دانا...

دوای ئەمانە... بەردەوام ئینسایکلۆپیدیای باشتر و ڕێکتر و تەواوتر و بەسوودتر لە دەرچووندا بوو... بەتایبەتی دوای داهاتنی چاپ و پەرەسەندنی هونەری بڵاوکردنەوە و گەشەسەندنی زانست و زۆربوونی زانیاری و ڕاستی لە بارەی سروشتەوە... گرنگیتی و پێویستی بەئینسایکلۆپیدیا زۆرتر دەبوو.

بۆ خۆ لادان لە درێژدادری و[٢] پێشکەشکردنی مەبەستەکانی ئەم باسە بەشێوەیەکی ڕوون و ڕاستەوخۆ... ڕووداوە هەرە گرنگەکانی مێژووی ئینسایکلۆپیدیا بەکورتی دەلیستێنین:

| ساڵ | ڕووداوی مێژووی ئینسایکلۆپیدیا |
| --- | --- |
| ١٥٠٦ | (رافاییل مافێ) لە (زانیاریی گشتی)دا بۆ یەکەم جار سەرگوزشتەی ناودارانی خستە ئینسایکلۆپیدیاوە. |
| ١٥٤١ | (رینگلبێرگی باسیلی) زاراوەی ئینسایکلۆپیدیای دارشت وەک ناوێ بۆ ئەوەی بە(کتێبی سەرچاوە) ناو دەبرا. |
| ١٧٠٤ | (جۆن هەریس) لە (فەرهەنگی هونەری)دا... یەکەم ئینسایکلۆپیدیای (کۆکەسی)[٣]ی دانا، تێیدا بۆ یەکەم جار بابەتەکانی لەسەر پێڕەوی ئەلفوبێ ڕیز کرد. |
| ١٧٣٢ | (جۆهان زێدلەر) لە (فەرهەنگی جیهانی)دا... سەرگوزشتەی ناودارانی زیندووی خستە ئینسایکلۆپیدیاوە. |
| ١٧٦٨ | یەکەم بەشی ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی دەرکەوت. |
| ١٨٢٩ | یەکەم بەشی ئینسایکلۆپیدیای ئەمریکی دەرکەوت. |
| ١٨٦٥ | (پییێر لارووس) فەرهەنگی (لوگراندی لارووس)ی دەرکرد. |
| ١٩٠٨ | ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیی منداڵان دەرکەوت. |
| ١٩١٠ | ئینسایکلۆپیدیای ئەمریکی منداڵان دەرکەوت. |
| ١٩١٧ | ئینسایکلۆپیدیای کتێبی جیهانی دەرکەوت. |
| ١٩٤٨ | ئینسایکلۆپیدیای ئۆکسفۆردی بچووک دەرکەوت. |
| ١٩٨٠ | ئینسایکلۆپیدیای ئەکادیمی ئەمریکی دەرچوو. |

ئینسایکلۆپیدیای کوردستان... کۆکردنەوەی سامانی پەرشوبڵاوی نەتەوەیی و مێژووییمانە. دەورێکی هەرە گرنگ و باڵا لە پاراستنی کەلەپوور و مێژوو دەگێڕێ. گەشە بەزمان و ئاستی ڕۆشنبیریی کوردی دەدات و ناسنامەی کوردایەتیمان پتەوتر دەکات.

ئێستا بەسایەی ئەم بارودۆخە تازەیە و ئەم جموجۆڵە گەشە پیرۆزەی جیهانی زانست و ڕۆشنبیریی کوردی کە بۆ یەکەم جارە مێژوو بەخۆوەی دەبینێ و بەسایەی پێگەیشتنی هەزاران ڕۆشنبیر و شارەزا و پسپۆڕ و زانای لێهاتووی بڕوا پتەوی خوێن گەرم... لەگەڵ

پەرسەندنی کۆمپیوتەر و چاپەمەنیی پێشکەوتوو... بەسایەی ئەمانەوە هەموو ئەنجامدان بەئەم کارە مەزنە گەلێ لە جاران ئاسانتر و رێکتر و خێراتر و بەئەنجامترە.

بۆ وەدیهێنانی ئەم پرۆژەیە... دەبێ دامودەزگایەکی تایبەتیی سەربەخۆی بۆ تەرخان بکرێ. شارەزا و پسپۆران یاسا و پێڕەوی ناوەوەی بۆ دابنێن و بەرێوەی ببەن بەسوود وەرگرتن لەو ئەزموونە دوورودرێژە دەوڵەمەندە بەنرخەی مێژووی ئینسایکلۆپیدیای جیهانی و بەهاوکاری لەگەڵ زانکۆکان و کۆڕی زانیاری و یەکیەتی نووسەران و هەموو دامودەزگا رۆشنبیرییەکاندا، پلان و نەخشەیەکی روون و دووربین (ستراتیجی) و ئامانجداری بۆ دابنێن و بکەونەکار[٤].

زۆر بەکورتی وەک پێشنیارێکی سەرەتاییی سادە هەیکەلی گشتیی دەزگای ئینسایکلۆپیدیا و پلانی کارکردنی دەخەینە روو هیوادارین شارەزا و پسپۆران بکەونە موناقەشە و بەتێبینییەکانیان بەشداری بکەن لە تەواوکردن و پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکانی.

هەیکەلی گشتی دەزگای ئینسایکلۆپیدیاکە شتێکی لەم جۆرەی خوارەوە دەبێ:

**نەخشەی پەیڕەوی کارکردن...**

لیژنەیەکی ئامادەکردن دادەمەزرێنرێ... ئەم لیژنەیە سەرەتا بابەتە گشتییەکانی ئینسایکلۆپیدیاکە دەستنیشان دەکات... کە بەشێکی، ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە...

**بابەتە گشتییەکانی ئینسایکلۆپیدیای کوردستان.**

بۆ هەر بابەتێ لێپرسراوێکی شارەزای بابەتەکە دادەنرێ.. لێپرسراوەکان هەموو کۆڕی باڵای ئینسایکلۆپیدیاکە پێک دەهێنین...

**هەنگاوەکانی کارکردن بەم جۆرە دەبێ:**

١- لێپرسراوی هەر بابەتێک لیستەیەک بەناوی شارەزا و پسپۆڕانی بوارەکەی خۆی ئامادە دەکات.

٢- پێوەندییان لەگەڵدا دەکات و داوایان لێ دەکات هەریەکە لیستەیێ بەناوی بابەتەکان ئامادە بکات (بۆ نموونە ناوی چیاکانی کوردستان).

٣- لیستەکان دەکرێن بەیەک و وەک فەرهەنگ دەخرێنە کۆمپیوتەرەوە.

٤- ناوەکان بەسەر شارەزا و پسپۆڕاندا دابەش دەکرێن و داوایان لێ دەکرێ وتاری لەسەر هەر بابەتێ ئامادە بکەن و فیکرەیەکی گشتی لە بارەیەوە پێشکەش بکەن.

٥- دوو شارەزا وتارەکە هەڵدەسەنگێنن و بەپێی پێویست بژار و دەسکاری دەکرێ و پەسندی دەکەن.

٦- دوای بڕیاردان لەسەری لە ڕووی زمانەوە سەیری دەکرێ.

٧- حەواڵەی بەشی چاپ و کۆمپیوتەر دەکرێ بۆ ئەوەی جێی خۆی بگرێ و بپارێزرێ.

بۆ ئەنجامدانی کارەکان... دەیان جۆر نامە و خشتە و فۆرمی چاپکراو ئامادە دەکرێ.

پرۆژەی ئینسایکلۆپیدیای کوردستان.. ئەرکێکی نەتەوایەتی و زانستی و کۆمەڵایەتی و مێژوویییە... دەبێ هەر ڕۆشنبیرێکی کورد پشگیری بکات و بەشداری تێدا بکات.

ئەمە چەن تێبینییەکی خێرا و پێشنیارێک بوو لە بارەی ئاواتێکەوە... بەڵکو دێتەدی.

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

١- لەمانە:

ا- شێخ عەبدولقادر بەرزنجی (١٩٧١) فەرهەنگی زانیاریی یا ئینساکیلۆپیدیای کورد - چاپخانەی ڕاپەڕین سلێمانی.

ب- خوسرەو جاف (١٩٨٩) دائیرەتولمەعاریف چاپخانەی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان.

٢- بۆ زانیاریی زۆرتر لە بارەی مێژووی ئینسایکلۆپیدیاوە، سەیری بەرگی (E)ی ئینسایکلۆپیدیای (Britanica) لەژێر ناوی (Encychlopedia) بکە.

٣- (کۆکەسی)م بەرامبەر (تاکە کەسی) بەکارهێناوە.

٤- لە ل (٢١٨)ی بەرگی (E)ی ئینسایکلۆپیدیای (World book)ی ساڵی (١٩٨٢)دا... بەرنامە و هەنگاوەکانی دانانی ئینسایکلۆپیدیا زۆر بەوردی ڕوون کراوەتەوە.

٥- پرۆژەی دانانی ئینسایکلۆپیدیایەک بەکوردی - ئازاد عەبدولواحید ١٩٩٢ - بەدووبەش بڵاوکراوەتەوە.

٦- بدرخان السندي (١٩٨٣) القاموس الكردي الموحد حاجة قومية ملحة. گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە (٦٠).

*** ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕامان- دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی گوڵان، ژمارە (٤١) ساڵی ١٩٩٩، لاپەرە ٢٧-٢٩ بڵاوکراوەتەوە.**

# ڕەگی داهاتوو... بەیەک یاسا

* کـار لە زمـانی کـوردیدا[1] دوو ڕەگی هەیە (ڕابردوو) و (داهاتوو). هەمـوو کـاتە ڕێزمانییەکان بەم دوو ڕەگە دادەڕێژرێن[2].

* ڕەگەکان لە چاووگەوە وەردەگیرێن. بۆ وەرگرتنی ڕەگی ڕابردوو، یەک یاسای گشتیی بێ ناوێزە هەیە کە ئەمەیە:

(ن)ی چاووگ ← Ø = ڕەگی ڕابردوو

* بۆ وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو... چەند یاسایەکی جۆراوجۆر دەستنیشـان کـراون[3] و بەشێ لە ناوێزەکـان خـراونەتە ڕوو. ئەنجام ئەم پێنج یاسایە دەستنیشـان کـراون کـە لەم نەخشەیەدا ڕوون کراونەتەوە[4]

تپ = تێپەڕ　　　تن = تێنەپەڕ　　　Ø ← لادەبرێ

| جۆری چاوگ | | یاسا | نموونە | ڕەگی ڕابردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|---|---|---|
| ا | تێپەڕ | ا ← Ø | هێنان | هێنا | هێن |
| | تێنەپەڕ | ا ← ێ | سووتان | سووتا | سووتێ |
| ت | تێپەڕ | ت ← Ø | کەوتن | کەوت | کەو |
| | تێنەپەڕ | ا ← ێ | پاڵاوتن | پاڵاوت | پاڵێو |
| د | تێپەڕ | د ← Ø | چاندن | چاند | چێن |
| | تێنەپەڕ | ا ← ێ | مردن | مرد | مر |
| وو | تێپەڕ | | دروون | دروو | دروو |
| | تێنەپەڕ | وو ← Ø | چوون | چوو | چ |
| ی | تێپەڕ | ی ← Ø | ناسین | ناسی | ناس |
| | تێنەپەڕ | | وەرین | وەری | وەر |

ئەم (٣٢) چاوگە ناوێزەن[٥]... واتا هەر چاوگێک لەم لیستەیەدا نەبوو بەیاساکان ڕەگی داهاتووی وەردەگیرێ.

(بردن - بە)، (بەستن - بەست / بەس)، (بیستن - بیست / بیس)، (پشکووتن - پشکوێ)، (چێشتن - چێژ)، (خستن - خە)، (خواردن - خۆ)، (خواستن - خواز)، (دان - دە)، (دیتن - بین)، (ڕستن - ڕێس)، (ڕشتن - ڕێژ)، (ژیان - ژی/ ژیێ)، (سەندن - سێن / سەن)، (کردن - کە)، (ڕۆیشتن - ڕۆ)، (کرۆشتن - کرۆژ)، (کوشتن - کوژ)، (گواستن - گوێز / گواز)، (گوتن - ڵێ)، (گەستن - گەز)، (گەیشتن - گە)، (مان - مێن)، (ناشتن - نێژ)، (نان - نێ)، (نووستن - نوو)، (وتن - ڵێ)، (ویستن - موێ)، (هاتن - ێ)، (هاوێشتن - هاوێ / اوێ)، ([هەڵ]ســـــان - س / ست)، (هێشتن - هێڵ)

**لەم ناوێزانەدا:**

١- [بەستن - بەس/ بیستن - بیس / سەندن - سەن]یشیان هەیە وەک ڕەگی داهاتوو... کە بەر یاساکان دەکەون.

ب- [ڕستن - ڕشتن] شێوەی [ڕێستن - ڕێشتن]یشیان هەیە... کە بەیاساکان ڕەگی داهاتوویان وەردەگیرێ.

ج- [چێشتن - کرۆشتن - کوشتن - گواستن - گەستن - ناشتن] هەموو ئەمانەش بەیاساکان ڕەگی داهاتوویان وەردەگیرێ [کە لابردنی (ت) و بوونی (ا ← ێ)یە]. ئەوەندەیە دوای سەپاندنی یاساکە دوا فۆنیمی ڕەگی داهاتوو کە (بێ ژێ)ن (Voicless) سیمای ژێداری (Voiced)یان لێ دەنیشێ[٦].

د- [ژیان] ڕەگە داهاتووەکەی لە نژادا (ژێ)یە، کە بەر یاساکە دەکەوێ. لەبەر قورسی و لە ئەنجامی سەپاندنی یاسای فۆنۆلۆجیی (assimilation) (ێ) کە سواوە و تواوەتەوە. (دەژێیم) بۆتە (دەژیم)... تاد.

هـ- [هاتن] بەپێی یاساکە دەبێ (هێ) ڕەگە داهاتووەکەی بێ. (هـ) کە سواوە و تواوەتەوە... (دەهێیم) بۆتە (دێم)...

* ئەگەر ئەم تێبینییانەی سەرەوە ڕەچاو بکرێن و ئەم لایەنانە بەیاسای فۆنۆلۆجییەکان چارسەر بکرێن، ژمارەی ناڕێزەکان لە (٣٢)ەوە دادەبەزێتە (١٩).

***

بەشیکردنەوە و تاوتوێ کردن و بەراوردکردنی ئەم پێنج یاسایە لەگەڵ یەک... دەردەکەوێ کە:

١- لە هەموویاندا دوا فۆنیمی ڕەگی ڕابردوو [د.ف.ر][٧] لادەبرێ [(وو)ی تێپەڕ و (ا)ی [تێنەپەڕ نەبێ].

٢- (ا) دەبێتە (ێ) لە چاوگە یائییەکانا نەبێ.

ئەم پێنج یاسایە... دەشێ بەپێی پێڕەوی (Collapssing)ی چۆمسکی لێک بدرێن و تێک بشکێنرێن و بکرێن بەیەک یاسای گشتی. بەم جۆرە:

١- [د.ف.ر] ← Ø نەبێ [(وو)ی تێپ / (ا)ی تن]

٢- ا ← ێ لە چاوگە (یائی) یەکان نەبێ

* هەر چاوگێ بەدەستەوە بگیرێت... ئەگەر لە لیستەی ناڕێزەکاندا نەبوو... بەم یاسایە ڕەگی داهاتووی کارەکەی لێ وەردەگیرێ.

# نموونە و ڕاهێنان

| چاووگ | ڕەگی ڕابردوو | هەنگاوی یەکەم | هەنگاوی دووەم | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|---|---|
| سپاردن | سپارد | د → Ø | ا → ێ | سپێر |
| خوێندن | خوێند | ا → Ø | (ا) نییە | خوێن |
| تۆران | تۆرا | (ا) لاناپرێ | ا → ێ | تۆرێ |
| گروون | گروو | (وو) لاناپرێ | (ا) نییە | گروو |
| کێلان | کێلا | ا → Ø | – | کێل |
| تاشین | تاشی | ی → Ø | (ا) ناگۆڕێ | تاش |
| بوون | بوو | وو → Ø | (ا) نییە | ب |
| پرسین | پرسی | ی → Ø | (ا) نییە | پرس |
| سوون | سوو | (وو) لاناپرێ | (ا) نییە | سوو |
| گرتن | گرت | ت → Ø | (ا) نییە | گر |
| سرەوتن | سرەوت | ت → Ø | (ا) نییە | سرەو |

پەراوێزەکان:

١- کرمانجیی خواروو.

٢- بۆ کاتەکانی زمانی کوردی و یاساکانی داڕشتنیان سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:
وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) چەند یاسایەکی مۆرفۆلۆجیی داڕشتنی فەرمان. گ. ڕۆشنبیری نوێ ژ ١٠٩ ل (٢٥٨-٢٦٣).

٣- سەیری سەرچاوە - ژ (٢) و (٥) و (٦) بکە.

٤- سەیری سەرچاوە - ژ (٣) بکە.

٥- لەوانەیە هی تریش هەبن.

٦- بەپێی مەنتیقی (ئالۆز لە سادەترەوە پێک دێت) دەبێ ئەمە بەپێچەوانەوە و بەم جۆرە بێت: کە نیشانەی کاتی ڕابردوو (ت) دەچێتە سەر ڕەگی (چێژ - کوژ... تاد) دوا فۆنیمی ڕەگەکە سیمای ژێداریی Voiced خۆی دەدۆڕێنێ.

چێژ + ت ←—— چێشت

کوژ + ت ←—— کوشت

گەز + ت ←—— گەست... تاد

ئەم یاسایانەی لەم باسەدا و ئەوانی پێشتر خراونەتە روو بەزۆری یاسای ڕێزمانیی پێداگوگین.. Pedagogical کە پێوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی ڕابردوو و داهاتوو هەر لە (سیما)دا Surface دەخەنەڕوو. کە لە زۆر حاڵەتدا لەگەڵ سروشتی پێوەندیی نێوانیان لە (بنج)دا deep یەک ناگرنەوە... و... یاسا مۆرفۆنیمەکانیان دەستنیشان ناکەن..

جگە لە هەندێ تێبینی و وتاری لاوەلا... تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی وا پێشکەش نەکراوە ئەم پێوەندییە لە (بنج)دا بخاتەڕوو. بۆ ئەمە سەیری ئەم باسانە بکە:

١- محەمەد مەعروف فەتاح (١٩٨٩) کار پۆلێنکردن بەپێی ڕژنان. گ. رۆشنبیری نوێ ژ ١٢١.

٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٩٧) ڕەخنەی نارەختە. گ. رۆشنبیری نوێ ژ ١٤٠.

٧- (د) یەکەم پیتی وشەی (دوا)یە... (ف) یەکەم پیتی وشەی (فۆنیم)ە... (ڕ) یەکەم پیتی وشەی (ڕەگ)ە. هەموو پێکەوە دەبن بە(د. ف. ڕ). واتا دوا فۆنیمی ڕەگ.

ئەم پێڕەوە لە زاراوەسازیدا بە Acronomy ناودەبرێ بەهەزاران ناو و زاراوەی زانستیی وەک (لێزەر) و (میزەر) و (ڕادار) و (یونسێف)... تاد بەم پێڕەوە داڕێژراون.

سەرچاوەکان:

١- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاریی کورد - بەغداد.

٢- نوری عەلی ئەمین (١٩٦٠) ڕێزمانی کوردی - چاپخانەی کامەران - سلێمانی.

٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٢) کات و ڕەگی فەرمان. گ. ڕۆژی کوردستان - ژ ٦٥.

٤- وریا عومەر ئەمین (١٩٩٢) نیشانەکانی کات - گ. کاروان ژ ٩٢.

5- Mackenzie, D. N. (1961) Kurdish dialect Studies. V. I. London.

6- Waria Omar Amin (1979) Aspects of The Verbal construction in Kurdish. M. Phil Thesis Presented to The University of London.

* ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕامان- دەزگای ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندنی گوڵان، ژمارە (٤٩) ساڵی ٢٠٠٠، لاپەڕە ٢٢٣-٢٢٤ بڵاوکراوەتەوە.

# خصائص اللغة الكردية

السادة الحضور... ارحب بكم وأتمنى أن يروق لكم هذا اللقاء.

عنوان المحاضرة هو -خصائص اللغة الكردية- في البدء أود أن أوضح وبصورة عامة مفهوم الخصوصية في اللغة من وجهة نظر علم اللغة الحديث، بعدها أحاول أن اعرّف حضراتكم على بعض خصائص اللغة الكردية ونركز على واحدة منها.

نشر جومسكي عام ١٩٥٧ كتابه الموسوم Syntactic Structure بـ(٧٥) صفحة... وكان عمره آنذاك لايتجاوز الثامنة والعشرون. الكثير من الناشرون رفضوا في البداية نشر هذا الكتاب بحجة انه لشاب قليل الخبرة في مقتبل عمره الأكاديمي، قدراته العلمية متواضعة يحتاج إلى الكثير من العمل والمثابرة والمتابعة ليتسنى له ان ينشر كتاباً. وما ان نشر هذا الكتاب وأذا بجميع موازين علم اللغة تنقلب رأسا على عقب.

يعتبر صدور هذا الكتاب أهم حدث وأعظم خطوة ومنعطف في تأريخ علم اللغة قاطبة، حيث فجر ثورة كوبرنيكية قلب جميع الموازين وأسس مدرسة لغوية عارمة اكتسح جميع المدارس والنظريات اللغوية وفتح آفاقا جديدة رحبة أمام الدراسات اللغوية العامة. على إثرها قامت الغالبية العظمى من علماء اللغة وفي جميع أنحاء العالم بإعادة النظر في نهجهم وكتابة قواعد لغاتهم.

خلال الأربعة والنصف من العقود الماضية تطورت وتشعبت هذه المدرسة بسرعة فائقة. ساهم في تطويرها جومسكي نفسه والمئات من علماء اللغة الفطاحل في جميع أنحاء العالم. تفرعت وتشعبت وتكاملت ونمت في ظلها العشرات من المدارس اللغوية الأخرى لتفسيرها.

من أهم مبادئ هذه المدرسة هي نظرتها الشمولية الى اللغة كسمة وظاهرة إنسانية عامة. تؤكد بان جميع اللغات الأنسانية وبالرغم من انتمائها العرقي والجغرافي والتاريخي والحضاري متطورة ومعقدة بنفس الدرجة. ليست هناك ماتسمى باللغات البدائية. فالاختلافات الموجودة بين اللغات ماهي إلا ظاهرية، أما من حيث الأساس فان جميعها تعمل وفق نفس الأسس والمبادئ ومتطورة بنفس الدرجة.

هناك الكثير من الأدلة التي تؤكد وحدة اللغة الأنسانية Universals نذكر بعضها:

١- أي طفل يلد في أي مجتمع وبالرغم من انتمائه العرقي والحضاري والجغرافي والاقتصادي، يكتسب لغة المجتمع الذي ينمو ويترعرع فيه. أي ان هناك علاقة وثيقة بين تركيب وعمل اللغة والعملية العقلية للمخ. وان القدرة اللغوية فطرية واكتساب اللغة بيئية.

٢- للمتكلم بلغة الأم القدرة على فهم وصياغة مالانهاية له من الجمل والتعابير بلغته.

٣- لكل لغة عدد محدود من الوحدات الصوتية، منها وبقوانين متشابهة في جميع اللغات تتشكل النظام الفونولوجي (أي فونيماتها) وبقوانين متشابه ترتبط هذه الوحدات الصوتية لصياغة المقاطع Syllable والوحدات الدلالية والكلمات.

٤- العلاقة الهرمية الموجودة بين ابسط الوحدات اللغوية، وهي الأصوات المفردة التي تتولد عن طريق الجهاز الصوتي واعقد وحدة لغوية وهي الجملة متشابهة بل ومتطابقة في جميع لغات العالم.

٥- أثبتت وبرهنت هذه المدرسة بان جميع لغات العالم تحتوي على قوانين متشابهة من حيث الأساس لصياغة الكلمات والجمل.

جميع لغات العالم تحتوي على نفس العناصر (الاسم- الصفة- الفعل- الضمير- العدد- أسماء الإشارة-... الخ).

٧- توجد في جميع لغات العالم أدوات ووسائل للتعبير عن النفي والسؤال والتملك والأزمنة... الخ

الهدف الأسمى لهذه المدرسة هو تنظيم وصياغة ماتسميه بالقواعد الشمولية Universal Grammar على ضوئه يفسر الظواهر اللغوية لجميع اللغات الإنسانية.

يمكن أن نستدل مما سبق بان المبدأ الأساسي لهذه المدرسة هو إن جميع لغات العالم متطابقة من حيث الأساس أما الاختلافات الموجودة ماهي إلا ظاهرية، كالاختلافات الموجودة بين بني البشر فهم يختلفون شكلا إلا أن تركيبهم البايولوجي والفلسجي متطابقة.

يمكن توضيح هذه الفكرة ببعض الامثلة:

للجملة في جميع اللغات الإنسانية العناصر الثلاث (الفاعل S - المفعول O - الفعل V). هناك ستة احتمالات لترتيبها وكمايلي:

| فاعل - مفعول - فعل | SOV | الكردية |
|---|---|---|
| فاعل - فعل - مفعول | SVO | الإنكليزية |
| فعل - فاعل - مفعول | VSO | العربية |
| مفعول - فاعل - فعل | OSV | أپوورينة |
| مفعول - فعل - فاعل | OVS | هاليسكاريا |
| فعل - مفعول - فاعل | VOS | مالاگاسي |

فمثلا لو ترجمنا جملة (اشترى الطالب الكتاب) إلى جميع هذه اللغات وعبرنا عن كل وحدة علاقة دلالية برمز لالتقت جميعها في نفس النقطة وتكون النتيجة واحدة كما في:

٢ + ٣ + ٤
٣ + ٢ + ٤
٣ + ٤ + ٢
٢ + ٤ + ٣ = ٩ (او)
٤ + ٢ + ٣
٤ + ٣ + ٢

٢ × ٣ × ٤
٣ × ٢ × ٤
٣ × ٤ × ٢
٢ × ٤ × ٣ = ٢٤
٤ × ٢ × ٣
٤ × ٣ × ٢

مثال آخر. كلمة (الشجرة - في اللغة العربية) تقابلها (درهختهكه - في اللغة الكردية) و(The tree - في اللغة الإنكليزية).

ظهر أداة التعريف في اللغة العربية (ال) كسابقة وفي اللغة الكردية (دكه) كلاحقة وفي اللغة الإنكليزية The ككلمة مستقلة. لو رمزنا لمفهوم أداة التعريف A ولمفهوم الشجرة B وللعلاقة الدلالية بينهما C لالتقت جميعها في نفس النقطة وتطابقت في البنية العميقة Deep Stucture أي أن الاختلافات يعزى إلى البنية السطحية Sur-face Structure.

من الناحية العملية والتطبيقية تميز المدرسة التحويلية Transformational Gram-mar بين مستويين في اللغة.

١- البنية العميقة Deep Structure

٢- البنية السطحية Surface Structure

البنية العميقة لجميع اللغات متطابقة. أما الاختلافات الموجودة بين اللغات تكمن في البنية السطحية. في الحقيقة أي جانب من أي لغة تعتبر خصوصية خاصة بتلك اللغة لانه يظهر في أي لغة أخرى بشكل يختلف عما عليه في تلك اللغة.

في مجال مناهج البحث اللغوي المقارن توجد نوعان من الدراسات اللغوية المقارنة. حيث تختلف أهدافهما ووسائلهما.

أولاً: مقارنة اللغات المختلفة بهدف التوصل إلى إعادة بناء الأصل المشترك الذي تفرعت منه مجموعة معينة من اللغات لرسم شجرة العوائل اللغوية وتحديد هوية وموقع كل لغة ضمن هيكل العائلة اللغوية التي تنتمي اليها Historical Comparative Linguistics.

ثانياً: مقارنة اللغات بهدف الوصول إلى مواطن الشبه والاختلاف بين اللغات في صورها الحاضرة من غير أي إشارة إلى أصولها التاريخية من اجل صياغة نظرية عامة للتركيب اللغوي في البنية السطحية. يسمى هذا الفرع من علم اللغة بالتصنيف النمطي Typological Linguistics.

أحد أهم أهداف هذا النهج هو تصنيف اللغات إلى مجموعات تتشابه او تشترك في إحدى أو بعض خصائصها. أول تصنيف عام قام به اللغوي الألماني (1835-1762) Wilhelm Von Humboldt في بداية القرن التاسع عشر. حيث صنف لغات العالم إلى ثلاثة أنماط على أساس نظام تركيب الكلمات فيها. وهي اللاصقة Ag-glutinative والذائبة Fusional والعازله Isolating. تصنف اللغة الكردية ضمن النمط الأول.

في عام ١٩٦٣ قام غرينبيرك Greenberg بدراسة مقارنة نمطية لعدد كبير من لغات العالم توصل إلى بعض الحقائق والاستنتاجات المدهشة وتبين ان بعض الصفات تتواجد وتتلازم مع صفات أخرى. فمثلاً تبين بان اللغات التي تتشابه في قواعدها النحوية تتشابه أيضا في قواعدها الصرفية.

من خلال هذا النوع من الدراسات المقارنه اكتشفت خصائص الكثير من اللغات. هناك خصائص عامة تشترك فيها مجموعة كبيرة من اللغات وخصائص تشترك فيها

مجموعة قليلة من اللغات وهناك خصائص نادرة تشترك فيها عدد قليل جداً من اللغات وهناك خصائص فردية. فمثلاً الصوت (ظ - ض) خاصة باللغة العربية، لذا تسمى بلغة الضاد. في الحقيقة يمكن اعتبار كل حالة أو صفة لأي لغة سمة خاصة بتلك اللغة لأنها تتمثل وتظهر بشكل يختلف عما عليه في أي لغة أخرى.

نذكر بعض خصائص اللغة الكردية ثم نركز على إحدى الخصائص النادرة جدا والمدهشة. إن لم تكن اللغة الكردية هي الوحيدة التي تمتلك هذه الخصوصية.

بعض خصائص اللغة الكردية

**أولاً:** يتفق الفعل مع الفاعل في اللغة الكردية أي أن الفعل يأخذ ضميراً متصلا له نفس عدد وشخص الفاعل. كاللغة العربية كما في:

| | المتعدي | اللازم |
|---|---|---|
| أنا | درستُ | نمتُ |
| أنت | درست | نمت |
| هو | درس | نام |
| نحن | درسنا | نمنا |
| انتم | درستم | نمتم |
| هم | درسوا | ناموا |

نرى إن الضمائر المتصلة التي تظهر مع الفعل المتعدي واللازم هي نفسها. أما في اللغة الكردية فالضمائر التي تظهر مع الفعل المتعدي تختلف عن التي تظهر مع الفعل اللازم للزمن الماضي.

| | المتعدي | اللازم |
|---|---|---|
| من | خوێند - م | خەوت - م |
| تۆ | خوێند - ت | خەوت - یت |
| ئەو | خوێند - ی | خەوت - × |
| ئێمە | خوێند - مان | خەوت - ین |
| ئێوە | خوێند - تان | خەوت - ن |
| ئەوان | خوێند - یان | خەوت - ن |

ومن خصائص المجموعة التي تظهر مع الفعل المتعدي للزمن الماضي بان ليس لها مكانا ثابتا في الجملة فهي تتحرك وفق هذه القواعد:

| | المفعول المباشر | حرف جر | مفعول الغير مباشر | سابقه | جذر الفعل |
|---|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٣ | ٢ | ٤ | ٥ |
| ئێمە<br>نحن | تۆ - مان<br>انت | بۆ<br>الى | ئەو<br>هو | نە<br>لم | نارد<br>ارسل |
| ئێمە | - | بۆ | ئەو - مان | نە | نارد |
| ئێمە | - | بۆ - مان | - | نە | نارد |
| ئێمە | - | - | - | نە - مان | نارد |
| ئێمە | - | - | - | - | نارد - مان |

أي - يتصل الضمير المتصل بالمفعول المباشر أن وجد (١). بغياب المفعول المباشر يتصل بالمفعول الغير المباشر (٢). وبغياب المفعون الغير المباشر يتصل الضمير المتصل بحرف الجر (٣). وبغياب حرف الجر يتصل بالسابقة (٤) وبغياب السابقة يتصل بجذر الفعل (٥). (قاعدة رقم ١)

أما مع الزمن المضارع المتعدي واللازم فتظهر المجموعة (م - يت - ات/يت - ين -

ن - ن) وتتصل دائما بجذر الفعل. (قاعدة رقم ٢)

**ثانياً:** تغير موقع النبرة على الكلمات أو التعابير تتغير معنى الكلمة كما في:

هاْ - تن = جاؤا (إذا كانت النبرة على المقطع الأول من الكلمة).

ها - تْن = مجيء (إذا كانت النبرة على المقطع الثاني من الكلمة).

براْ - يەتی = انه أخوه

برا - يەتیْ = تآخي

نەيێی لێت دەدەم = إن لم تأتي سوف أضربك (أذا كانت النبرة على الجزء الأول).

= لا تأتي، وإلا ضربتك (إذا كانت النبرة على الجزء الأخير).

**ثالثاً:** أذا ظهرت صفة أو أكثر مع اسم معرف بأداة التعريف (ەكە) فان أداة التعريف تتحرك وتلتصق بآخر صفة.

| چیمەن - ەکە | چیمەنە جوان - ەکە | چیمەنە جوانە گەورە - ەکە... الخ |
|---|---|---|
| حديقة -أل | حديقة جميلة - أل | حديقة جميل كبير - أل |
| الحديقة | الحديقة الجميلة | الحديقة الجميلة الكبيرة |

**رابعاً:** من المألوف في اللغات إن لكل فعل أو مصدر صيغة أو كلمة مستقلة وخاصة به. إحدى خصائص اللغة الكردية هي أن عدد الافعال أو المصادر الأساسية قليلة. منها تشتق المئات بل الآلاف من مصادر الأفعال بإضافة السوابق واللواحق والأسماء والصفات... الخ إليها. فمثلا من الفعل او المصدر (دان - إعطاء) يشتق اكثر من مائة فعل ومصدر منها

دان: إعطاء

لێدان: ضرب

هەڵدان: مدح

گرێدان: عقد

لادان: انحراف

پەدان: هجوم، توبيخ

هەڵدانەوە: كشف

دادانەوە: تغطية

رێدان: موافقة، سماح

بادان: لف، دوران
دەردان: تفريغ (الماء)
لوولدان: برم
سەردان: زيارة
كليلدان: قفل
كۆڵدان: يأس
پاڵدانەوە: استلقاء
بەزگدان: الموت من الأسى
پفدان: نفخ
قسەدان: تعهد
دەنگدان: تصويت
دەنگدانەوە: صدى
ڕەنگدانەوە: انعكاس
ڕوودان: حدث
... الخ

بعض الأفعال أو المصادر غزيرة الإنتاج. مثلا يشتق من (كردن) و (بوون) فقط الآلاف.

**خامساً:** للغة الكردية خصوصية أو ظاهرة غريبة ونادرة جدا قد تكون اللغة الكردية هي الوحيدة التي تظهر فيها وهي (عند تغير زمن الفعل في بعض الحالات ينقلب الفاعل مفعولا والمفعول فاعلا). كما في:

دە - تا - نێر - ین.          (نرسلكم)

ده – تان – نارد – ین (کنتم ترسلوننا)

برسل

- انظر: في الجملة الأولى زمن الفعل مضارع (تان) مفعول و(ين) فاعل. بتغير زمن الفعل إلى الماضي تبادل الفاعل والمفعول دوريهما فانقلب الفاعل مفعولاً والمفعول فاعلاً.

نحاول ان نقدم لحضراتكم وبقدر مايسمع لنا الوقت في هذه المحاضرة تفسير هذه الظاهرة التي لم يتطرق أليها النحويون الكرد ولم يكن بمقدور النهج التقليدي من تفسيرها وتحديد قواعدها.

ذكرنا سابقا انه توجد في اللغة الكردية مجموعتان من الضمائر المتصلة التي تظهر مع الفعل وتعبر عن التوافق مع الفاعل Concord. نرمز لهما بـ(A) و (B).

| B | A |
|---|---|
| م | م |
| يت | ت |
| × – ات/يت | ى |
| ين | مان |
| ن | تان |
| ن | يان |

ولكون موضوع محاضرتنا يخص الدور المفعولي لذا نهمل الجوانب الأخرى.

توجد في اللغة الكردية قاعدة يمكن بواسطتها إحلال الضمير المتصل محل الضمير المنفصل المفعولي.

مجموعة (A) التي تلعب الدور الفاعلي مع الماضي المتعدي تظهر كمفعول مع المضارع المتعدي.

مجموعة (B) التي تلعب الدور الفاعلي مع المضارع المتعدي تظهر كمفعول مع الماضي المتعدي.

| | فاعل | مفعول |
|---|---|---|
| ماضي | A | B |
| مضارع | B | A |

لتحويل الضمير المفعولي المنفصل إلى متصل للجملتين الآتيتين:

ئێمه ئێوه دەنێرین (نحن نرسلكم)

ئێوه ئێمەتان دەنارد (كنتم ترسلوننا)

١- زمن الفعل في الجملة الاولى مضارع. اذن الضمير الفاعلي هو من مجموعة B. وحسب القاعدة يؤخذ الضمير المفعولي من مجموعة A.

٢- المفعول (ئێوه - انتم) في الثاني الجمع. يكون الضمير المتصل المقابل في المجموعة A (تان).

٣- حسب القاعدة رقم ١ يتحرك الضمير المتصل (تان) ويلتصق بالسابقة (ده).

٤- بحذف الضمير المنفصل الفاعل.

الجملة الثانية

بتحويل الضمبر المفعولي المنفصل الى متصل في الجملة الثانية:

١- زمن الفعل في الجملة الثانية ماضي. أذن الضمير الفاعلي (تان) هو من مجموعة

A. وحسب القاعدة يؤخذ الضمير المفعولي المتصل من مجموعة B.

٢- المفعول (ئێمه - نحن) في الاول الجمع. يكون الضمير المتصل المقابل في المجموعة B (ين). يحل هذا محله.

٣- حسب القاعدة رقم ٢ يلتصق الضمير المتصل (ين) بجذر الفعل. وحسب القاعدة رقم ١ يتحرك الضمير الفاعلي (تان) ويلتصق بالسابقة (ده)

٤- يحذف الضمير المنفصل الفاعلي.

ده - تان - نارد - ين

بمقارنة هذه الجملة بالجملة الأولى نرى انهما يتطابقان من حيث الصياغة والتركيب ويختلفان في الترتيب الوظيفي لاجزائهما

بالطرق نفسها يمكن تفسير وتبيان سبب تبادل الفاعل والمفعول لدوريهما بتغير زمن الفعل من الماضي إلى المضارع وبالعكس في الأمثلة الآتية:

ئەو گوڵی بۆ تۆ دەهێنا ←—— گوڵی بۆ دەهێنا - یت (كان يجلب لك وردا)

تۆ گوڵ بۆ ئەو دەهێنیت ←—— گوڵی بۆ دەهێن - یت (أنت تجلب له وردا)

من خانووەکەی ئێوەم دەفرۆشت ←—— خانووەکەم دەفرۆشتن (بعت داركم)

ئێوە خانووەکەی من دەفرۆشن ←—— خانووەکەم دەفرۆشن ( تبيعون داري)

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

**محاضرة ألقيت في المجمع العلمي العراقي يوم الاثنين المصادف ٢٠٠٢/١٢/٩.**

## ناوەرۆک